دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی



# مێژووی
# حەسەنوەیهی و عەییاری

نووسینی
محەمەد جەمیل رۆژبەیانی

کۆماری عیراق

وەزارەتی رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

زنجیرە ژمارە (٣٠٥)

# مێژووی

# حەسەنوەیهی و عەییاری

نووسینی

محەمەد جەمیل رۆژبەیانی

## « پێشکەش »

ئەم ڕەنجە نیوە چڵە ، ئەم بەرهەمە کەم نمودە ،
پێشکەش بەئەو سـەر بەوڵات سـپاردووانە ،
کـە لـە رێی ڕزگاریی زێـدو نیشتمانەکەیانا،
ئەبـن بـە پێناوو ، بـۆ جاویدان هێشتنەوەی
مێژووی ڕزگـاریی، ئەبن بـە سووتەمەنـی،
بۆئەوانی دلێرو نەمر، پێشکەشە •

**ڕۆژبەیانی**

# سـوّزی دەروون

لە ســەرەتای مێژووە لـەتـەوەی کـورد بـۆ پاراسـتنی
ئازادیی‌خۆی‌و ســەربەست مانـەوەی وڵاتـەکەی بـە جۆرێکی
هەمیشـەیی لە خەباتو نەبەردا بووە ، کاتێ «ئورارتو»و «ماننا»و
«ماد» فەرمانڕەواو خـاوەن دەســەڵات بوون ، « ئاشـوری »و
« سکا »پەی دەریەی شەڕیان پێ فرۆشتوون و دژیان بوون ،
ئنجا هەخامەنشیانی دەسپەروەردەو هاوڕەگەزی خۆیان هێنپرانە
شۆرشیان دژیان بەرپا کردووەو بەسەریانـا زاڵ بوونو هەمـو
دروشمی ژیاری‌و ئاوەدانکاریی کوردیان کردووە بە هی خۆیان،
پاشان کورد گەرچی توانیویە وەکوخێڵ‌و عێل لە جیاکانا بوونی
خۆی بپارێزێ ، بەڵام لە سەردەمانی داگیرکەرانی «مەکدونی»و
«سلوکی»و لە چاغی دەسەڵاتداریی « پەرثی‌و ساسـانی »دا کە
هە ردوولایان بە بنەچە ئەگەڕانەوە سەر کورد یەکـەمیان لــە
نەهاوندەوە ڕاپەڕیبوو دووەمیـان لە خاکی پاکـی شوانکـارەی
شیرازەوە ، بەڵام پشتیان لە ڕەگەزەی خۆیان کردو بەرلەوەی
بتوانن گەلانی بێگانە بخەنە ژێر ڕکێف ، هەوڵی ئەوەیان دا کـە

کوردەکان زەبوونو ژێردەسە بکەن . هەروا کە سپای ئیسلامی ناشارەزای ولاتی چیای سەخت لە گەڵ دەولەتی فارسا کەوتنە شەڕەوە و زانییان کە کورد دژی ساسانیە بە ڕابەری و پێشەنگی ئەوان توانییان بە چیا سەختەکانا هەڵگژێنو بەسەر ئیمپراتوریەتی ساسانیدا زاڵ بین، هەر چەندە کورد لە«ئەهوازو»و « بەرازەروز »و « شارەزور »و « حەلەوان »و « کرماشان »و زۆر جێی ترا بە ئاشتی کوردستانیان دایە دەستەوە ، بەڵام ئیسلام بەناوی برایێتی ئاینییەوە لە دەسەڵات بێبەهرەو بەشیان کردنو بەرەبەرە زۆر هەرێمو ناوچەی خاکی خۆیان لەدەسدا ، کە ئەمڕۆکە نەناوو نەئاسەواری کوردیان پێوە نەماوە . بۆ وێنە لە مێژووا زۆر جار ناوی «جرجرایا» (گرگر)و «بطائح» بەرچاو دەکەوێ کە چلکاو خۆرانی بەناو مێژونووس ، بەبنکەی دزو جەردەو ڕێگر ناویان بردوون ، لەگەڵ ئەومشدا کە فەرمانڕەوایی « شاهینی » تیا دامەزراوە کەئەوپەڕی پشتیوانی لە خەلافەتیعەباسی کردووەو دژی « بوەیهیو سەلجوقیو تارو مغول » لە شەڕا بووە ، دیسانەوە بەر پەلارو توانجی ئەو مێژونووسانە ی کرێگرتە کەوتووە ، و ئەمڕۆ ناوی « گەرگەرو بەطائح» لەێوا نەماوە، تەنیا ناوی تیرەیێکی عەرەبی کۆنە کورد گەگەر ـ کە ولاتەکەی خۆی بەجێ هێشتووەو تێکەڵ بەعەرەب بووە؛ ـ ناوی ئەم ولاتەی پاراستووە ، هەروا لە سەرەتای ئیسلامەوە عێلو خێلە کوردەکان بە سەربەستی تاخواری «حلە» کۆچو ڕەویانکردووە ، تەنانەت لە سەردەمی خەلافەتی عباسیدا

جافانەکان (جاوان) وەکو پێشـەنگی پارێزگـاریی کوردسـتان شارانی « دەسکەرە ( دستکرد ) « شارەبان »و « نەهرەوان » تا « نەعمانیە »و « حەی »و « شیخسەعد »یان لەژێر دەسا بومو بەهاوکاریی « بنی مزید اسدی عرب » شـاری « حلـه » یان دوروست کردووە ، گەرچی ئەمڕۆکە ناوی گەڕەکی « اکراد »ی شاری حلەش پێجراوەتـەوە ، بـەلام دوکتور مصطفی جـواد ( رەحمەت لە گۆڕی ) بە سیارەی جـاوان کـە سـالی ١٩٥٦ نووسیو لە کۆڕی زانیاریدا بلاوی کردمووە بەلگەو گـەواهی زینلوی بۆ بەجێ هێشتین ، هەروا لـە سـەردەمی خـەلافەتی عباسیدا عێلو خێلی بەرزینی و شـازەنگانی بـە دامـەزراندنی فەرمانڕەوایی « عەیشانی »و « حەسەنوەیهی »و « عەییاری » توانییان ئەو پەڕی پشتیوانی لە خەلافەتی عباسی بکەنو دژی « بوەیهی »و « غـوزو » سەلجوقی» ڕاوەسـتنو بجەنگـنو ولاتەکەیان تووشی وێرانیو کوشتار بهێنن ...

لە شەصتو حەفتاکانی ئەم صەدەی بیستەمەدا کە لەدەرەوەی ولات بووم هەندێ وتارم بۆ کۆنگەرەی زانکۆیی دەربارەی شارە خاپوورەکانی کوردستان و دەسەلاتە لەناو چووەکان دەنووسی ، هەروا لەژێر سـەردێڕی « ولاتەکەت بناسە» شـدا بـۆ رادیو .. جا سیارەکانی کۆنگەرە کە بەفارسیو گەلالـە بوونو نەدەبـوو لەبیست لاپەڕە پتربن لەبەرئەوە باسەکـان کـورتو بڕگـەکان بچڕبچڕ ئەهاتنە کایەوە ، نەك تێرو تەسەل ..

هاوڕێی زاناو نووسەری هێژام «کاکە حەمەی ماموستا مەلا کەریمی بیارە» سیارەکانی دینەوەرو عەییاری بەناوانی «دینوررومشاهیرها»و «امارةبنیعیار» کردبوو بە عەرەبی‌و لە گۆڤاری کۆڕی زانیاریی دەستەی کورددا بە پەراوێزو ڕەخنەو ڕاستکردنەوەیە بڵاوی کردبوونەوە ، «دوکتور حسام‌الدین نقشبندی»ش هەندێ ڕەخنەی لێ گرتبوون ٠٠ کە لە دەرەوەی وڵات گەڕامەوە درێژەم بەو باسانەدا ، ئەوە بوو سیارەکانی بەندەنیجین(مەندەلی) و داقوق ـ کەماوای چاپیان نەبو وەك کتێب ـ بەعەرەبی لەگوڤاری کۆڕی زانیاریدا خرانە بەرچاوی خوێندەواران ٠٠حەلەوانە کەش بەکوردی لە گوڤاری کاروان دا بەهەزار هەڵەو ناتەواوی‌یەوە بڵاوبووەوە ، هەروا «خانەقین‌یش» هەر بەکوردی لە گوڤاری کۆڕی‌زانیاری‌و بەعەرەبی لەنەوروزدا بڵاو کرایەوە ، دووزنجیرەی تریش لەمێژوی کورد بەناوانی «دونبولی‌و شوانکارە» هەر بەکوردی لەگوڤاری کاروان‌و کۆڕا بڵاو کرانەوە ٠٠

دۆستی هێژام نووسەری خوشەویست « گەمال غەمبار » ( خوا غەمی نەداتێ ) حەلەوانەکەی وەرگێڕا بە عەربی ، بەلام بەهەزار هەڵەی چاپی‌یەوە ، کاك عبدالمجید عبدالحمید یش وتاری جاڤانەکەی وەرگیرا بە عەرەبی‌و لەهەمان گوڤارا بڵاوێ کردەوە ( هەردوو وتارەکە لەژمارەکانی ٤٦ ـ ٤٧ ـ ٥٤ دایە ) جا هەروەکو دیاردیم بۆکرد لەبەر ئەو ڕەخنەو ڕاستکردنەوەیانەی کەبرادەران نیشانیان دابوو بەباشم زانی کە

دینەوەرو فەرمانڕەوایی حەسەنوەیی بخەمە سەریـەك ، بەپێـی بەندیوارییان : هەروا « حەلەوان »و «فەرمانڕەوایی عەیاری»ش بەیەکا تێکەڵ بکەم و هەرزانیـاریـەکی تازەم لـە سـەرچـاوە مێژوییەکانا چنك کەوێ بیخەمە سەریانو بەپێی گونجان وەرامی ڕەخنەکانی برادەرەکانیش بدەمەوەو هەڵەکان ڕاست بکەمەوە و نامەی « خانەقین » یش ، بخەمـە پاڵیـان کـە دڕیـلکخۆستـان ومێژوخوازان سوود لەتێرو تەسەلی باسەکان وەربگرنو کوڕانی وڵات بە چێژو بەرامەی «مێـژوویی لایەنووسـراوی وڵاتـە کەیان » دەمێ شیرین بکەن .

جا ئەم بەرهەمە بەدیاریەکی یادگارانە ئەبەخشم بەکوڕانی ئازاو بەجەرگی نیشتمانی کە نووکی خامـەیان جێی لوولـەی شەستتیر بگرێتەوە ،جا هەروەك وتراوە : دیاریی شوانەوێڵە پیشۆکو هەڵەکۆکە ، تکام وایە چاو لەکەمو کووڕی نەپۆشن ، هەرکەس لەم بارەوە زانسـتو زانیاریـەکی لـە سـەرچاوەی باوەڕپیکراوەوە بە دەس هێنا با لەسەر لاپەرەکانی کۆڤـارەکان بڵاوی بکاتەوە کەبۆ چاپێکی تازە لە هەڵێکی ترا سوودی لێ وەربگیرێ – ئیتر کوشش لەئێمەو فەڕو بەرەکەت لە ئیزەدی مـەزن ...

بـــەغدا

م. جەمیل ڕۆژبەیانی

شیوی دینەوەرو ئەوتەپۆلکانەی کۆنە شارەکەی
لەژێرا شاراوەتەوە

## « پێشەکی :

دینەوەر یەکێ لەو شارانە ی کۆنی کورد بووە کە تەمەنی لە سێ هەزار ساڵ بە پێشەوە دەستی پێ کردووەو هەزارەها شەڕو شۆڕو خۆشیو ناخۆشیو بوومەلەرزەو شەڵی شەڕی ویران کاریی تیا ڕووی داوەو سپای ئەم دوژمنو ئەو دوژمن خاکەکەی پێ شێل کردووەو لە سەردەمی ئیسلامیشا ئاوەدانو قیبلەی خوێنەواران بووە ، صەدان زاناای وەکو « ابوحنیفەی دینەوەریو ابن‌قتیبەی دینەوەریو ابن گەچیدینەوەریو ... » تیا هەلکەوتووەو ناوەندی پەیدابوونو بڵاوبوونەوەی ڕچەی دەروێشیو صوفیێتی بووەو ناوبانگی « صوفیەی دینەوەر » مانەندی « مەمشاد » بە هەمو وڵاتی ئیسلاما ڕۆیشتووە، هەروا صەدەیان ساڵ پاتەختی فەرمانڕەوایانی کورد بووە ، کەمێژو ناوی جوامێریو دادگوستەری ئەوانی بەشانازییەوە تۆمار کردووە ، کەئەم سیارەیە سەراسەر بخوێنیەوە بۆت ڕوون ئەبێتەوە ئەم بەشەی خاکی کوردستان وەکو هەمو بەشەکانی تری چەندە زاناو ئازاو جوامێرو دلێرو مەردو نەبەردی هێناوەتە کایەوە ، بەڵێ ئەم سیارەیە گوێلێکە لە پیتوفەڕی مێژوی کورد ..

## ناوی دینەوەر لە چیەوە هاتووە ؟

هەندێ وایان داوەتە قەڵەم کەناوی « دینەوەر » لــــە « دینهــور »ی خــوای «سریــان »ی کــۆنــە بەرلــەوەی بیــن بەپەیڕەوی ئایینی مەسیحی بە صەدان سـاڵ ( دائـرة المعـارف اسلامی ٥/٢٧٣ ) • هــەندی ئــەڵێن : لــە ناوی دیونیزوس ـ ەوە هاتووە کە لای یونانیەکۆنەکان خوای

شەرابـو وکوڕی ژوپیتەر ، بووە ، واتا « باکــوشی » لاتینــیو « ئوزیروسی » میصری کــەبەهۆی داگیرکارانی مــەکدونی و سلوکی یەوە پەرستنی لە کوردستــانو ئێرانـا بووە بەیاســا • بەڵگــــەی ئەونووســەرانە ئــەوەیــە : کاتــی هــەڵکۆڵینــی دێرینەو کــەلاوەکانی شــاریدینــەوەر حــــەوضێکی بــەردین دۆزراوەتەوە کناری بەنیگارو پەیکەرەی « سلینوسات وساتیرات نەخشێنراوە ( ایران از آغاز

تا اسلام ٢٦٢ و ٢٧٤ ) کە سیلینوس گیان لەبەرێکی نیوبنیادەمو نیوە جانەوەری قەڵەوی تێکسمڕاوی ڕیش تۆپ بووە لە جەنگەڵو چیاکانا ژیاوە ، و ساتیریش گیان لەبەرێکی فێلاویو چینی ژمی خوایانی بەرهەمو پیتوفەڕبووە • هــەندێکیش لایــان وایــە کەناوەکــە لــە ســـەردەمی ســاسانیدا پــەیدابووەو لــەبنەڕەتا « دینەوەریان » بووە کەدەستەیێ بوون لە پەیڕەوانی « مانــی کوڕی فاتکی هەمەدانی » کــە لەبابــل گەورە بــووەو چاتریــن نیگارکێشو نەقاشو زانای حیکمەتو فەلسەفە بووەو کتێبــە

ئاینی‌یه‌کانی زه‌رده‌شت‌و موسـاو عیسای خوێندوته‌وه‌و لافی پێغه‌مبه‌رێتی لێداوه‌و به‌هرامی ساسانی سالّی ٢٧٧زا کوشتویه‌و پاش‌کوژرانی ئه‌و ، په‌یڕه‌وانی له نـاو خۆیانـا لێیـان بووه‌تـه دووبه‌ره‌کی ، له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئایا پێشه‌وای خۆیان هه‌رده‌بێ لـه « بابل » هه‌لّبژێرن یاخۆ له‌و جێیانه‌ی کـه پـه‌یڕه‌وی زۆرتـری تیایه ؟ چونکه ئه‌وان ئه‌یانویست « ئارشه‌گوش » دابنـرێ بـه پێشه‌وای گشـتی ( فهرست ابن ندیم ٥٩٤ و تاریخ ادبی ایران ٢٢٥/١ - ٢٤٥ )

من به‌دووری نازانم مه‌به‌ست له وشه‌ی دینـه‌وه‌ر خاوه‌ن دین بێت وه‌ك « به‌هرموه‌ر - به‌خته‌وه‌ر » که پاشکۆی « وه‌ر » هه‌بوون‌و خاوه‌نێتی ئه‌گه‌یێنێ ، چونکه جگه له‌وه‌ی وشه‌ی دین به واتای ئێستـه‌ی له‌ئاینی زه‌رده‌شتیشا به کـارهێنراوه ، دیـن ناوی فریشته‌یێکیش بووه که‌ئه‌رکی ڕۆژی بیست‌و چواره‌می لـه هه‌ر مانگێکا له‌سه‌ر شان‌بووه(فه‌رهه‌نگی محمد معین بـه پیتی د) فریشته‌ی قه‌لّه‌میش هه‌رناوی « دین » بووه ، با ئه‌وه‌شمان لـه بیرنـه‌چێ کاتی پـه‌یدابوونی « ئاشو زه‌رده‌شت » پـه‌رسـتـی « دیو » که‌بووه به « داو = داوود » و « شیدا » که‌بووه به « شیطان » له‌به‌شی زاگروسی کوردستانا کارێکی ئاسایی بووه ( دینی کونی‌کورد = دین‌الکرد القدیم ته‌رجه‌مه‌ی‌خوم ٣٢ ) .
کاکه حه‌مه‌نووسیویه نه‌مدیوه ، وادیاره ، گه‌لاوێژی سالآنـی ١-٢-٣ی نه‌دیوه ) .

### دینەوەر کوێ بووە ؟ وکەوتوتە کوێوە ؟ :

دینەوەر یەکێ بووە لەشارە بەناوبانگەکانی چیا ( الجبل )ی کوردستان سەربەئیقلیمی چوارەمی جوغرافیایی لەسەر هێڵی ٤٧ـ٣٢٦د ۰ خ و ٣٥ـ٣٤ پا ـ یا ئەوهێله کەڕاست لە نێوانی کرماشان ـ کەنگەوەر دایەو بیست فەرسەنك بەلای خواری هەمەدانەوەیە بەلای خۆرئاوایاو پانزە فەرسەنك لەژور کرماشانەوە بەلای باکووڕا ( نزهە القلوب ـ کاکە حمە نووسیبوی نەمدیوە ـ دائرة المعارف فارسی پێی‌د )

### دینەوەر چۆن بووەو چی بەسەرهاتووە ؟

دینەوەر شارێ بووە جوانکیلە ئەوەندەی دوسێ‌یەکی ( یاسێ‌یەکی ) شاری هەمەدان ، دارای بازارو باغو باغاتو زەوی‌و زار بووەو چەندین هەرێمی پڕ لە دێهستان بەرفەرمانی ئەوێ بوونو هاوینە هەوارێکی سازگارو ئاووهەوا خوش بووە ، لەکۆنا ناوەندی هەرێمی چیا ( الجبل ) بووە ، پاشان بووە بەبنکەی ، ئەو سەردارانەی کە لە سەردەمی شاهانو سەرەتای ئیسلام‌و خەلافەتەکانی ئەمەوی‌و عەبباسی‌دا بە والیتی نێراونە ئەوێ یا هەر خۆیان خەلکی ئەوێ بوون ، هەروا سەردەمێکی دوورو درێژیش پاتەختی فەرمانڕەوایی « عەیشانیەو حەسەنوەیهی ـ وعەییاری»بووەو لەسالی ( ٣٩٨ك = ١٠٠٧زادا ) بوومەلەرزەیێکی سەخت بەشی

زۆری شارەکەی بەخانوو دوکانو کۆشکو تەلارەوە ڕۆخاندووە بەجورێ کە ١٦ هەزارکەس بەمردویی لەژێر خاکا دەرهێنراونو ئەوەندەی تریش لەبن خۆلا ماونەوە ، هەروا لە دەورانی مغول۔ تاتار ۔ ئیلخانی‌دا ۔واتا هەر لەسەردەمی جەنگیزەوە تا سەردەمی تەیموری لەنگ بەرەوویرانی براوە •
( صورة الارض ابن حوقل ٣٥٩ ، مختصر البلدان ٦٣-١٠١ تقويم البلدان ٤١٤ الكامل ٢٠٨/٩ ، دائرة المعارف فارسی پیتی‌د ؛ دائرة المعارف اسلامی ۔ دینور ٣٧٤/٥ )

ژاك دومورگان کەبە هەرێمەکەدا گەڕاوە نووسیویە : وێرانەی کۆنە شارەکە کەوتۆتە نێوانی دوگوندی « زیباجو ۔ شێخ‌خان»ەوە ، سەرزەوی ئەم ناوە وەکوی هەمەدان ئاسۆیی هەلکەوتووەو جۆگەو جۆبارێکی زۆر بەناوەندی شارەکەدا ڕەوان بووە ، بەلام ئەمڕۆکە جگە لە هەندێ بەرزی‌ونزمی وخراپەو تەپولکە کەبۆگەواهی وبەلگەی جوانی‌ی شارەکەماونەوە هیچی تریت بەر چاوناکەوێ ، خەلکی دەوروبەری دینەوەر تەپولکەکان هەلئەدڕن سوالەت ، گۆزە کوت ، بەردەنووس‌و متو مورووی هەمە ڕەنكو پارچەی زێروزیوی تیائەدۆزنەوە کەمێژویان ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی هەخامەنشی ۔ عەرەب ۔ واتا لە ٥٠ سالٌ پێش زاینەوەتا ٩٠٠ پاش زاین ، لەبری ئەوشارە ئێستەگەورە دێێ هەیە بەناوی دینەوەر بۆتەناوەندی دیهستانێك بە هەمان ناو ، سنوری بەمجۆرەیە : لای خورئاواوە نێوانی

دەربەند لای خۆرهەڵاتـەوە کـەنگـەوەر ، لای باکـوورەوە ســونقور ، لای باشــووریشی سەهنــە = صــحنە کــەناوەندی ناوچەیێکی سەربەکرماشانە ، شیوی دینەوەر کەزموی‌وزاری هەرنمەکە ئاو ئەداتو لەچیای شریش‌خانو چیای دمەلاقانی = دەکانی یەوەدێتەخوارەوە ، پاش ئاودانی زەوی‌و زاری ئەوناوە دەڕژێتە شیوێکی قووڵو بەرەوخوار دەیێتەوە بەرەو ڕوبـاری «گاماساب = گامیشاو»و تێکەڵی ئەبێت بەم ناساندنەدا بۆمـان دەرئەکەوێ ئەوەی کە ( مسعودی لە التنبیە والاشـراف لاپەرە ٥٢دانووسیویە : سەرچاوەی زاب ئاوی دینەوەرە تێکەڵ بەئاوی دجلە ئەبێت » ئەومەهەڵەیە ئاوی گاماساب نـەتێکەڵ بـەزاب ئەبێتو نەبەئەلو ە ندی زەهابو نەبەسیروان ، بەڵکـو تێکـەڵ ئەبێت‌بە کارونو ئەڕژێتــە « شط العـرب »وە ( جـوغرافیـای غربی ایران ٢/٦٨ )

## دینەوەر لەکەیەوە هەیـە ؟

ئەم شارە وێرانەیە لـە دەورانی « مادو هـەخامـەنشی »دا هـەبووە بـەڵامزاك دومورگـان لای وایـە : لـە ســـەردەمی سلوکی‌یەکانی پـاش مـەکدونییـەکاندا دوروســتکـراوە ـ گیریشمەنیش وادیارە هـەرئەو باوەڕەی هـەیەو نووسیویـە : سەربازانی ئەسکەندەر دەشتی کرماشانیان وەکو دەشتی نـەسا ( نەیسا )ی زاینگەی « دیونوسـیوس »ی خـوای یونانـی ـهاوپایەی «باخوس»ی رومی ـ ئەماتەبەرچاو زۆر شوێنەوارو

حێزینەیان ماوەتەوە کەلە کەنگەوەر ودینەوەرا دەرکەوتووە ( جوغرافیای غربی ایران ٢/٦٨ وایران ازاغاز تا اسلام ٢٦٢ و٢٧٦ ) •

ابن حنیفەی دینەوەری نووسیویە : لەناو پاشایانی تیرەکان ( ملوك الطوائف )دا هیچ کەس نەگەیبوەتە هاوتەقای « اردوان پوراشە» لە دەسەلاتداری‌و کیشوەرزوری‌و ولاتفرەوانی‌دا ، ئەو : پادشای هەمو چیابوو ( ماهان - واتا دینەوەرو نەهاوەند - هەمەدان ، سیروان، میهرگان گوچك ومحەلەوانو زۆرولاتی تری ، کەلەژێر دەسەلاتی ئەوابوون ( الاخبار الطوال٤٤ ) • « مسعودی »ش هەر ئەم قسەیەی دووپات کردۆتەوە بەکەمێ‌زالیاریی زیاترەوە نووسیویە : بەشی زۆری پاشایانی تیرەکان سەر بە « اشکان » بوون ، کەئەوان پادشایانی هەرێمی‌چیاو دینەوەرو نەهاوەند وهەمەدانو ماسەبەذان وئاذەربایجانو •• )بوون ( مروج الذهب ١/١٩٨ - ٢٣٧ •• دینەوەر لەسەردەمی ساسانیدا ناوەندی بەشی خۆرئاوای ولاتی ئیران بووەو کرماشان سەربەئەوبووە • هەر لەم‌ناوەدا بووە کەسالی ٤٥٩ - ٤٨٤ • زاە شەڕ لەنێوان بەهرامی‌چوپین‌و بەهرامی کوڕی پەرویزدا قەوما ( ایران باستان ٤٦٢ ) •

« ابوحنیفەی دینەوەری » نووسیویە : هورمزی کوڕی ئەنەوشیروان هاوینان بڕرابواردن ئەچووە ماهان - دینەودر - نەهاوەندو هێزێکی پاسکاری لەگەل خۆی دەبرد ، کەلە پایتەخت ئەکەوتەڕێ جارچی بە ناو سپادا جاڕی ئەدا : هەرکە لەسەر ڕێ

زیان بەکشتو کالو فەلاکانبگەیێنێ قورسترین سزا ئەیینێ.
الاخبار الطوال ٨١–٨٣ ) ، بێ گومان ابوحنیفە ئەم هەوالەی
لەنووسراوی چلکاوخۆرو کاسەلێسەوە وەرگرتووە کەپیشەیان
ڕوپایی وکلکەلەقێ بووەبەدەوری دەربارا ، ویستوویانە ئەمیش
هەروەك باوکی نازناوی درۆکانەی دادگوستەری بدەنێ .

هەر لەدەورانی ساسانیدا پەیڕەوانی « مزدەك »ی کوڕی
بامداد ـ کەخەلکی فسای شوانکارە بوو لەکاتی گەنجیا کتێبی
« بوند »ی ئاشوزەردەشتی دەسکاری کردبوو ، بەهۆی خۆی
دابووە قەلەم ولافی پێغەمبەری لێدابوو بیروباوەری
هاوبەشەکیتی بەولاتا بلاوکردبوەوە وقوبادی ساسانی پادشای
ئیران پێی هەلخەلەتابوو ، بەلام موغانی زەردەشتی لە خۆیوشاە
قوباد ڕاپەڕیبوون ، قوباد هەلاتبوو ، نەوشیروانی کوڕی
کەهەر لەمندالیەوەڕقی لێیبوو چونکە دایکی پەیڕەویلێ
کردبو ، کوشتی ورچەکەی قەدەغە کردو پەیڕەوانی بلاوکردەوە
کە لەدینەوەرو دەوروبەریدا دەسەلاتێکی ئاینی زۆربە هێزیان
پیك هێنابوو ، « محمد کوڕی اسحاق » نووسیویە : ئەم کومەلە
مانەوە تا دەورانی بابەکی خوڕەمدین وبوون بەدووبەشەوە
« محمرە ولقطە » ئەمانە هەمو شتێکیان تێکەلاوبوو : کەیفو
بەزمو خواردن وخواردنەوە ، تەنها ڕقیانلەدزیودرۆزنی
وکوشتاربوو ، ئەمانە لەلایەن نەوشیروانەوە قەلاچوکرابوونو
پتر لە سەت هەزار کەسیان لێ کوژرابوو ، پاشان سەریان

هەڵدابووەوە .. ( فهرست ابن الندیم عربی ٤٠٥ وتەرجمەی فارسی ٦١٠ )

«ئەدوارد براون» ئەم هەواڵەی خوارەوەی لە زمانی «نظام الملك »ەوە نووسیوە : کاتێ مزدەك کوژرا ژنەکەی لەگەڵ دووکەس لەپەیڕەوانیان لە « تیسفون »ەوە هەڵات بەرەو«رەی»و لەوێ کەوتە چاومڕاو بۆ ڕچی ئاینی مێردەکەی و پەیڕەوێکی زۆری پەیداکرد ، وبەناوی خۆیەوە ناونرا « خورەمیە » .. پاشان کە لە سەردەمی « بابەك »دا سەریان هەڵدایەوە ناوەکە بووبە « خورەمدینان » ( تاریخ ادبی ایران ١/٤٦٦ )

ئەم باس‌و هەواڵانەی نووسرا بەسن بۆ گەواهی وشایەتی لەسەر دێرینەیی وکۆنیی شاری دینەوەر .

## دینەوەر لە مێژووی سەردەمی ئیسلامیدا

پاش ئەوەی کەسپای ئیسلام ساڵی ١٦ك=٦٣٧زا هەرێمی گولاڵە (جلولاء)ی داگیر کرد «هاشم کوڕی عتبە» سپایێکی سوارەی زۆری خستە تەك «جریر کوڕی عبدالله بجلی» کە لەنێوان سپای ئیسلام‌و سپای ئێراندا سپا بەز بکات‌و ببێ بە دیوارێکی سەختی پۆلایین وماوای هەڵمەتی دوژمن نەدات . هەروا « سعد کوری ابو وقاص » یش هەزار سواری بۆنارد بۆ داگیر کردنی « حەلەوان »، ئەو حەلە « میهران دادی کوڕی یەزد گورد » سەردار سپابوو ، یەزدگورد خۆی لە حەلەوانەوە

کشایەوە بۆ « نەشاور » ( فتوح الشام ۲ / ۱۳۰ ) ئـەم ناوی نەشاورە لەمێژووەکانی ترا نیە ، دوورنیە کە هەڵەبێتو مەبەستی « نەهاوند » بێت ، جا هاشـم هـەڵی کوتایـە « حەلـەوان »و « یزدگورد » کشایەوە بەرەو ئەصفەهانو جـەریر ( هەڵەیـە ، مەبەست هاشم . ) حەلەوانی بەئاشتی داگیرکرد ، بەومەرجـەی سەروماڵی خەڵك بپارێزرێ، کوشتار نەبێو تاڵانو اتفال ڕوونەدا ئنجا هاشم «جریرو» عزرە کوڕی قیـسی لەوێ بەجێهێشـتو خۆی شالاوی برد بۆ سەر دینەوەر، بەڵام بەشەڕ بۆی داگیر نەکرا ڕوی‌کردە « قرماسین = کرماشان »و بـەئاشـتیو ڕێك‌کـەوتن داگیری کرد ( فتوح البلدان ۲۹۵ ) .

سـالی ۱۹ك = ۷٤۰زا پـاش ئـەوەی یـەزدگـورد لـە حـەلـەوان بەهـەڵاتـن دەرچـو ، وڵاتـانـی فـارس لەگەڵ خەڵکـی شارانـی ( ڕەی ـ قومس ـ ئەصفـەهان ـ هـەمـەدان ـ ماهین ( واتا دینەوەر نەهاوەند ) نامەیان گۆڕی‌یەوەو خۆیان خستەژێرچەكو چوونە لای یەزدکورد ، ئەو « مەردان شـای برۆزلی » کردە سەرداریانو ئاڵای درەفشی کاویانی دایە دەستیان کەژمارەیان تێوانی ٦۰ـ۱۰۰ هەزار کەس بـوو ، هەواڵـی ئـەم سپاژۆرە گەیێنرا بە خەلیفەی دووەم « عومەر » دەخ ئەویش لەناو یارانی پەیغەمبەرا «نعمان کوڕی مقرن »ی بۆ فەرماندەیی سپایی هەڵبژارد کە لەخاکی ئێران دا بوو ، خـۆی لـە مەدینـەوە بەرێی خـست بۆکوفە کە لەوێوە سپاکەی بۆ تەیار بکرێت ، ... گەلالەی هەواڵ ئەم فەرماندە یە توانی بە هۆی هێزی کوفـەو

هێزی بەصرەوە کەلەژێر فەرمانی « ابوموسای اشعری » دابوو خۆی بگەیێنێتە هەرێمی چیاو پاش چەند ڕۆژ شەڕ ئەم هەرێمانە ( دینەوەر ـ ماه سەبەزان ـ مهرگان کوچك ) بەئاشتی‌و ڕێککەوتن خۆیان دایە دەستەوە ( مختصر البلدان ۹۳ـ۹٤ ) •

بەڵام ابن اثیر نووسیویە « ضەراری کوڕی خطاب » ڕوی کردۆتە هەرێمی سیروانو پاش شەڕێکی قورس وکوشتنی « ئاذین »ی فەرماندەی ئەوناوە ماه سەبەذانی داگیرکردووە ( الکامل ۲/٥۲٥ ) •

پاشان باج وپیتاکی دینەوەر کراوە بەمایەی ژیانی سەربازانی بەصرەو باج‌وپیتاکی نەهاوەندیش کراوە بەمایەی ژیانی سەربازانی کوفە ( الکامل ۳/۲۱٦ ) ئنجا لە سەردەمی « معاویە » دا جۆری ناوەکان گۆررا ، لەشەرەکانی نێوان سپای ئیسلام‌و سپای ئێراندا زۆر لەموسوڵمانان گوژران تەنانەت فەرماندەکان وەکو « نعمان کوڕی مقرن ، عمرو معدیکرب‌و هی تری •• ) ( مروج الذهب ۲/۲۱٥ )

سالی ٣٤ك ( ٦٥٤زا ) خەلیفەی سێیەم « عثمان دەخ ـ » « مالکی کوڕی یربوعی » دانا بە سەر داری ئەم هەرێمانە ( خانەقین ـ نەهاوەند ـ دینەوەر •• تاد ) ( طەبەری تەرجمەی بەلعەمی بۆفارسی ۱/۲۸ـ۲۹ ) ( کاکەحەمە بەپەراوێز ڕاستی کردۆتەوە : ( •• دانا بەسەرداری ماه ٦ـ۲۸ـ۲۹ ) وادیارە لەسەردەمی خەلافەتی « علی کوڕی ابوطالب » وسەڵطەنەتی معاویەدا لەبەر شەڕوشۆڕی نێوانیان تەنیا هێزی سپایی ئەوناوەی

بەڕێوە بردووە ، ناوی سەردارو ئەمیرەکان تۆمار نەکراوە ڕەنگە سەردارانی خێڵ وعێلە کوردەکان خۆیان ولاتیان بەڕێوەبردبێ .
بلاذری نووسیویە : لە سەردەمی معاویەدا کە مسولمانان زۆرتر لەکوفە کۆ ئەبوونەوە باجو پیتاکی هەرێمی دینەوەر کەبەشی خەلکی بەصرەبوو درا بە خەلکی کوفە ، بۆیە دینەوەر بە « ماه الکوفە » ناوبراو باجو پیتاکی نەهاوەند یش تەرخان کرا بۆ خەلکی بەصرەو ناوی نرا « ماه البصرە » .. تاد « علی پاشا صالح» کە بەرگی یەکەمی « تاریخی ادبی ادوارد براون »ی وەرگێڕاوە بەفارسی لە پەراوێزی ( ٣٢ )دا نووسیویە : زانای بەناوبانگی کامبریج دوکتور هایدی شاگردی ئابراهام وهیلاك گەییوەتە ئەوڕاستیيەی کەوشەی « ماه » کەنووساوە بەم ناوانەوە : ( ماه کوفە ، ماه بەصرە .. تاد ) هەر وشەی مادە .. کاکە حەمەی مەلاکەریمی مدرس لە سەری نووسیوە : من گەرچی لەگەڵ مێژو نووسیدا ئاشنانیم بەلام بەپێی هەندێ ناوا بۆم دەرئەکەوێ کەوشەی « ماه » ئەکات چیا ، ڕێی سەخت لەم ناوانەدا ( ماهدەشت ، ماهجان ، مالوان ماوران ، تاد .. ) وادیارە کاکەحەمە حەزئەکا لەهەمو مەنجەڵێکا ئەسکوێت ، ئەگەر ماه چیابوایە چۆن ئەنووسا بە دەشتەوە ؟؟
وشەی « ماه » لەماه کوفەو ماهبەصرە وماهزبیدەو ماهدینارو ماهسەبەزاندا دا ناشراوی « ماهانە = مانگانە »ن باجوپیتاکی ئەمجێگەیانە ئەدرا بەسەربازەکانی خەلقی ئەوناوەو بەمۆچەخۆرانی ئەوێ ، جگەلەوەش وشەی ( ماه ) وابزانم

بەتەنیا لەکوردیدا هەرگیز ناو نیەبۆ چیا دەبێ بە « زەرد »ەوە بنووسێت ، « ماهدەشت » لـە بنەڕەتا « ماهین دشـت »بووە واتـا دەشـتی ماینو چارەوا بـەخیوکـردن « ماهجان »یش واتامانگ ، « ماوران »یش بەقسەیخود حەیدەرییەکان ، ئەوان ئەمناوەیان هێناوە چونکە باپیرە هەرەگەورەیان لـە « ما وراء النهر »ەوە هاتووەو سووك بۆتەوە ) .

ئەو حەلەی کە ئەم شارانـە کران بەماهانـە ، دەسکـەوتی هەرێمی دینەوەر لەباجو پیتاكو سەرانە ئەگەیشتە پێنجملیونو حەوت صەت هەزار درهـەم ( ٥،٧٠٠،٠٠٠ ) . ( بلدان ابـن واضح یعقوبی ٣٥ لەبنەڕەتە فارسییەکەدا بـە هەڵـە نووسرابو الاخبار الطوال ) .

سالی ٥٠ك = ٦٧٠زا ، یەزیدی کوڕی معاویە فەرمانی دا بە عبیداللە کوڕی زیاد کابرایێکی کثیر ناو بکات بەسـەداری « ماهسەبەزان » میهرگانکوچك ، حەلەوان ، وماهیـن ( واتـا دینەوەرو نەهاوەند ) ولەهەرێمی چیادا دەرەبـەگێتی بدرێتێ ، کوثیر چوو لەوێ کوشكو تەلاری خۆی دورستکـرد ، ئـەم کثیرە کوڕی « شیهابی کوڕی حصینی ذوالغصە »بوو ، یەکێكبو لەوانەی کەسەربەبنەماڵەی خەلیفەی سێیەم عوثمان ( خ.خ )بوو قسەی ناشرینی ناشایەستەی بـە « علی کـوری ابـو طالب » خەلیفەیچوارەم ، وپیاوانی دەورو بەری ئیمامحوسین ئەوت ، وخەڵکی لە دۆستیو خۆشویستی ئەوان ئەڕەوانەوە ؟؟ ( فتوح

البلدان ٣٠١ ) ساڵی ٦٦ك = ٦٨٥ز‌ا کە مختارثقفی دژی عبدالملك کوڕی‌مروان اموی ڕاپەڕی ، بەیاریدەو دەستەکی ئێرانی‌یەکانەوە، توانی هەمو عیراق‌و جزیرە داگیربکات : ئەوجەلە موچەخۆرانی خۆیی بۆ سەرداریتی ولاتانی ژێر دەست‌نارد ، بۆوێنە « عبدالله کوڕی حارث »ی بۆ مالکی ئەشتەری نارد بۆسەرداریی ماهین - دینەوەر ونەهاوەند « یزید کوڕی معاویەی بجلی »شی نارد بۆ سەرداریتی قوم‌و ئەصفەهان‌و دەوروبەری ڕەی هەروا « ابن مالکی بکراوی » شی نارد بۆ سەرداریی حەلەوان‌و ماهسەبەزان ( الاخبار الطوال عربی ٢٩٢ وتەرجمەی فارسی ٣١٤ ) ، بەڵام وەك لە هەواڵی ئایەندە دەرئەکەوێ عبداللە نەیتوانیوە دەس‌بگرێ بەسەر ماهین‌دا ؛ ئەوەتا بەلاذوری نووسیویە : « مالکی‌اشتر » « هانی کوڕی ابوحیەی کوڕی‌علقمە »ی نارد بۆ حەلەوان بە هەزار سوارەوە بۆپاراستنی ڕێ بەڵام لەوێ تووشیان بوو بەتووشی کوردەکانی دینەوەرەوە کە خەریکی خەرابکاری‌و ڕێ‌گری بوون ، جادای بەسەریاناو کوشتاریکی زۆری لێکردن ( انساب الاشراف بلاذری ٥/٤٥ ) ( لەپەراویزی بنەڕەتە فارسی‌یەکەدا نووسیووم: زۆر سەیرە کەفەرماندەیی بە هەزارسوارەوە بچێت بۆسەر هەرێمێ بۆسەرکوت کردنی خەلکەکەی وبنووسرێ خەریکی خرابکاری‌و ریگری‌بوون ونەنووسرێ لەبەرهەستی نەتەوەیی‌و لەتاوی ستەم ڕاپەریبوون .. کاکەحەمەی مەلاکەریم لێرەدا دەماری مسولمانەتی جولابوو نووسیبوی : خاوەن وتار لە

پەراوێزەکەیا زۆرتوند ڕۆییوە لەو حەلەدا هەستی نەتەوەیی وڕامیاری نەبوو !! دەی باقسەکەی کاکەحەمە راستبێ ، ئەی‌چۆن خۆی‌و هاوبیرانی « ابوزری غفاری » پان‌ئەکرد بە خاوەن بیری هاوبەشەکی ؟ .

بێ گومان خەلکی دینەوەر لەو سەردەمەدا هێشتا تەواوەتی سەریان بۆفەرمانی ئەمەوی دانەنواندبوو فەرماندەو سەردارەکانیان لەوناوەدا بێ‌دەسەلات وبێ هێزبوون‌و ئەوانەی دژی ئەمەوی بوون‌و ڕاپەڕیبوون زۆر لەوان بە هێزتربوون ، موختاری ثقفی نامەێکی بۆ « عبید الله کوڕی حوڕی جعفی » نارد کەلەو حەلانەدا خەریکی تالآن‌و بڕۆبوو ، لەهەرێمی چیادا ، بەم‌جۆرە : تۆ لەسەر کوژرانی حسین هاتویەڕقاو تۆلەی خوێنی ئەو هانی داوی ، ئێمەش هەروەکوتۆ ، تۆلەی حسین پالی پێوەناوین جادەبێ تۆبێ بەهانە یێی بۆ یاریدەمان عبیدالله وەرامی نامەکەی نەدایەوە ، موختار ڕقی هەستا دوستوری‌دا خانوومالەکەی لەکوفە وێرانکرا وهەمو سامان‌و دارایی تالآنکرا وخانمەکەشی خرایەزیندانەوە ، سەرکارێتی ئەم‌شالآوە خرابووە ئەستۆی « عمرو کوڕی سعید کوڕی قیس » هەمەدانی ، کە « عبیدالله » ئەم هەوالەی بیست یەکسەر هێرشی‌بردە سەرکێلگەو زەوی‌وزارەکانی عمرو لەماهان ( دینەوەر - نەهاوەند )و هەموئاژاڵ‌و چارەواکانی ڕامالی‌ودەغڵ‌و دانەکانی سوتاند ( الاخبار الطوال ) ٣١٨ .

سالی ١٢٨ك = ٧٤٥زا منصور کوڕی جمهور کەیەکێ بوو لەیاخیبووان ( خوارج ) هەڵات وڕوی کردە ماهین ـ (دینەوەر ـ نەهاوەند) وداگیری کرد وهەمو وڵاتی چیاشی داگیرکرد ( الکامل ٥/٣٥٤ ) .

پاش ئەم هەرایە کەمتر ناوی دینەوەر دێتەناوانو سەردارایێتی کەمتر بەرچاو ئەکەوێ تا دەورانی خەلافەتی عباسی ..

سالی ١٦٧ك = ٧٨٣زا خەلیفەی عباسی « محمد کوڕی عبدالله » کەبە نازناوی « مهدی » ناسراوە لە بەغداوە ( مدینة السلام ) کەوتەڕێ بەرەو کرماشان ـ کە ئەو حەلە سەر بە دینەوەر بوو ـ چونکە باسی سازگاریو وخۆشی ئاووهەوای « ماهسەبەزان »ی بۆکرابوو ( مروج الذهب عربی ٣/٣٣٣ فارسی ٢/٣٠٩ ) بەڵام لەم سەردەمەدا کوردان کینە لەزگ بووبوون بەرامبەر بەعباسی یەکانو لەشۆڕش وراپەڕینابوون دژی ئەوان ، وئارەزوو هەوەسیان ـ وەك دەرئەکەوێ ـ بەلای عەلەوی یەکانا بوو ، جا عباسی یەکان ناوی ئەم شۆڕشگێرانەیان نابوو سرِوسوالکەر ( صعالیك )ودزو دروزن ویاغی و سەرچڵ ، لەم هەرێمەوە ئەیانڕەتاندن بۆئەو هەرێمو لەو هەرێمەوە بۆئەو هەرێمی تری،بەڵام ئەوان کۆڵیان نەئەدا ونەئەبەزین،«بەلاذوریو ابن‌فقیه» نووسیویانە : لە سەردەمی خەلیفەی عباسی مهدی‌دا دزو درۆزنو وسرِو سوالکەر زۆر بووبوونو لە « سی‌سەر » خۆیان پەنادابوو ، جێگەکە زەمو نمکان بوو کەوتبووە ناوەندی

زنجیرەیێ زورگ‌و هەڵەتی سێ گردی لە بەرئەوە پێی ئـەوترا « سێ‌سەر » ئەم ناوچەیە هاوسنـووربـوو لەگـەڵ هەمـەدان ـ ئاذەربایجـان ـ ودینـەوەر ، مێـرگەکانی ئەم‌نـاوە تایبـەت‌بوو بۆرەوەولاغ‌و چارەواو ئاژالی « مهدی »ی خەلیفەی عباسی کەلەوێ سەرکارێکی هەبو ناوی « سلیمان کوڕی قیراط » بوو، لەدەس صعالیـك ودعار ـ واتـا سـرِوسوالکەرو خـوێری ـ کەلەێوان هەمەدان‌و دینەوەرا خەریکی دزی‌و جەردەیی بوون‌و لەرێگری‌دا ئەوەندە کارەمابوون چار نەئەکران ؛ هاتبووە تەنگ، « مهدی » فەرمـانی دا « سێ‌سـەر » بکرێتەشـارو کونگـەرەو شوورەی قایمی بۆبکرێت ، ئنجا خەلکێکی زۆری لەدیهاتە ـ کانی دینەوەرز گوزمەی ئاذەربایجانەوەو جێی‌ترەوە هێنائەوێ نیشتەجێی کردن ووردەوردە بووبە کوورەیێکی گەورە ( مختصر بلدان ٦٦ وفتوح البلدان ٣٠٣ـ٣٠٤ ) گوایە ئەم سیسەرە لەجێی ئیستەی شاری سنەبووە وەك لەمەودووا باسی‌دێ .

پاشان « مهـدی » « هارون الرشـید »ی کـوڕی خوێی کردە فەرمانڕەوای کوردستـانو بـەشی خۆرئـاوای ئێـران ، لەوەدووا کەهارون بووبە خەلیفە ئەویش لەوناوەدا کوشتارێکـی زۆری کرد ( فتوح البلدان ٣٠٤ وکـرمنشاهـ باستان ١١٦ ) . جوغرافیا زانـی بـەناوبـانگ « لیسترنگـی خـۆرهەلاتناس » دەربارەی ئەم « سێ‌سەرە » لێکۆلینەوەیێکی هەیە زۆر بەقوولی نووسیویـە : « بـەدوورایی ٦٠ میـل لـەژوور کـەلاوەکانی دینەوەرەوە شاری سحنە ( صحنە ) هەیە کەبنکەی تازەی‌هەرێمی

کوردستانی فارسی یه ؛ هەرچەندە گەشتیارو گەڕیدەکانی سەدەکانی ناوەند چ عەرب و چ فارس لەکتێبەکانیانا بەمناوە ناویان نەبردووە بەڵام لەجێی ئێستەی « سەحنەی » تازە لەصەدەکانی ناوەندا بەپێی دوو کتێبی : « مسالك » کە « ابن خرداذبەو قدامە » نووسیویانن شاری سیسەر هەبووە ، کەوەك یاقووت وتویە : لەم سیسەرەدا کانی وچەشمەیێکی زۆرهەبووە لەبەرئەوە پێی وتراوە « صەت‌خانی » ( واتا صەت خانوو ) یاکانی‌ئاو لەبەرزۆری چەشمەکانی ، جا « ئەمینی خەلیفەی عەباسی » قەڵاو کونگرەو دژێکی تیا دوروستکردو مأمون بەسپاوە لەشکربەزی تیاکرد کەبەشێ لەسپاکەی لەوعێلە کوردانە بوون کەپاوەنەو لەوەڕگاکانیان نزیك بەئەوناوانەبوو ،لەو ٢٤دێهستانەی کەسەربە هەمەدان بوون ؛ دووریش نی‌یەناوی « سەحنە »یش هەر لەصەدخانی‌یەوە هاتبیت ، واتا بوویێت‌بە « سیخانە »و سیخانەش بوویێتە « سەحنە » گەرچی بەڵگەو دەستاوێز بەدەستەوە نیە ( ارض الخلافة الشرقیه « مسرزمینهای خەلافەت شرقی ٣٠٥ » )
مەبەستی لیسترنك شاری « سنە »یە نەك « سەحنە »ی سەربەکرمانشاهـ کەناوچەی دێهستانی « صحنە »یەو خەڵکەکەی لە ئەهلی حەقە کاکەیەکانن . ئەوەش کەنووسیویە « سنە » ناوی نە هاتووە وانیە ، سالی ٩٨٨ك١٥٨٠ کە « تەیمورخانی ئەردەڵانی » خۆی داوەتە پال دەولەتی عوثمانی‌و « سولتان موراد » حکومەتەکەی بەرەسمی ناسیوە ؛ سنەو حسن‌ئاواو وقەڵای قزلجەی داوە بەسولطان‌عەلی کوڕەگەورەی تاد

( شەرەفنامەی فارسی ١٢٤ وعربی ١١٤ ) ئنجا زاراوەی ( واتا صەت خانوو ) کە لەلایەن وەرگێڕی فارسی کتێبەکەوە خراوەتە ناوکەوانەوە ، نیشانەی ئەوەیە نەیزانیوە « خانی » واتا « کانی » ، و چەشمەی ئاو ، کاکە حەمەش وەکو یاسایێتی لێرەشا پەراوێزێکی نوسیوە : کە « خانی »ی لەباتی « کانی » نەیستوە « هانە »ی بیستوە ، ئەوەی لەبیرچووە کە بەشێ زۆری لوڕو گۆران ( خانی ) ئەڵێن ، با ئەوەشی بۆڕوونبکەمەوە کەکتێبی فتوح البلدان بلاذری ( لاپەرە ٣٠٣ ) نووسیویە بە سیسەر ئەوترا سیسەری صەتخانی واتا سی‌کەڵەو صەت‌چاوە، چونکە کانیی زۆری تیابوو کە ئەگەیشتە صەت‌کانی

ساڵی ٢٠٢ك = ٨١٧زا « فضل کوڕی سەهل » وەزیری « مأمون خەلیفەی عباسی » کەبەنازناوی ( ذورئاستین ) ئەناسرا کوژرا . مأمون بڕیاریدا هەموئەوانەی لە کوشتنیدا دەستیان هەبووە بکوژرێنەوە ، بەڵام ئەوان هەڵاتبوونو خۆیان شاردبووەوە ، مأمون دە هەزاردیناری دانا بە پاداش بۆهەرکەس بتوانێ بیانگرێ وبیانداتە دەستەوە ، جا « عەباس کوڕی هەیثەمی دینەوەری » دەسگیری کردنو هێنانی بومأمون ، ئەویش لێی پرسین :

بۆچ ئەم تاوانە ناشایە ستەیەتان کردووە ؟ لە وەراما وتیان : خەلیفە لە خوابترسە تۆ خۆت دوستورت بەئێمەنەدا کەبیکوژین؟ مأمون بایەخی نەدا بەقسەکانیان وفەرمانی دابەجلاد لەسەریان

بداو ، سەرەکانیان بیات بۆ « حسن کوڕی سهل »ی برای ؛ پاش کوژرانی فضل ، دایکی کەوتبوە گریەوزاریەکی سەخت ، کە مأمون بەوەی زانی هەستا چووەلای و کەوتە دلدانەوەی بەوە کەبە رەحمەتی خواچووە وچاری فەرمانی خوایی نیە ؛ ئنجا وتی : من لەباتی ئەو بەکوڕی خۆت قەبول بکەو ئیتر گریەوزاری مەکە ، دایکی فضل وتی : کوڕێ کە خەلیفەیێکی وەکو تۆ جێی ئەوم بۆ بگرێتەوە حەیف نیە شەووڕۆژ بۆی نەگریم ؟؟ ( الکامل ٦/٣٤٧ ، دستور الوزراء ٦٧ ، روضة الصفا ٣/٤٦١ ) .

سالی ٢١٢ك = ٨٢٧ زا عبدالله کوڕی طاهر ذویمینین کرا بەوالیی عیراقی عەجەم و ئاذەربایجان ، جا شاری دینەوەری کردە بارەگای خۆی و کوشکێکی لە دەرەوەی شار دوروستکرد ـ گەرچی لەدلەوە زۆر لەو کارە ناڕەدڵ بوو ـ حەزی لەوەبوو کەبێ بەفەرمانڕەوای خوراسان ، کەدرابووە طەلحەی برای ، جا ١٥ ربیع الاول سالی ٢١٣ك = ٨٢٨زا طەلحەی برای مرد ، مأمونی خەلیفەی عباسی قاضیی بەغدا «یحیاکوڕی اکثم»ی نارد بۆلای ، هەم بۆئەوەی لە کوڕی پرسەدا دابنیشێ ، وهەم سەرخۆشی لێبکات و هەم مژدەی والیێتی خوراسانی بداتێ وبێی ڕابگەیێنێ کە بەزوترین کات بگاتە خوراسان بۆ سەرکوت کردنی پەیرەوانی بابەکی خورەمی لەوناوەدا . ( وفیات الاعیان ٣/٨٤ ، الاخبار الطوال ٤١٩ وبلدان یعقوبی ١٦٦ کاکە حەمەنووسیبوی بەر چاوم نەکەوت ، ڕاستیکرد ژمارەیلاپەرەکە بەهەڵە لوو سرابوو ) .

واديارە پاش عبدالـله کابرایێ تێرابووە دینـەوەر ناوی « محمد کوڕی جهم » بوو ابن عبدربە نووسیویە : ڕۆژێ مأمون خلیفەی عباسی « محمد کـوڕی جهمی » گازکردە لای خۆیو پێی وت : بەیتێکـم بۆبێنـەوە کـەنیـوەی داشۆرینو نیـوەی دووەمی هەڵنان بێت ، لەپاداشا کوورەیێکت ئەخەمە ژێردەست ، محمد ئەم بەیتەیوت :

« قبحت مناظرهم فحين خبرتهم حسنت مناظرهم لحسن المخبـــر »

[ واتـا دیمـەنیان کریتوناشیرینبو کـە دەستم پیاهێنان جوانەوەبوو دیمەنیان بەوجوان دەرپیا هێنانـە ] ئنجا مأمـون وتی : بەیتێکی تریش : محمد وتی :

« ارادوا ليخفوا قبـره عن عدوه فطيب تراب القبـر دل على القبر »

[ واتا ویستیان گۆڕەکەی لەدوژمن بشارنەوە ، بەڵام بێنی خۆشی گڵی گۆڕەکە ڕێبەدتیی کردنبۆی ]

( العقد الفريد ٥/٢٨٢ ، کاکەحەمـە نووسیبوی ٦/٢٢١ چاپی قاهیرە ، باشە مالی ئاوابێ )

خاك بەسەر ئەونەتەوانەی کە بێ ڕەضای خۆیانو هـەر لەبەرخاتری تاقـە هـەڵبـەستێ کابرایێبکرێت بـەفەرمانڕەوای وڵاتیان ..

سالی ٢١٤ك = ٨٢٩ز « عبدالله کوڕی طاهر » کە سەردار سپای « مأمون » بو لە دینەوەر کـەوتـە سپـا تەیارکـردن بـۆ

سەربابەکو دای بەسەر یاخی‌یەکانیا (خوارج) لـە خوراسـان ، تەنانەت کە ئەوان ئەو حەلە لە گونـدێ «الحمراء»ی نیـابـور کۆبووبوونەوە . ( الکامل ٦/٤١٤ ) .

سالی ٢٣٥ك = ٨٤٩زا ) خەلیفەی عباسی المتوکل علی الله هەندێ ولاتو هەرێمی دا بـە « محمـد »ی کـوڕی خـۆی کەناز ناوی « المنتصرباللہ »بو کەئەمانـەبوون : ماه بصـره ـ ماهسەبزان ـ مهرگان کوچك ـ شارەزوور ـ صامغانو هی‌تری ( الکامل ٧/٤٩ ) .

سالی ٢٦١ = ٨٧٤زا خەلیفەی عباسی « المعتمد باللہ » ابو احمدی کوڕی دووەمی خۆیی کردە جی‌گرەوە ، پاش « جعفری کوڕی یەکەمی » هەروا بەسەرداری ولاتەکـانی خۆرهـەلاتو نازناوی « الناصر لدین الله »ی دایی لەگەل فەرمانڕەوایی ئەم هەرێمانە ( ئەصفەهان ـ قوم ـ کـەرەج ـ دینـەوەر ـ ڕەی ـ زەنجان ـ وسـندەو هی‌تری ) ( الکامل ٧/٢٧٨ ـ طەبەری ٥/ ٢٦جا بەێی نزیکی ئەم‌سندەیە لەز نجانەوە دوور نیەهەر سنەی ئیستا بوویت ) .

سالی ٢٦٤ك = ٨٧٧زا « ابن الدیرانی » نێررا بۆ دینەوەر ، بەلام « ابن عیاض » کەوتە هاوکاری لەگەل « دولەف کوڕی عبدالعزیز کوڕی ابو دلف و بـەهەردولایان ناومالوسامانیان تالانکرد جابەسەر شۆڕی‌گەرایەوەبۆ حەلەوان ( طەبەری ٩/ ٥٣٣ ) .

سالی ٢٦٦ك = ٨٧٩زا کابرایێکی « بوکتـومور » نـاو لەدینەوەربووە ، خۆیو « کەیغەلغ »ناوێ کە سەربە خەلافەت بوون لێیـانقەومـاوەو هـەلاتـوون ، پاشـان هـەرلەوسالـەدا بوکتوموریان جارێکی تری گەڕاوەتەوە دینەوەر ( الکامل ٧/ ٣٣٦ ) .

سالی ٢٨٠ك = ٨٩٣زا « المعتضد باللـه خەلیفـەی عباسی » ( راشد )ی نۆکەری « الموفق بالله خەلیفەی عباسی » کرا بـــە فەرمانڕەوای دینەوەر و خەلاتی لەبەرکرا ، ڕۆژی ١٠ ذی القعدە کەوتەڕێ بەرەوجـێ فەرمانەکـەی ، پاش دوومانگ دویەمیـن ڕۆژی مانگی ڕۆژو لەدینـەوەر تەرمەکـەیان خستـە تابوتـەوە هێنایانەوە بەرەو بـەغدا ( طـەبەری ١٠/٣١ ـ ٣٤ ) ( الکامل ئەمباسەی خـستۆتە سالی ٢٨٠ بەلام خاوەنی مجمل التواریـخ والقصص خستۆیەتیەیە سالی ٢٨٦ لاپەڕە ٤٤ ) .

سالی ٢٨٠ك = ٨٩٣زا « المعتضد بالله خەلیفەی عباسی » کەوتە ڕێ بەرەو هەرێمی چیا وڕوی کردە دینـەوەر ، لـەوێ « علی » کوڕی خۆیی دانا بە سەرداری هەندێ ولاتو ناز ناوی « المکتفی باللـە »ی دایێ ، ولاتـەکان ئەمانـە بوون : ڕەی ـ زەنجان ـ قەزوین ـ ئەبهەر ـ هەمەدان ـ ودینەور .. تـاد و ، « أحمد کوڕی اصبغی » کردە نووسـەری ( طەبەری ١٠/٣٦ و الکامل ٧/٣٦٧ و المنتظم ٥/١٤٧ ). سـالی ٢٩٦ك = ٩٠٨ زا ، « یوسف کـوڕی ساج » لـە کاربـەدەستانی « المکتفی » وەك ابن الاثیر نووسیویە :ـ کرا بەسەرداری ئەرمینیەو ئاذەربایجان

بەقەبالەی ۱۳۰ هەزار دینارو لەدینەوەرەوە چوو بۆ ئەوێ کـە کارەکەی بگرێتە دەست ( الکامل ٥٤/٨ )

سالی سێ صەت ك = ۹۱۲ز لەدینەوەر کێوی خزاو داکەوت، لە ژێریا ئاوێ هەلقولا ، چەندین گوندو ئاوایی وێران کرد .. هەر لەم سالەدا لە دینەوەر هێستری زاو جاش هێسترێکی هێنا ، ئەو هێسترە هی کابرایێ بو ناوی « احمد کوری علی مری »بو خەلکێکی زۆر چوون بۆ دیتنی ئەو هێسترە و لـە کاری خوا واقیـان وورِ ما چونکـە هێستر نـازێ ، « بـەریـدی » ئـم هەوالەی بەنامە نووسی وجارچی‌ی کرماشانیش نامەکەی گەیاندە بەغـدا ( ذیل طەبـەری ب۱۱/۴۲ )• سـالی ۳۰۱ك = ۹۱۳ز « محمد کـوری اسحاق کەنداجیق ( کـەنداج ) کـرا بەوالیی دینەوەر ( ذیل طبری ۱۱/۴٤ )

سالی ۳۰٤ك = ۹۱٦ز « طرخان کـوری محمد کـوری اسحاق کوری کەناجیق » لە مانگی رۆژودا هاتە بەغدا بەنیازی ئەوەی بچێ بۆ حەج ، جا چووە دیتنی « علی عیسا »ی وەزیر ، لەوێ هـەوالی مردنی بـاوکی درایی‌و خۆیشـی لـەجێی ئـەو کرابەوالیی دینەوەر ( ذیل طبری ۱۱/٦۰ )

سالی ۳۰۸ك = ۹۲۰ز ابو هیژا عبدالله کـوری حمدان خەلاتکراو فەرمانی پاراسـتنی رێی خوراسـان ـ دینـەوەری درایی ( تجارب الامم ۱/۳٥ والکامل ۹/۱۲۳ )

سالی ۳۱٤ك = ۹۲۷ز « خەلیفەی عباسی المقتدر بالله » بەشی خۆرهەلاتی ولاتی خستە ژێرفەرمانی « یوسـف کـوری

ساج » و دوستوری دانی کەباج و پیتاکی ئەوناوە کۆ بکاتەوەو بیکا بە مەصرەفی فەرماندەو ئەفرادی سپاو دوستوریشی دانی کە بەزووترین کات لە ئاذەربایجانەوە بگاتە بەغدا ، کەلەوێوە رووبکاتە واسط و لەوێوە بچێت بەرەو « هەجەر » بۆ شەڕ لەگەڵ « ابو طاهر » ڕابەری قەرمەطی یەکان .. جاکەڕوی کردە واسط لەو حەلەدا « مونس کوڕی مظفر » لەوێ بوو ، هەر کەئەم لەوێ نزیك کەوتەوە « مونس » بەجێی هێشت وڕوی کردە بەغدا بۆ ئەوەی لەوێ بمێنێتەوە ، خەلیفە باج و پیتاکی ئەم هەرێمانەی تەرخان کردبۆ ئەم « یوسف »ە کەصەرفی بکات بۆ خوان و بۆیاریدە دانی سپا کەبتوانی دەوام بەشەڕبدات دژی قەرمەطی یەکان ، ولاتەکان ئەمانەبوو : هەمەدان ـ ساوە ـ قوم ـ کاشان ـ ماه بەصرە ـ ماه کوفەماهسەبەزان .. (تجارب الامم ١/١٨٤ والکامل ٨/١٦٤ ) .

سالی ٣١٥ك = ٩٢٧ر١ وەکو ابن مسکویە نووسیویە : مەرداوێژ ( مرداویج ) کوڕی زیاد کەیەکێ بوو لە فەرماندەکانی « ئەسفاری کوڕی شبیرۆیە »ی دەیلەمی کەپیاوێکی ستەمکارو زۆردارو خوێنرێژ بوو دژی ڕاپەڕی ولەگەڵی کەوتە شەڕەوەو ڕایفڕاند ، ئەسفار هەلاتو مەرداوێژ کەوتە ڕاونانی ، بەلام پێیا نەگەیی ولە دەستی دەرچوو ، کۆمەلێکی تری دوای کەوتن ڕۆژێ باشتر کە ئەسفار خۆی کردبوویە ئاسیاوی (ئاشی) گوندێکاو داوای خواردنی لە ئاشەوانەکە ئەکرد ئالەم حەلەدا مەرداوێژ خۆی کرد بەئاشەکەدا بۆ پشکنینی ، سەرنجی‌دا ئەوا

ئەسفار خەریکی نانخواردنە ماوای نەدا سەری بڕی و گەڕایەوە بۆ قەزوین .. مەرداویژ لەوەبەدووا هێند لەخۆی بایی بووبوو ئەیوت : « منم سلیمانو ئەم سەربازانە دێوەکانی منن » (تجارب الامم ۱/۱٦۲ )

ابن الاثیر ئەم باسەی خستۆتە سالی ۳۱٦ك وئەلێت : هەرا لەنێوانی ئەسفاری دیلەمی ومەرداوێژدا گەرم بوو . مەرداوێژ توانی بە کۆمەڵو یارمەتی « ماکانی کوڕی کالی » بەسەر ئەسفاردا زاڵ بێتو بیکوژی ، ئنجا ڕووی کردە « ڕەی »و داگیری کردو لەوەپاش ئەم شارانەشی هەمو داگیرکرد : هەمەدان ـ کەنگەوەر ـ دینەوەر ـ وەروگرد ( بروجرد ) ـ قوم ـ کاشان ـ ئەصفەهان ـ گولپایەکان ( جربادقان ) وهی تری ( الکامل ۸/۱۹٦ )

هەر لەم ساڵەدا هارون کوڕی غریب الخال « نحریری خادم »ی خۆیی لەجێی « عبدالله کوڕی حمدان » کردە والیی دینەوەر ( ذیل طبری ۱۱/۱۲۰ )

ساڵی ۳۱۷ك = ۹۲۹ز مؤنس « علی کوڕی عیسای وزیر »ی لەبەند ڕزگارکرد و ناردیەوە بۆماڵی خۆی ، وابوعلی موقلەی بانگکردو داینا بەوەزیری « القاهر بالله »و « نازوك » یشی دانا بەسەرۆکی پەردەداران ( الحجاب ) سەرباری ئەوکارەی کە هەیبوو ئەویش سەرداریتی هێزی باڵبازبوو لەبەغدادا (دار السلام) ئنجا ئەم جێگەیانەشی سپارد بە «ابو هیجاء عبدالله

کوڕی حمدان » ، سەرباری ئەو جێگایانەی کەلەوبەر
سامەراء - بزورك ساپور - هەردوو ڕاذان - داقوق - خانیجار
سامەراء - بزورك = ساپور - هەردوو ڕاذان - داقوق - خانیجار
موصل - وكاروباری یاریدەدەریی سەرداری هەمەدان -
نەهاوەند - صەیمەرە - سیروان - ماهسەبەزان - مهرگان
کوچك .. تاد . ( تجارب الامم = ١٦١/١ )

پاش ئەم دەورە هەرێمی دینەوەر خراوەتە ژێر دەستی
« بنی کوڕی نفیس » بەڵام « القاهر باللەی خلیفەی عباسی »
لێی وەرگرتۆتەوەو داوێتی بە « ابن حمدان » ، ابن اثیر
لەمبارەوە نووسیویە : سالی ٣١٧ك مونس کەفەرماندەی سپابوو
« المقتدر باللەی خەلیفەی عباسی » لەکورسی خەلافەت داگرت
« القاهر بالله محمدی » لەجێی ئەو دانا بەخەلیفە ، وڵاتی
دینەوەرشی دایە « بنی کوڕی نفیس » ( الکامل ٢٢٠/٨ ، ٢٠٢ )
سالی ٣١٩ = ٩٣١زا هەواڵ گەیشتە بەغدا کەلە نێوان هارون
غریب الخالو مەرداوێژا شەڕ قەوماوە ، نزیكبەشاری هەمەدان ،
جا هارون هەڵاتووەو مەرداوێژ هەمو هەرێمی چیای داگیر
کردووە تا حەلەوان ، « هارون » گەڕاوەتەوەو لە «دیرالعاقول»
لەشکر بەزی کردووەو بەهەوڵو تەقەلا لەشکرێکی تازەی
پێکەوەناوە ولەبەغداشەوە هێزێکی تریبۆ نێردراوە کە بەفریایا
بگات نەەروا لەشکرێکیش نێررابۆ نەهاوەند ، لەگەڵ کۆمەڵەیی
کوێلەدا کەبچن لەدینەوەرەوە سامانو ئازوقەو گەنجینە بەرنبۆ
شاری هەمەدان ، جا « هارون » هەرکە لەشکری بۆ گەیشتە

هەمەدان وتەماشای کرد خەلکەکەی زۆر دەولەمەندن مرخی ئێ خۆش کردنو بڕیاری‌دا صەت‌هەزار درهەم پیتاکیان بەسەرابپڕێ، خەلکەکە ناچاربوون لە ماوەی حەفتەیێکا ئەو پارەیەی بۆکۆبکەنەوە ( تجارب الامم ۱/۲۱۳ )

هەر لەم ساڵەدا کەشەڕ لەنێوان لەشکری مەرداوێژو سپای خەلیفە ـ المقتدر باللە عباسی ـ دا لە هەمەدان ڕووی‌دا خەلکی شاری هەمەدان یاریدەی سپای خەلیفەیان‌دا دژی مەرداویز ولەم شەڕەدا خوشکەزا یێکی کوژرا ، بەلاَم ئەو وازی نەهێنا بەشارێ‌دا کەوتەرێ بەرەو هەمەدان ، خەلکی شارەکە لە ترسا خۆیان لە دژو قەلاَکانا قایم کردو لەگەلی کەوتنە شەرەوە ، مەرداوێژ کوشتارێکی زۆری ایکردنو دیلێکی فرەی لێگرتنو مالەکانیانی هەمو سوتاند ... « هارون غریب الخال » کەفەرماندەی سپای خەلیفەبوو هەلاَتو مەرداوێژ هەمو چیای داگییر کردەوەو یەکێ لەفەرماندەکانی خۆیی نارد بۆ دینەوەر ناوی « ابن علان قزوینی »بوو شارەکەی بەشەڕەشمشیر داگییرکرد وکوشتارێکی زۆری تیاکرد کەژمارەی کوژراوان لەنێوانی ۱۸/۰۰۰ تا ۳۹,۰۰۰ کەس دانراوە ( الکامل ۸/۲۲۷و دائرة المعارف الاسلامیة‌ه/۲۰۲لەفارسی‌یەکەدا بە هەلەنووسرابوو « بطرس بستانی » کاکەحەمە وشیاری کردینەوە مالی ئاواییێ )

کۆمەی خەلکی هەمەدان کەوتنە هاوارو فەریادو زۆربەی خەلك لە دینەوەریش « قورئان » یان کرد بەسەری ڕماو کەوتنەڕێ بەدادوفەریاد لەدەست « ابن‌علان »و مەرداوێژی

سەرۆکی ، کەبە هەردوویان مرۆڤی ولاتیـان قرکـردووەو ژنو مالو منالیان بەتالان بردووە • ( مجمل التواريخ ۳۷٦ ) هـەر لەسالی ۳۱۹ك = ۹۳۱زا کە وەزیر ابو القاسم عبدالله کوری محمدی گـەلومزانی روی کردە دینـەوەر ؛ ( ٥٠٠ سـواری کەخۆیان لەهەرێمی چیاقایم کردبوو روویانکردە « ماهکوفە = دینەوەر » و « حەلەوان »و ئەم ناوانە کە مەرداوێژ نەیتوانییوە داگییریان بکات ؛ جا چونکە سەربازەکان ئازوقـەیان نـەبوو موچەیان وەرنەگرتبوو داوایان لـە وەزیر گـەلومزانی کـرد ئازوقەیان بداتێ ، گەلومزانی وتی باشە بگەڕێنەوە جێی خۆتان، کەلەوێ ئازوقەتان بەسەردا دابەش بکرێت ، ئەوان بەقسەیـان نەکرد ودایانەبەر بەرد وکەرپوچ • ( تجارب الامم ۲۱۹/۱ )

سالی ۳۲۱ك = ۹۳۳زا خەلینەیعباسی « المقتدر باللـە » کوژراو « القاهر باللـە » لـەجێی دانرا ، هـارون غریب الخال وچەندین کەس لەم حـەلانەدا هـەلاتبون ؛ هارون نامـەیێکی نووسی بـۆ « القاهـر »و داوای ئەمانی لێکردو بـەلێنیشیدا کەسێصەتهەزار دیناربدات ؛ قاهر ومۆنس هەردوو بـەلێنی ئەمانیـان داێـیو سـەردارێتـی ماهکوفـەو مـاهسـەبـەزان ومیهرەکانکوچك یانیش پێ سپارد • ( الکامل ۲٤۸/۸ )

سالی ۳۲۲ك = ۹۳۳زا « ماکان کوری کالی » هەلی کوتایە سەر محمـدی کـوری الیاس لەکرمـان وراینـراند ؛ محمـد هەلاتبەرەو دینەوەر وداگیری کرد ( الکامل ۲۸۸/۸ ) •

سالی ۳۲۳ك = ۹۳٤ز‌ا ومختی که « القاهر بالله » لـــه پۆستنشینی لادراو کوژراو « راضی بالله » یـان لەجێی دانـا بەخەلیفـە ، « هارون غریب الخال » مرخی خۆی خۆش کـرد کە بێتە وەزیرو نامەی بۆهەمو فەرماندەکان نووسیو بەڵێنـی پێشخـستنو مووچـەوئازوقــەی باشـیدانو لـەدینەوەرەوە ڕویکردده بەغدا وگەیـە خانەقین « ابن مقلـەو ابن یاقوت » سەردارانی ساجیەو حەجەریە ئەمەیان زۆرلاگرانو ناخۆشبوو سکالایان بردە بەر ڕاضـی ، لەوەرامـا پێی وتـن : کـە حـەز لـەچـارەی ناکـاتەو دوستـوریشی دانێ کـەبـەری بگــرنو بەربەستی بکەن ، ئـەوان نامەیان بـۆی نووسیو ســەرداریتی ڕێگەی خوراسانیان خستە سەرئەو کارانەی پێی سپێـرراوە ، بەڵام هارون بەوە قایل نەبوو ، بەرەو بەغدا کەوتەڕێ وگەیـە «نەهرەوان» وباج وپیتاکی ئەو ناوەی هەموو کۆکردەوە ... گەلالەی باس ، ئەمانیش سپایان نارد بۆ بەرانگای وتۆکەرێکی خۆیان لێی هاندا ناوی « یمن »بوو چوولەناکاو تەبەرزینێکی دالەملیو کوشتیو تەرمەکەیان بردەوە بۆ بەغدا لەوێ ناشتیان ( الکامل ۸/۲۸۸ )

هەر لەم ساڵەدا « سـەرداوێژی فـەرماندەی چیا لـەلایەن سەربازو سپاییەکانی تورکی سەربە خۆیەوە کـوژراو ، ئـەوان لەناو خۆیانا بوون بەدووبرەوە : برێکیان بەسەرداری » بوجکوم « ڕوویان کردە هەرێمی چیاو کەوتنە باجو پیتاك کۆکردنەوە لـە « دینەوەر » وشارانی تری .. ئەم بوجکومە لەبنەڕەتا خولامی

« ابو علی عارضـی دەیلـەمی » وەزیـری « ماکـان » بـوو یەکێ بوو لـە کوێلـە تورکەکـان ، ماکـان لـە « ئـەبو عـلی » خواستی‌بەوەو کردی بە تۆکەری تایبـەتی خـۆی بـەڵام لای ماکان نەمایەوە هەڵاتو چوە لای «مەرداوێژ» وجێی خۆی خۆش کرد . جا بەنیازی پێشکەوتن کـەوتە خیانـەت ، بەدەستـەکی هەندێ لەسەرداران‌و فەرماندەیان مەرداوێژی کوشتو هەڵات بەرەو بەغدا ، سەردارانی دەوروبەری خەلیفە رێیان نەدا ناچار چوو بەرەو « واسط » لەوێ بووبە سەرلقی بەشێ لە هێزەکەی « محمد کوڕی رائـق » وناوی خۆی‌نا « بوجکومـی رائیقی » ولەگەڵ « عبداللەی بریدی » سەرەك‌وەزیری خەلیفە کەوتـە شەڕەوە دووجار شکستی پێ‌داو سپاکەی بەزاند .. پاش ئەوە ئنجا خیانەتی لە رائق کردو سپایێکی رێك‌خست ویستی خۆی بکات بەسەردارسپا لەیەکێك لـەهێزەکانی خەلیفـەدا وسـالی ٣٢٦ك = ٩٣٧زا خەلیفەی عباسی « الراضی » مرد ، و « المتقـی بالله » لەجێی دانرا ، ئەم ، بوجکومی هێنا کردی بەسە دارسپای خۆی .. سالی ٣٢٩ك = ٩٤٠زا « توزون »ی نارد بۆ سەرکوت کردنی « بریدی » کە گۆیا رووی لە خەلیفـە وەرگێڕابوو ، بەڵام توزون لەیەکەم شـەڕا شکستی خوارد وداوای کۆمەکی لە « بوجکوم » کرد بەڵام پێش ئەوەی ئەو بەرێ بکەوێ بەرەو واسط ، « توزون » لـەشەڕی دووەما سـەرکەوتو هـەواڵی سەرکـەوتنی خـۆیی بەنامـە نووسـی‌بۆ « بوجکـوم » ئنجـا یاروپاوەرانی بوجکوم داوایان لێ‌کرد کەخۆی بحـەسێنێتـەوەو

لەدەوروبەری «واسط» خۆی بەڕاوو شکارەوە سەرگەرم بکات، بوجنوم کە گەیشتە دەوروبەری ڕوباری «جۆر=کۆڕ» بیستی لەو ئاوەدا دەولەمەندی کورد زۆرن ، چاوچنۆ ڵیو چنک زەردی پالی پێوەنا کە هەلکوتێتە سەرکوردەکان وتالانیان بکات ، جابە هێزێکەوە چووە سەریان ، خێلاتە کوردەکان لە ئاوا هەلاتنو ئەودوایان کەوتو بەتیر دایگرتنو ویەکێکی لێ کوشتن ، بەلام کەنجێکی کورد بۆی هاتەکارو لەپشتەوە هەلی کوتایەسەریو بەخەنجەردای لە کەلەکەیو کوشتی ، ئەمە لە٢٦ مانگی رمجەب سالی ٣٢٩ك دابوو ( الکامل ٨/٣٦٦ ـ ٣٧٢ و دائرة المعارف الاسلامیة ( ٥/٣٥٩ ) لەفارسی یەکەدابە هەلە نووسرابو بطرس بستانی کاکەحەمە وریای کردینەوە مالی ئاوابێت )

« مستوفی قەزوینی نووسیویە : کە بوجکوم کوژرا سامانێکی زۆری لێ بەجێما تەنانەت دووملیون دیناری سوور ( زێڕ )و شەش‌ملیون درهەمی سپی ( زیو ) • ( تأریخی گوزیدە ٣٤٥ )

بەلام ابن الاثیر نوووسیویە : ملێونێكو دووصەت هەزاردینار ، کەئەمەندەی لەماوەی دووسال ونۆمانگ سەردارسپاییدا کۆکردۆتەوە ، خەلیفەی عباسی « المتقی باللە » دوستوری داوە هەموسامانە کەی خراوەتە گەنجینەی خەلافەت ( بیت المال ) • ( الکامل ٨/٣٧٢ ) بێ گومان‌ئەم کارەیان لەبەر

ئەوە بووە کەبێ کەس‌مردووە ، لاتسەیرنەبێ لەو حەلانەدا
هەرکەس کەسەرکارێتی ئیشێکی بەدەس‌بووە ، تەنها لەگەڵ
دزی‌ودرۆزنی‌و تالان خەریك‌بوومو هەمیشە ویستوویە گیرفانی
خۆی پڕبکات نەوەك گەنجینەی گەل٠هەر لەم سالەدا ۳۲۹ك
فەرماندەی دەولەتی سامانی « ابو علی محتاج » شالاوی‌کردە
شاری « رەی »و داگیری کرد ، « وەشمگیر »ی برای
مەرداویژ لەترسا هەلات بەرەو طەبەرستان ( مازەندەران ) ،
« ابو علی » پاش حەسانەوە جارێکی تریش بۆ داگیر کردنی
چیا سپای تەیارکرد وئەم‌شارانەی هەمو خستە ژێر ڕکێفی
خۆیەوە : زەنگان ، ئەبهەر ، قەزوین ، کەرەج ، قوم ، هەمەدان،
نەهاوەند ، دینەوەر ، تاسنوری حەلەوان ، لە هەموشارەکانا
نومایەندەی خوێی داناو باج‌و پیتاکی ولاتی کۆ کردەوە ، پاشان
براکەی خۆیی کەناوی «ابو العباس فضل کوڕی محمد»بو نارد
بۆ هەرێمی چیا ، ئەم فضلە سالی ۳۳۲ك=۹۳٤زا کەڕوی کردە
هەرێمی چیا بۆ داگیر کردنەوەی دینەوەرو نەهاوەند وشارانی
تری ، پاش زالبوون هەمو سەرانی‌کوردی هەرێمەکەی
کۆکردەوەو دلیانی دایەوە ، ئەوانیش هەمو بارمتەو ودیلەکانیان
بۆناردەوە ( الکامل ۳٦۹/۸ - ۳۳۸ - ٤٤٤ ) ٠٠ ئەمە یەکەم
جارە ناوی سەردارانی کورد ببرێت ، ودداني پیا بنرێ
کەبەرگریان لەولاتەکەیان کردووەو ودیلیان لە داگیرکار
گرتووە ، بەلام وادیارە سەردارانی کورد هەرگیز شارەکانیان
لامەبەست‌نەبووە کەبەدەست کێ‌وەئەبێ ! ئەوان تەنیا بەرگری‌یان

لەدێهاتو جێی کشتوکاڵ ولەوەڕگای ئاژاڵیان کردووە .
بەداخەوە هیچکام لەمێژوونووسان لەم دەورەدا ناوی تایبەتی سەرداره کوردەکانیان نەبردووە ، بێ گومان لەمناوەدا ئەوجەلە « عەیشانی »و « بەرزیکانی »و « عەییاری »یەکان هەبووە

سالی ٣٣٧ك = ٩٤٨زا « مەرزبان محمد کوڕی موسافری کورد خاوەنی ئاذەربایجان کە هەندێ بەهەلە بە « دەیلەمی » ناویان بردووە هەلی کوتایە سەر « رەی » ، رکن الدولەی بوەیهی هەوالی بیستو داوای یارمەتی وکۆمەکی لەبراکانیخۆی «عماد الدولە ـ معزالدولە » کرد ، معزالدولە بەفەرماندەیی « سوبوکتوکینی » تورك کەسەر لەشکری بوو هێزێکی بۆ یاریدەی نارد ، هەر کە سپاکە گەیشتە دینەوەر سەربازە تورکەکان لەگەڵ سوبوکتوکین تێوانیان تێکچوو بووبە هەرایانو شەودایانەسەریا ، ناچار بەسواری ئەسپەکەی ، خۆی لەمەرکێزگارکرد ( الکامل ٤٧٧/٨ ـ ٤٧٨٤ ) ۰ ابن مسکویە نووسیویە :

هەرکە سپاکەی سوبوکتوکین گەیە دەوروبەری دینەوەر « بوریش » لەگەڵ سوبوکتوکین بوو بە دەمەوقالیو لە فەرماندەیی خستو هەمو دەیلەمیەکان لەسپاکە جیابوونەوەو کەوتنەلای « بوریش »تەنها « رۆزیهان »و چەند کەسێ لەگەڵ سوبوکتوکین مانەوە ( تجارب الامم ١١٨/٣ ) ۰

سالی ٣٣٩ك = ٩٥٠زا « منصور کوڕی قراتکین » کە لەفەرماندەیانی دەولەتی سامانی بوو بە هێزێکی « نیسابوری »یەو

هەڵی کوتایە سەر « ڕەی »و هەمو هەرێمی چیـای تاقرمیـیـــن ( کرماشـان ) داگیرکرد ولە دەمی سـەرکارانی « ئالبویـە » دەری‌هێنا ، کەئەم هەواڵـە گـەیشتە « رکن الدولـە » کەلەو حەلەدا لە « فارس » بوو نامەی نارد بۆ « معز الدولە »ی برای کەلەشکرێکی ئەیاربنێرێ بۆبەرانگاریی سپای دوژمن‌و مـەیدان نەدات بگەنە هەرێمەکانی عراق ، جا سوبوکتوکین بەسپاییکەوە کە لەتورك‌و دەیلەم وعەرەب پێکی هێنابوو ، شەودای بەسەریانا کوشتارێکی لێکردن وپیشداری لـەشکرەکەیانی بـەدیل گرت کـەناوی « بـوجگومی خومارتکین »بوو لـەگـەل دیلـەکانی ڕاناردی بۆبەغدا ، بۆبەردەس معزالدولە ، بەڵام پاش ماوەیێ بەندکردن وچەرمەسەرێدان بەرەڵای کردن، « سوبوکتوکین » خۆی لەهەمەدان مایەوە « تارکن الدولە » گەیشتـە ئـەوێ‌و ، فەرمانی دابەسوبوکتوگین کـەلەبەراییدا بکەوێتـەڕێ ، هـەر کەویستی بەسپاوە بجمێت هەندێ لەتورکەکانی ناوسپاکە ئاژاوەیان خستەوە ، رکن الدولە کەئەمەی دی‌وتی : ئا ئەمانە دوژمنمانن کـەناوخۆمانان ، باش‌وایـە جارێ ناوخۆمان پاك‌بکـەینـەوەو دەستی‌کرد بەکوشتاریان وقڕانی تێ‌خستن ، ئەوانەی کەلەدەمـی تیژی‌شمشێررزگاربوون هەڵاتن کەئەم هـەواڵە گەییـە « معز الدولە » نامەییکی نووسی بۆ « ابن ابوشەوکی کورد » هەروا بۆهی تریش داوای لێکردن : کـە دوایان‌بکـەون ونابووتیان بکـەن ، جـا ئـەم‌سەردارانـە کـەوتنـەدوویان‌و ڕایان فڕاندن وهـەندێکیان کوشتن‌و هـەندێکیان بـەدیل گرتن ، ئەوانـەی

ڕزگار بوون ڕوویان کرده هەرێمی موصل . « الكامل ٨/٤٨٦ – ٤٨٨ ) .

بۆیەکەم جار ئێمە لەمێژووا چاومان بەناوی « ابن ابوشەوکی کورد » ئەکەوێ کەپیاوێکی ئەوەندە بە دەسەڵاتبوو « معز الدولەی بوەیهی » داوای کومەکویارمەتی لێکردووە بەڵام لەکام هەرێم بووە ؟ سەرداری چ عێلی بووە ؟ لێرەدا پەنا ئەبەینەبەر « ابن مسکویە » بۆ ئەوەی کەسایێتی ئەم پیاوەمان بۆروون ببێتەوە ، گەرچی باسەکە دەخلی بەدینەوەرەوە نیەو دەخلی بەحەلەوانەوەیە ، جا ابن مسکویە نووسیویە : .... کەباسی تورکەکانی سەر بە «توزون» گەیشتە معز الدولە نامەی نووسی بۆ « ابن ابو شەوکی کورد » وپیاو ماقوڵانی تری کورد کەسەربە حەلوان‌بوون ‌بداوای هاتنیانی کردبۆ سەرکوت کردنی « توزونی‌یەکان ، جا ئەوان هاتن‌و ودووای توزونی‌یەکان کەوتن ولێیان کوشتن‌و ولێیان بەدیل گرتن ، پاشان دیلەکانیان نارد بۆ بەغداو ئەوانەی هەڵاتن بە جۆرێکی زۆر خراب توانییان خۆیان گەیاندە موصل ( تجارب الامم ٢/١٣٩ ) .

لەدەنگ‌وباسی سالی ٣٤٢ك = ٩٥٣ز دا ابن الاثیر نووسیویە : « ... ئەو وەفدەی کە « المطیع للە »ی خەلیفەی عباسی ناردبووی بۆ خوراسان ، بۆ ئاوبژی کردن لەنێوانی « رکن الدولە ئال بویە ، ونوحی کوڕی نەصری سامانی »دا گەڕایەوە کەگەیشتە « حەلەوان » « ابن ابوشەوك » ڕێی لێگرتن وتالانی کردن‌و ئەو کاروانەشی تالان کرد کە ئەو وفدەی

تێدابوو ( الکامل ٨/٥٥٥ ) ئەوەی ڕاستی بێت ئێمە تەنها لەبەرناوی « ابن ابوشەوك » ئەم دەقەی ابن الاثیر مان باس‌کرد وەگەرنە باسەکە دەخلی بە حەلەوانەوە هەیە تەك بەدینەوەرەوە بێ‌گومان ابن الاثیر باسەکەی لە ابن مسکویە وەرگرتووە ؛ بەلاَم بەگەلاَلەیی ئائەوەتا ابن مسکویە نووسیویە:
« .. کە ابو مخلد لە خوراسان گەرایەوەو » ابو بکر عبدالواحد کوڕی عمرو شرابی شی لەگەڵ بوو « ابن ابو شەوکی کورد » کەلە عێلی شاذەنگانی بوو ، لە حەلەوان ئەرکی کاروباری یاریدەدەریی ( معاونە ) خرابووە ئەستۆ ، سەرباری پاراستنی ئاسایش‌و هێمنی‌ڕێگا ، لە سەرەتادا پێشوازی کردن‌و خولکی کردن‌و پاسەوانی لەگەڵ ناردن ، بەلاَم پاشان خۆی ستەمی لێکردن‌و تالاَنی کردن‌و ئەو کاروانەشی تالاَن‌کرد کەلەگەڵیان هاتبوو ، هەروا خود « ابو مخلد » یشی بەدیل گرت ، بەلاَم ابو بکر عبدالواحد کوڕی عمرو شرابی « بەدەربازبون خۆی ڕزگار کرد ، پاشان « ابن ابوشەوك » هەوالی بۆ « نارد : کەبەردانی وفدەکەو ابو مخلد بەمەرجێکە ئەو لەپێشا بارمتەکانی لای هەن بەربدات ، « معز الدولە بەڵێنی داو متمانەی دایێ . ئنجا «ابن ابوشەوك» وەفدەکەو ابو مخلدی بەرەلاَ کرد، پاش ئەم گڕوفڕە ئنجا « سوبوکتوکینی حاجب » کەوتەڕێ بەرەو حەلەوان بۆ سەرکوت‌کردنی کوردەکان‌و داگیر کردنی هەرێمەکە ، جا هەم حەلەوانی داگیر کرد وهەم چاری کوردەکان‌و « ابن ابوشەوکی » کردو گەڕایەوە ( تجارب الامم ٢/١٥٥ ) .

## « سەردارانو فەرمانڕەوایانی کورد لـەدینەومر هەرێمەکەدا » :
## ا ـ عەیشانیـە :

دەبـوو باسـی فـەرمانڕەوایی وسـەرداریی بنـە مالـەی « عەیشانیەی کورد » ی بـەرزینی بخرێتـە بـەرایی صـەدەی سێیەمی کوچییـەوە ، بـەلاَم لـەبەر ئـەوەی هیچیـەك لـە مێژونووسان باسێکی تایبەتی دوورو درێژیان بۆ جیانەکردوتەوە ، نەناسراو ماونەوە ، تـەنیا « ابـن الاثـیر » بـە هـۆی مردنـی « حەسـەنوەیهی »یەوە ناوی بردوون ، کە سالی ٣٦٩ك =٩٧٩زا مردووە ( الکامل٨/٧٠٥ ـ ٧٠٦ ) لـەبەر ئەوە هێنامانـە ئێرە کەبیکەینە پێشکەکیی باسی دەولەتی حەسەنوەیهیو تەنیاناوی پێنج کەس لەوبنەمالەیەمان دەسکەوتووە : « وەنداد »و «غانم» هەردویان کوڕی « ئەحـەد » بوون ، نزیکەی پـەنجا سـالێك خاوەنی دەسـەلاَتو سەرداری تیرەی « عەیشانیە » بوون کـە بەشێکە لە عێلی بەرزیی وئەم ناوچەیانەیان لە ژێر دەسابووە : « دینەومر ـ هەمەدان ـ نەهاوەند ـ صامغان و هەندێ ناوچەی تری‌وتا دەوروبەری ئاذەربایجان وتا سنوری شارەزور ، بـەم جۆرە سـەرۆكو فەرمانڕەواو وپێشداری چەند هەزارکـەسێ بوون . وەنداد سالی ٣٤٩ك مردووە کوڕەکەی جێی کرتوتەوە کەناوی « عبدالوهاب ابو الغنائم » بووە ، و « غانم » پاش ئەو بەسالێ ـ واتا سالی ٣٥٠ك ـ مردووە ، کوڕەکـەی کـەناوی « ابو سالم دەیسـەم » بوو لە جێی دانیشتووەو مەلبەندی قەلاَی « قەسنان » بووەو خاوەنی فەرمانو دەسەلاَتی خۆی بووە ، تا

« ابو الفتح کوڕی عمید » شاڵاوی کردۆته سەری و قەڵاکانی
« قەسنان »و « غانم ئاوا » ی داگیر کردووە ، بەڵام وەك
لەقسەکانی « ابن الاثیر » دەرئەکەوێ « حەسەنوەیهی » دوای
مردنی خالوکانی پەرەی بەدەسەڵاتی خۆی داوەو تیرەی
« شاذەنگانی » له « عبدالوهاب » هەڵگەڕاونەوەو بەدیل
گرتوویانەو هێناویانەته بەردەستی « حەسەنوەیهی » که هەمو
قەڵاو قوللەکانی ئەوی داگیر کردووە ، وادیارە « غانم »
جگه لەم « دەیسەمە » کوڕێکی تری « محمد » ناوی هەبووە
کەماوەیێ لەوەبەدووا « بدر کوڕی حەسەنوەیهی » هەندێ
هەرێمی سەربه « قوم »ی خستۆته ژێردەستی ، تا ئەوەتا سالی
٣٧٣ك = ٩٨٣زا ـ ئەم « محمد کوڕی غانم »ە کەبە نازناوی
بەرزیکانی ناسراوە لەناوچەی « کوردەر »ی سەربەقوم لـــە
« فخر الدولەی بوەیهی » یاخی بووەو ئازوقەو دەغڵودانی
سوڵطانی داگیر کردووە ولەقەڵای « هەفتجان »دا خۆی قایم
کردووەو بەرزیکانییەکانی لەدەوری خۆی کۆ کردۆتەوە، سپای
فخر الدوله مانگی شەوالی هەمان سالْ هەلی کوتاوەته سەری، بەلام
محمد سپاکەی شکاندووەو هێزەکانی ڕاوناوە ،بەلام فخر الدوله
جارێکی تریش سپایێکی له ڕەیەوە ناردۆتەوەسەری و هەم
شکستی پێداوە ئنجا فخر الدوله ناچار بووە هاواری ناردووە
بۆ «بدر» کەڕێکیان بخات ، بەدر کەوتوتە ناوبژی یانەو
ڕێکیانی خستووە ولەسەرەتای سالی ٣٧٤ك ئاشت بوونەوە ،
بەلام فخر الدوله لەپاشان نهێنی ڕانه لەپڕ هێزێکی ناردە

سەرمحمد، محمد گەرچی بۆ بەرانگاری ڕاپەڕی بەڵام لەشەڕا برینداربوو بەدیل گیررا وبەو برینەمرد ( الکامل ٨/٧٠٥ ـ ٧٠٧ ، ٩/٣١ ) ٠ بالێرەدا شتێ ڕوون بکەمەوە : لە تاریخ الدول والامارات الکردیەی محمد امین زەکی بەگدا لاپەرە ٨٩ بەهەڵە ( ونداودوغانم ) کراون بەبرای « حەسەنوەیهی »و لەڕاستی یاخالی ئەونوبرای دایکی ، جگەلەوەش « قەسنان »ی کردووە بە « کاسان » کەگۆیا نزیك بەباوە یادگارە ٠٠٠ هەروا دوکتور حسام‌الدین نەقشبەندی‌ش «صامغان»ی کردووەبە « زەمکان» ، من ئەوە بە هەڵە ئەزانم چونکە « مسعودی » لەکتێبی «التنبیه والاشراف » لاپەڕە ٥٢ ـ ٨٤ صامغان بەناوی‌ولایەتێ ناودەبا ، لەنێوانی شارەزورو ئاذەربایجان‌و هەمەدانا ، جامن لام‌وایە یەکێك‌بووە لەکۆنەشارەکانی کوردستانی ئەردەڵان ، تەنانەت مێژونولوسانی ئێرانی « زمکان » بە «ضەمکان = ضەیمەکان» ناوئەبەن کەسەر چاوەکەی لەگەهوارەی سەربەکرندەوە دێت‌وڕووئەکاتە کەرخە ( تحقیقات سرحدیه ١٠٨ و سیاحتنامەی چریکوف ١٥٥ ) ٠

لەم هەواڵانەی کەتۆمارمان کرد بۆمان دەرئەکەوێ کەهەندێ دەولەت گەرچی توانیویانە شارە کوردەکان وگوندەکانی سەر شارێ یەکان بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان ، بەڵام هەرگیز نەیانتوانیوە سەر بە خێلات وعێلاتی کوردی ناوچیاکان شۆڕبکەن‌و سەربەستی‌و ئازادی‌یان لێ دابڕن ٠٠٠

## ب ـ بنەماڵەی حەسەنوەیهیی کورد :

١ ـ حوسەین بەرزیکانی :بەهەشتی محمد امین زکی بەگ لەزمانی صەدەفی یەوە نووسیویە : حوسەین سالی ٣٣٠ك = ٩٤١ز ـ بناغەی دەوڵەتی حوسەینی یەی دامەزراند لەهەرێمی دینەوەرو شارەزوورا ( تاریخ الدول والامارات الکردیە ٣/٣٤ ) بەوەرگرتن لەکتێبی « دول الاسلام » هی « رزق اللە منقریوس صدفی ٤٢٩/١ » ٠ بەڵام من خۆم ئەم هەواڵەم نە لە « تجارب الامم» ونە لە طەبەری و نەلە الکامل دا دەس نە کەوت ، ئەوەشم هەرلەلا هەڵەیە کە لە چلەکانا بەوەرگرتن لەنامیلکەی « ئاورێکی پاشەوەی حوسەین حوزنی خ٠خ لاپەرە ( ٤ـ٥ ) لەپەراوێزی لاپەرە ٣٤ شەرەفنامەدا لەباسی دەوڵەتی حەسەنوەیهی دا نووسیومە : « ئەمیر حوسەینی بەرزینی سەرۆکی عێلەکانی شارەزوور کەپیاوێکی جوامێرو دلێر بووەو ناوبانگی ئازایی خۆی گەیاندووە بە خەلیفەی عباسی « المتقي باللە »و توانیویە ژمارەیێ شاروقەلاّ داگیربکاتو لەدینەوەرو شارەزوورا بناغەی دەوڵەتێ دابمەزرێنێو ترس بخاتە دلی خەلیفەی بەغداوە ٠٠٠ » چونکەمن خۆم لەهیچ سەرچاوەیێکا بەوچوارزبانەی کەشارەزام لەکتێبەکانی جێگە گومانا نەمدۆزیوەتەوە ، ئەشێ حوسەین حوزنی هەندێ سەرچاوەی کۆنی فارسیی دەس نووسی لەلا بوویێت ، جا بەباوەڕبە قسەکانی « صەدەفی » و « حوزنی » ئەبێ حوسەین بەرزینی لەپاڵ « ئەحمەد »ی خەزووریدا کە سەرۆکی عەیشانیە بووە،هێزی پێکەوەنابێو بناغەی سەردارێتی

دامەزراندبێت ، وەك نووسیمان کەبنەماڵەی عەیشانیە پەنجا ساڵی ڕەبەق خاوەن دەسەڵات بوون ، پاشان حەسەنوەیهی دەسەڵاتی وەرگرتۆتە دەس خۆی ـ ...

## ج ـ حەسەنوەیهی کوڕی حوسەینی بەرزیکانی :

بەرلەساڵی ٣٥٠ك = ٩٦١ز ناوی حەسەنوەیهی لەمێژودا بەرچاو ناکەوێ . گەرچی وادیارە سەرخێڵێکی گەورەبوو بێت بەڵام لە ٣٥٠ بەدواوە بەوەناسراوە کەقەڵاو دزەکانی لە « ئەمیرانی عەیشانیەی خاڵووانی » داگیرکردووە ، ولەساڵانی ٣٥٩ ـ ٦٠ داکەوڵاتی ئێران و عیراق کەوتۆتە ژێرچنگی « رکن الدولە »ی بوەیهی ، حەسەنوەیهی زۆر بەدەسەڵات بووەو هەرکات لەنێوان دەوڵەتی دەیلەمی و دەوڵەتی سامانی خوراسانیدا شەڕ ڕوویدابێ حەسەنوەیهی پشتی دەیلەمیەکانی گرتووەو خۆی سەر بەرکن الدولە داوەتە قەڵەم ، وپەرەشی داوە بەتەنینەوە وفرەوان کردنەوەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی ، جا سولطان روکن الدولە جگەلەوەی دەربەستی ئەوتەنینەوەیانە نەهاتووە پارێزگاری شارێ و شەقامەکانی ئەوناوەی هەر بەئەوسپاردووە .
تا ئەو کاتەی هەراو ناکۆکی لەنێوانی ئەوو « سهلان کوڕی مسافر »دا ڕوویداوە ، کە « سهلان » شاڵاوی کردۆتە سەری و جاری‌شەڕی لەگەڵی داوەو هەردوولا کەوتوونە شەڕەوە .
وحەسەنوەیهی بەسەر « سهلان »دا زاڵ بووەو ڕەتاندوویەوە شکستی پێداوە ...

بەهەشتی محمد علی عونی لە حاشیەی تاریخ الدول دا نووسیویە : ئەم ناوە « سهلان » نیە « مىلان »ەو داتاشراوی محمدەو مەبەست محمدی کوردی روادی خێوی طارم و شمێران و ئاذەربایجانە ، کەباپیرە گەورەی بنەماڵەی « بني مسافر »ە کەتوانیویانە لەئاذەربایجانا دەوڵەتانی سالاریەو ڕوادیەی کورد دابمەزرێنن ( حاشیە ۲ لاپەرە ۷۱ ) بەڵام احمدی کسروی نووسیویە : « سهلان کوڕی مسافری دەیلەمی یەو مىلان کوڕی ابو هیژا محمدکوڕی حسین کوڕی محمدە ( شەهریاران گنام ۱٦٤ – ٦۷ متن وحاشیە ) بەلی « سهلان » کە گومانی ئەم شەڕە سەختەی نەبوو ناچارکشایەوە وچووخۆی لە جێگەیێکا گرتەوە کەبحەسێتەوە ، بەڵام لەشکری کوردی بەرزینی گەمارۆیان دا رێی ڕاکردنو ئازوقەیان لێ بڕین ، ئنجا حەسەنوەیهی دوستووری دا بەسوارەکان هەر یەکە باوشێ چیلکەو هێزم بکات بە سەر ڕەمەکەیا ، سوارەکان ئەم کارەیان کرد بەبێ ئەوەی لەمەبەستی ئەو تێبگەن ، هەر کەتەواوەتی لە مکوکەیان نزیك بوونەوە ، فەرمانی دا چیلکەو هێزمەکان بەدەوری مکوکەیانا پەرتبکەنەوەو ئاگری تێبەردەن ، کەگڕ هەڵساو کاتیش هاوینو گەرم بوو ، لەو ناوەندی دووکەڵ و ئاگرا قانگیان خورد ، نزیك بوو هەمویان بخنکێن سهلانو هاوڕێکانی کەوتنە هاوارو ئەمان خواستن ، حەسەنوەیهی دڵی پێیان سووتاو لێیان گەرا ، پاشان هەمویانی بەدیل گرت ، کەئەم هەواڵە گەیشتە « رکن الدولة » بۆی

قوت‌ئادرا وناردی بەشوێن « ابو الفضل محمد کوڕی حسین عمید »دا کەوەزیری‌بووە،داوای لێکرد بڕوات بۆ سەرکوت‌کردنی حەسنەوەیهی ، وڕەگ‌وڕیشەی دەربهێنی ، « ابن العمید » خۆی ئامادەکردو جەنگاوەرانی ئازاو کارامەی هەلبژاردو بەچەك‌وئاقی جەنگی باش تەیاری‌کردنو بەرەو هەرێمەکانی ژێردەسی حەسنەوەیهی کەوتەڕێ ، خود رکن الدولە سپاکەی ناندو سەرکردەو فەرمانددەکانی خەلات کردو چەك‌وتفاقەکانیانی پەسەندکرد ، « ابن العمید » خۆی و « ابو الفتح »ی کوڕیو سپاکە جمان ، ابو الفتح کوڕێ‌بوو فۆزو خۆپەسەندو لەخۆبایی وسەرکێش‌و خۆتێهەلقوتێن لەبەر ئەوە ابن العمیدی باوکی لە یکەو مەکەی زۆربێزاربوو، هەموجار ئەیوت : ئەم کوڕە ئەبێتە هۆی تیاچونی بنەماڵەی عمید وڕیشە دەرهاتنی ئەم‌خێزانە ... گەلاڵەی قسە سپا کەوتەڕێ تا گەیشتە هەمەدان ، « ابن العمید » کەلەوەبەر نەخۆشی باداریی ( نقرس ) هەبوو گەلێ نەخوشی تریش سەری‌لێی هەلدابوو ، داخی ئەم‌کوڕەشی هاتبوەسەر ولێی کەسیرەبوو ڕۆژی ٥ صەفەر / ٣٦٠ك لە هەمەدان مرد ، « ابو الفتح » لەجێی بابی بووبە سەردارسپا ونامەی‌بۆ « حەسنەوەیهی » نووسی‌و : داوای بڕینەوەی شەڕەکەی بەئاشتی وڕێك کەوتن‌کرد ، ناوبژی‌کەران کەوتنە نێوان ، لەسەرئەوە پێك هاتن کە حەسنەوەیهی پەنجا هەزار دیناریان بداتێ ئنجا « ابو الفتح » باج‌و پێتاکی ئەوناوەی کۆکردەوەو ئاژاڵ‌و چارەوایێکی زۆری بەتالان‌برد : کە بابی

صەتهەزار دینار پتربوو ئنجا گەڕایەوە بەرەو « ڕەی » (تجارب الامم ٣/٢٧٠ والکامل ٨/٦٠٥ - ٦٠٦ )

لەسەرەتای سالی ٣٦٦ك = ٩٧٦زادا « رکن الدولە »ی بوەیهی هەستی بە نزیکی مەرگ کردبوو ، « ابو الفتح »ی وەزیری مێوانی‌یەکی زۆر گەورەی ڕێکخستو سلطان وکوڕەکانیو هەمو فەرمانەدەکانی بانگ کردە مێوانی ، کەلەنان خواردن بوونەوە رکن الدولە خۆی لەسلطانێتی خستوکناری گرتو عضد الدولەی کوڕی کرد بە جێنشینی خۆی ، وداوای لێکردن هەمویان فەرمانبەردارو پەیڕەوی‌بن ، ئنجا هەرێمی هەمەدانو هەمو چیای دابە « نخر الدولە »ی کوڕیو داوای‌لێکرد : کەسەر بۆعضدالدولەی برای شۆڕبکات ، ئەصفەهانیشی دابە « مؤید الدولەی کوڕی‌دووەمینی » وداوای لەئەویش کرد کە سەر بوبراکەی دانەوێنێ ، پاش‌ئەوە زوری نەبرد مرد ، زۆر سەیرە کەابن‌الجوزی ئەم‌باسەی خستۆتە سالی ٣٦٥ك ( الکامل ٨/٦٦٩ ، مجمل التواریخ ٣٩٣ ، المنتظم ٧/٢٨٠ ) مؤید الدولە پاش مردنی باوکی چوو لە ( ڕەی ) دانیشتو «صاحب‌بن‌عباد»ی کردەوەزیری خۆی ، فخر الدولەش چووە هەمەدان ئەم کارانە هەمو لەسەردەمی خەلیفەی عباسی « الطائع للە‌دا ڕوویدا »

سالی ٣٦٧ك = ٩٧٧زا فخر الدولە لە هەمە دانەوە ڕووی‌کردە دینەوەر حەسەنوەیهی کوڕی‌حوسەینی بەرزیکانی خێوی هەرێمی چیاو ماهەسەبەزان لە قەلای « سەرماژ » دابوو

( مجمل التواريخ به هەلە نووسيويە مرد ) كورەكانى « ابــو علاءو ئەبو عەدنان هاتنە پێشوازى فخرالدەولە ،جا فەخرالدەولە زۆرى رێنر لێنانو شكـۆى پــێدان هــەر ئەم سالــەدا بو كە عضدالدەولە بڕيارى دابو روبكاتە عيراق چونكە بيستبوى كـە عزالدەولە بەختيارى ئامۆزاى‌و ئيبن‌بقيەى وەزيرى خەريكــن سەرانى ولاتى لێ هەلئەگێڕنەوەو ڕايان‌ئەكێشن بەلاى خۆيانا ، كە مەبەست ئەمانەبو : فخرالدەولەى‌براى ، حەسەن‌وەيهى‌كورد، ئەبوتەغلەبى حەمدانى‌و عمران كوڕى شاهين‌و هى ترى جادەبو بەختيار بەرەوخوارەوە بێ بۆ واسط بۆئەوەى ئاگرى شـۆرش هەلبگيرسێنێ دژى عضدالدەولە حەسەنوەيهى‌ش بەلێنى‌دابو كـە خۆى ئامادەى كۆمەك‌و يارمەتى بێت ئەبوتەغلـەبى حەمـدانيش گفتــى دابويــێ بەلام لەئەنجـاما هيــچ كاميـــان بەلێنيان بەجێ نەهێنا . پاش ئەو بەختيار بەهانەهانەى ابن بقيـە ڕووى كردە ئەهواز ، عضد الدولە كەبەم هەوالەى زانى لـــە فارسەوە ڕووى تێكردن‌و لەمانگى ذى القعدەدا تەقين بەيەكاو ، كەوتنە شەڕەوە كوشتارێكى زۆريـان لەيەكتركـرد ، هەنـدێ لەسپاكەى بەختيار لێى هەلگەڕانەوە وخۆيان دايە پال عضـــد الدولە ... گەلالەى قسە « ابن بقيە »ش خەريك بوو نەێنى‌برى لـەبەختيار بكـاتوڕابكـات بۆلاى عضد الـدولـە ، بـەختيار كـەبەوەى زانى ويستى لـەگەل عضد الدولـە بـەئاشتى ڕێك بكـەوێ ، بـەلام هاوسوێن‌و دۆستـەكانى ڕێيان‌نـەدا ، دوان لەكوڕەكانى حەسەنوەيهى (عبدالرزاق وبدر) بە هەزار سوارەوە

چوونه هۆواریەوە .. زۆری نەبرد بەختیار بڕیاری دا کە بچێتە بەغدا ، ئنجا کوڕەکانی حەسەنوەیهی بە هێـزە سوارەکەیانـەوە گەرانـەوە لای باوکیان ( الکامل ٦٧١/٨ - ٦٧٣ ) بـەهەشتی محمد امین زکی بەك لە زمانی ( خ.خ ) حوسەین حوزنی‌یـەوە نووسیویە : معز الدوله بەختیار لەموصلەوە « ینالکوشـە »ی بـەڕێ خـست بـەرەو شـارەزوور بۆ داگیر کردنی ، بـەلام حەسەنوەیهی لە خۆرئاوای هەولێرا ڕێی گرت‌و کوشـتاریکی زۆری لـەسپاکەی کرد .. تاد . هـەروا نووسیویـە : سـالی ٣٥٦ك = لە نێوانی عز الدوله بەختیاری کوڕی معز الدولـەو حەسەنوەیهی دا شەڕێکی زۆر قورس ڕوویدا ... تاد ، ئەم دوو هەواڵە نەلە تجارب الامم‌و نەلە مجمل التواریخ ونەلەطبری ونەلە الکامل دانیە ، وادیارە حوسەین حوزنی ( خ.خ ) لـــە مێژوویێکی کۆنی فاسی ، یالـەکتێبی خۆرهەلاتناسـەکان وەری گرتووە ، چونکە لەمێژووەکانا کە لەبەردەسماتا هەیە هەرگیـز باسی ئەوەنەکراوە کە حەسـەنوەیهی شارەزووری خستبێتـە ژێر ڕکێفی خۆیـەوە یاسنووری قـەلەمڕەوی ئەوەندە تـەنیبێتەوەو بەربلاوبوویێت ، ئەم‌پەرەپێدانە لەسەردەمی « بەدر » دابووە ..

سالی ٣٦٩ك = ٩٧٩ز‌ا عضد الدولەی بوەیهی ڕووی کردە هەرێمی چیا بۆ داگیر کردنی ئەو هەرێمانەی لە ژێر دەستـــی فەخرالدەولەی برایا بووە ( بێ گومان ئەمە لەسەر ئەوەبووە کە حەسەنوەیهی یاریدەی بەختیـاری داوە ) جا کـە لـە بەغـداو ،

کەونەڕێ نامەی بۆهەمو سەردارەکان نووسی ... پاشان مۆژدەی بۆهات کە ئەوسپایەی لەبەرا ناردبوی هەمەدانی گرتووەو فەرماندەکانی فخر الدولە ویارانی حەسەنوەیهی هەمویان دەخالەتیان کردووەو ئەمانیان ویستووە و خۆیانداوە بەدەستەوە ... پاش ئەوە « عضد الدولە خۆی شالاوی کردە سەر هەرێمەکانی ژێر دەستی حەسەنوەیهی کەلەم حەلانەدا (۳ ربیع الاول ۳۶۹ك) کۆچی دوایی کردبوو .. جا عضد الدولە لەسەرەتادا ڕووی کردە نەهاوەند پاشان شالاوی کردە سەر دینەوەرو قەلای سەرماژ ، هەرچی سامانو بنەوبارگەو ئازوقەی تیدابوو هەموی ڕامالی ـ کەهێندە زۆربوو لە ژمارە نەدەهات ـ هەروا ژمارەیێکی زۆریشی لەقەلاو دژەکانی داگیرکرد ، بەلام لە خۆشیدا گەشکاوی بوو تووشی « فێ »هات ، گویا ئەم نەخۆشیەی لە موصل گرتبوو ، پاش ئەم سەرکەوتنە کوڕەکانی حەسەنوەیهی خۆیان دایە دەستەوەو هاتنە بەردەستی کەئەم کوڕانەبوون : عبدالرزاق ـ ابو علاء ـ ابو عدنان ـ جا دەستگیری کردنو خستنیە زیندان بەلام « بدر »ی خەلات کردو داینا بەسەرۆکی کوردەکان ( الکامل ۷۰۷/۸ ـ ۷۰۸ بەوەرگرتن لە تجارب الامم ) حەسەنوەیهی پیاوێبوو خاوەن بەخت ، ڕەوشت جوان ، لەڕامیاریدا سەرکەوتوو ئاگاداری کاروباری ولات ، دوژمنی درۆزنو ساختەچی بەڕادەیێ کەتوانیبوی ئەمخووە پیسانەش لە ولاتەکەیا قەدەغە بکاتو خێرەومەندو

لەخواترس‌بوو - لەدینەوەرا لەمەڕمەڕی سپی‌سادەمزگەوتێکی دوروست کردبوو ، هەروا قەلاێتکیشی بەناوی « سەرماژ » دوروست کردبوو ، تامردنیشی سالانە خێروبێری زۆری‌بۆ « حرمین شریفین » دەنارد .. پاش‌مردنی کوڕەکانی لەناو خۆیانا تێکچوون : هەندێکیان خۆیان دایە پاڵ فخر الدولەو هەندێکیانیش خۆیان دایەپاڵ « عضد الدولە » ئەمەش ناوی کوڕەکانێتی : ابو علاء ، عبدالرزاق ، ابو النجم بدر ، عاصم ، ابو عدنان ، بەختیار ، وعبدالملك .. بەختیاریان کەخۆی لەقەلای « سەرماژ »دا قایم کردبوو پەیامی دۆستایێتی‌و دلپاکی ناردبۆ « عضد الدولە » وخۆی بەدلسۆزی دایەقەلەم ، بەلام پاشان کە دەرکەوت دووڕووە ، « عضد الدولە » ناردی قەلاکەی خۆی‌و هی‌براکانی هەمو داگیرکرد ، تەنیا « ابو النجم بدر » ی‌تەرخان کردو هێزی خستە ژێردەستی‌و ئەوهەرێمانەی پێ داگیرکرد ( الکامل ٨/٧٠٥ - ٧٠٦ ) بالێرەدا ئەوە ڕوون بکەمەوە : گەرچی شاری دینەوەرو مزگەوتەکەی ئێستە لە ناوا نەماوە ، بەلام تا ئەمڕۆ ( ١٩٩١زا ) دیواری قەلای « سەرماژ » هەرماوەو لەناوچەی « هەرسین »دایە بە سەر بەرزاییێکەوەیە نزیك بەشارێتی کرماشان - هەمەدان ، وبەناوی « سەرماژ » گوندێکیش لەو نزیکانە دوروست کراوە .. وادیارە دەوروبەری دیواری قەلاکە بەئایەتی قورئان کەلەسەر

تەختە مەرمەڕ هەڵکەندراوە ڕازاوەبوو ، تائیستا پارچەبەردی ئایەت لەسەر نووسراو لەهەندێ ماڵیی خەڵکی گوندی « سەرماژ » پارێزراوە ( کرمانشاهان باستان لاپەرە ٧٢ ـ ٧٣ )

**د ـ ابو النجم بدر کوڕی حەسەنوەیهی کوڕی حوسەین بەرزیکانی:**

ئاگامان لەژیانی دەورانی منداڵیی ودەوری گەنجێتی بەدر نیە ، تەنیا ئەوەندە ئەزانین کەباوکی ئەوو عبدالرزاقی برایی بەهەزارسوارەوە ناردووە بۆ هاواری « عز الدوله بەختیاری کوڕی معز الدوله » ... د

کە حەسەنوەیهی سالی ( ٣٦٩ = ٩٧٩زا ) مردو عضد الدوله ولاتە کانی ژێردەستی ئەوی داگیر کرد ، لەنێوان کوڕانی حەسەنوەیهی دا «بەدری» دانا بەسەکاریی کاروباری کوردەکانو خەلاتو بەراتی داین ، عاصم وعبدالملکی برای بەغالەتیان پێ بردو ولێیاخی بوون ، عاصم دلی کوردە ناراضی‌یەکانی بەلای خۆیا ڕاکیشاو هەموی لەدەوری خۆیکو کردەوە، عضد الدوله کەبەم حالەی زانی هێزێکی بەڕێ خست بۆ سەرکوت کردنیان ، کە هێزەکە پەلاماری دان دەستەو دایەرەکەی هەمو هەلاتنو خود « عاصم » بەدیل گیرا وبۆکەتن سواری حوشترێك کراو تێرابۆ هەمەدان ئیتر هەواڵی نەزانرا، کوڕەکانی تر هەمویان کوژران .. وادیارە بەدر لەسەردەمی «عضد الدولە» دا خۆی لەشەڕو هەرا لاداوە

وبەقەڵەمڕەوی خۆی ڕازیبووە، پاش مردنی « عضـد الدولە » ( ٣٧٢ك = ٩٨٢زا )و هاتە سەرتەختی شـرف الدولـەی کـوڕی ( ٣٧٧ك = ٩٨٧زا ) نێوانی بدر وشرف تێکچووە ، شرف لەوە ڕقی هەستاوە کەزانیویە بدر خۆشی ناوێو لایـەنگری فخـر الدولەی مامێتی جا کەچووە سەرتەختی پادشایێتی ( قراتکیـــن جەشیاری ) سەردارسپای خۆیی بانگ کردو شیرو کەمەری زێرو خەڵاتی داێیو داوای لێکرد : شاڵاو بکاتە سەر « بەدر » لایوابـوو بـەم کارە یەکێلەدووسـوودی دەس ئەکـەوی : سەرکەوتن بەسەر بدرا ، ئەگەر سەرنەکەوتو شکستی خوارد، لەسەردارێتی سپا لائەچێ ، قەراتکـین هەڵی کوتایـە ســـەر بدر ئەویش بەسپای خۆیەوە ئامادەبوو کە بەرانگاریی بکـاتو لەگەڵی بکەوێتە شەڕەوە ، جا لـە چـەمی قرمیسین ( شـیوی کرماشان ) تەقین بەیەکا ، کـەشەڕ گـەرمبوو بـەدر خۆی بـە هەڵاتوو نیشانداو خۆی شـاردەوە ؛ قـەراتکینو یارانی لایان وابـوو کەهـەڵاتووە ، ئیتر سپابـەزیان کـرد بۆحـەسانەوەو بەناوخێوەتو خەرگاکانی خۆیانا بڵاوەیان لێکرد ، بەڵام ساتێکی نـەبرد بەدر وەك ئاگریسـوور لێیان هـەڵگـەڕایەوەو هـەڵی کوتایەناویانو کەوتەکوشتاریان ، هەموبنەو بارگەیـانی تـاڵان کرد ، هەموچەكوتفاقیانی داگیرکرد ، قەراتکین خۆی وچەند کەسێ لە کوێلەکانی بەگیانـەلاَ خۆیان دەربازکرد وتا « پردی نەهرەوان » بەئیلغار خۆیان ڕزگارکرد ، ئینجا لەوێوە بـەرەو

بەغدا گەڕانەوە ( الكامل ٩/٥٢ ، تحفه الوزراء ذيل تجارب الامم ٣/١٣٩ ) •

سالی ٣٧٩ك = ٩٨٩ز شرف الدوله مرد صاحب کوڕی عباد که وەزیری فخر الدوله بوو هانی فخریدا کەشالاو بکاته بەغدا . جابەقسەی ئەوقایلبوو بڕیاری شالاو کردنی داو لەشاری ( ڕەی )ەوە کەوتە ڕێ بەرەو هەمەدان ، لەوێ « بەدری حەسەنوەیهی و عفیفی اسدی هاتنە پیری یەوە وبڕیاردراکە « صاحبو بدر هەردوو بەشەقامەڕێ دا بەرەوخوارەوەبین بۆ بەغدا ، فخر الدوله خۆیشی بەسپاوە لەڕێی ئەهوازەوە رووبکاتە بەغدا ( ذيل ٣/١٦٤ ) •

هەر لەم سالەدا فخر الدوله هەوالی بیست که سپای بهاء الدوله نزیکی دەوروبەری خوزستان بووەتەوە ، جا سپای نارد بۆ بەرانگاریی ، سپاکه بەم جۆرە پێك هاتبوو : کوڕەکەی حەسەنی لالەی ، شەهفیروزی کوڕی حەسەنو ، هی تری بەسێ‌هەزار دەیلەمی یەوە ، « بدر کوڕی حەسەنوەیهی » ش بەچوار هەزار کەس لە جەنگاوەرانی کوردەوەو « دبیس کوڕی عفیف »یش بەهێزی خۆیەوە بەڕێ کەوتن بۆ بەرانگاری ••• بەلام سەرئەنجام یارانی « فخر الدوله » لەشەڕەکەدا شکستیان خواردو هەلاتن‌و « بدر » کاروباری خوزستانی خستەژێردەستی خۆیەوە ( تجارب الامم ١٦٤ وتاريخ يمينى ٨١ ) سالی ٣٨٠ك = ٩٩٠ز فخر الدوله رووی‌کردە ئەهوازو گەرایەوەو گەیشتە قصر اللصوص ( کەنگەوەر ) لەوێ « صاحب کوڕی عباد »ی

وەزیری داوای ماوای کـرد ورِوخصـەتی دایێ وچوو بـەرەو ئەصفەهان ، کە گەیشتە کـەرەج بدرچـوو بـۆ سـەردانیو بەرلەخۆی « ابو عیسا شادی » زاوایی نارد بوو ، کـەبیگاتێ لەویّ دوستایێتیو پەیمانیان تازەکردەوە ، کەگەرِایەوە هەمەدان لەسەر دا خوازی ابو عیسا شادی زاوای کچێکی خویّی دابـە « ابو طالب مجد الدوله رِۆستەمی کورِی فەخر الدوله » ( مجمل التواریخ ۳۹٦ ) .

سـالی ۳۸٦ك = بدرکـورِی حـەسـەنوِیھی لـەگـەل پیاوماقولآنی کاروانی حەجی خوراسان دا پێنج هەزار دیناری نارد بۆ « حرمین شریفین » کە صەرف بکرێت بۆ پارێزگارییو پاسەوانێتی رِێگاکان ، لەباتی ئەو باجو پیتاكو سـەرانەیانـەی کەسالآنە لە حاجی یەکان وەرئەگیرا ، « بدر » سالآنـە ئـەم خێرەی زیاد ئەکرد تا رِادەکەی سالآنە گەیاندە نۆهەزاردینار ، جگە لەوەش پارەی تری تـەرخان کردبوو بۆچاك کردنـەوەی رِیگەوبانو خاس کردنەوەی پرد هەروا بۆئەوەی بەسەر خێزانو بنەمالەکانی « مهاجرین وانصـار » لـەولآتی حرمـین دابـەش بکرێت ، هەروا بەسەر قورئانخوێنو بنـەماڵە خانەدانـەکانی شـاری مـەدینـەدا کەئـەم سامانـە سـالآنـە خۆی ئـەدا لەبیستهەزاردینار ، وتا « بدر » خۆی لەژیانابوو هەمو ساڵ ئەمخێرە ئەنێررا بۆ حجاز ، کە « بدر » کوژرا ئەم خێرو بێرە ئیتر نەموو ، نالەباریيەکـی زۆر کەوتـەناو ئـەو خێزانانـەی کەبەوەئەژیان ، هەروا پاش مردنی ئەو ، کاروباری بـۆ ولآتـی

حجاز چوون به نیازی حەج تەگەرەیێکی زۆری تێکەوت ( ذیل تجارب الامم ٣/٢٨٧ ) .

سالی ٣٨٨ك = ٩٩٨ز ا بهاء الدوله ڕوی کردە « واسط »و لەوناوە لەگەل سەردارسپای بەغدا « ابو علی کوڕی استاذ هرمز »دا لێیان بوو بەشەر «بهاء الدوله» تەنگەتاوکراو ئازوقەی لێبڕا ، زوو هاواری نارد بۆ « بدر » کە بەفریایا بگات ، ئەویش زووبەفریایا گەیشت و ئازوقەی گەیاندە دەنگیا (الکامل ٩/١٤١)

سالی ٣٨٨ك « بدر » بەر بەرەکەتی خەلیفەی عباسی کەوت کە « القادر بالله » بوو ، هەم پایەی لەلای بەرزەوە بو ، هەم نازناوی « ناصرالدین والدوله »ی داتی ( الکامل ٩/١٤٤ ) .

سالی ٣٨٩ك = ٩٩٩ز ا ابو القاسم وابو النصر کوڕانی عز الدوله بختیار لەیەکێك لەقەلایانی فارس‌دا زیندانی بوون . کۆمەلێ لەکوردانی خوسرەوی بۆ هەلگیرساندنی ئاگری ئاژاوەو شەڕو شۆڕ چوون لەقەلای زندان دەریانهێنان ، جا «صمصام الدوله » چووە سەرکوت کردنیان وچەند شەڕ لەنیوانیانا قەوما ولەیەکێ لەشەڕە کانا صمصام کوژرا ئنجا خود بهاء الدوله لەگەلیان کەوتە شەڕەوەو هەموویانی تارومارکردو ، لەولاتەکەی خۆی دەری‌کردن‌و سالار بەختیاری سەرۆکی عێلی خوسرەوی لەشەڕا کوژرا ، ئنجا ابو القاسم وابو النصر کەصمصام یان کوشتبوو لەترسی بهاء الدوله هەلاتن بۆلای بدرو خۆیان دایە پەنای ئەو ( تاریخ یمینی تەرجمەی فارسی ٣٠٧ الکامل ٩/ ١٥١ ) .

سالی ۳۹۳ك = ۱۰۰۲ز لەبەغدا ئاژاوەیێ کەوتەوە ، دەستەی عەیاران وئاژاوە گێران بەشارا بلاوبوونەوە ، بهاء الدولە بۆ سەرکوت کردنیان سەردار سپاکەی خۆی « ابو علی استاذ هرمزی » خستەرێ بەرەوعراق « الکامل ۹/۱۷۸ »

هەر لەم سالەدا ابو العباس الضبی وزیری مجد الدولە کوڕی فخر الدولە لە « ڕەی »ەوەهەلات وپەنای هێنایە لای بدر ئنجا لەجێی ئەو « خەطیر ابو علی » کرابەوزیر ( الکامل ۹/ ۱۷۸ ) .

سالی ۳۹۷ك = ۱۰۰٦ز ابو الفتح کوڕی عیار ( عناز ) کەسەر بەبدر وفەرمانبەری ئەوبوو ، کەوتە بەر ڕق و کینەی بدر . ابو الفتح هەلات خۆی دایە پاڵ « ڕافع کوڕی محمد کوڕی مقن » ، بدر پەیامی بۆناردو باسی دۆستایێتی باوباپیرانی خستەوەیادی وگلەیی زۆری لێکرد لەسەر ئەوەی کە ابو الفتح عیاری دوژمنی ئەوی پەناداوەو داوای لێکرد لەخۆی دووری خاتەوە ، بەلام رافع گوێی نەدایە پەیامەکە ، بدر لەرافع کەوتەرق و لەشکرێکی ناردە سەری کەئەوجەلە ئەو لەلای خۆرهەلاتی دەجلەوە بەزی بو ، تالانیان کرد ، ئنجا چوون لە « مطیرە »ش مالەکەیان تالانکردو ئاگریان تێبەرداو پاشسووتاندن ڕوویان کردە قەلای « بەردان »و داگیریانکردو هەرچی تیابوو بردیانو چالاوەکانیشیان پڕ کردەوە ، ابو الفتح کوڕی عیار هەلات بەرەوبەغدا وپەنای بردە بەر عمید الجیوش

( واتا سەردار سپاھ ) کە زۆربەگەرمی خێراتی کردو خەڵاتی داین ( الکامل ٩/٩١٩٩٤٩ ) •

( مطیره : گوندێ بووه سەر بەسامەراء ، وبەردان جێگەیێ بووه نزیك به مدینه السلام ، پردێکی بە ناوبانگی هەبوودێ بەشاری شەراب ناسراوه « معجم ما استعجم » ١/٢٤٠ دکتور حسام لەگوڤاری نەوروزا ژماره ٩/ ساڵی ١٩٨٩ نووسیبوی بردان شارێکی ئاوا بووه نزیك بە « صریفین » ده کیلومەتر لەباشوری راشدیەوه وادیاره ناوەکەله « برده »ی فارسیەوه هاتووه کە دەکات کوێلەو بەندەی زەرخرید ، بەلام وادیاره کاك حسام لەبیری چووه کە جمعی « برده » ئەبێتە بردات نەوەك بردان ، وخۆیشی لەوه دوور خستۆتەوە کەبلێ کوردیەو عربیەکەی ئەبێتە ( الحزن ـ الحصوه ) •

جا ئەم هەواڵەی رابورد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ( بدر )نەوەك هەر لەبەشی چیادا بەدەسەڵات بووە ، بەڵکو لەیێ دەشتەکانی دیالەو بەغداشا هەر قەڵەمرەوی دەسەڵاتی تەنیوەتەوه ••

هەر لەساڵی ٣٩٧ك = ١٠٠٦زا دا کۆنە عمید الجیوش ( سەردار سپاھ )ی دەرکراو « ابو جعفر حجاج » کومەڵێکی زۆری رێکخستو « بدر»یش لەشکرێکی بۆنارد ، بەم هێزانەوه شاڵاوی کرده سەربەغداو گەمارۆیدا ، هۆی ئەم کارەی ئەوەبوو کە سەردارسپای تازەی لەجێی ئەودانیشتوو

پاراستنی شارێپی خوراسان - خانەقینی خستبووە ئەستۆی ( ابو الفتح کوڕی عیار ) کە لەو حەلەدا لە «بدر» هەلگەڕابووە، جا بدر « ابـو جعفر حـەجاج »ی بانگ کردبووە لای خۆی‌و هێزێکی زۆری بەسەرداریی « هند کوڕی سعدو ابو عیسا شادی زاوای‌و وڕامی‌کوڕی محمد جاوانی‌و چەندکـەسی تری ئامـادە کردبوو بەرێێ خستبوون بـەرەو بەغدا ، ... ئەمانـە مانگێکی تەواو بەغدایان گەمارۆداو بەلأم‌بۆیان نـەگیرا چونکـە سپـای تورك کـەلە بەغدابوون بەرابـەری ابـو الفتح کـوڕی عیار شارەکەیان پاراسـت ... تاد ( الکامل ٩/١٩٢ - ١٩٣ ) هـەر لەم سالەدا « ابو العباس کوڕی واصل » کوژرا ، هۆی کوژرانی ئەمـەبوو : کە فەرمانـدەی بەصـرە بووبوو دەسـەلأتی خـۆی پەرە پێ‌دابوو تا «بطیحەو» داگیری کردبوو ، بهاء الدولە ترسی لێ‌نیشتبوو کـە نەبادا هەلکوێتـە سەر خوزسـتان‌و داگیری بکات ، لەگەلی کەوتەشەڕەوەو ابو العباس شکستی خواردبوو هەلأتبوو ، جاویستی بەدزی‌یەوە خۆی بگەێێتە هەرێمی چیاو پەنابیاتە لای بەدر کە گەیشتە خانـەقین چـووە لای حەعفـــەر عەوام »ی فەرمانڕەوای خانەقین کەسەر بەبەدربوو ویستی لەوێ بحەسێتەوە ، لەو کاتەدا ابو الفتـح کوڕی عیار کـە فەرمانبەری بهاء الدولە بوو گەیی بووە ئەو نزیکانەو بەهاتنی ئەوی زانیبوو، لەناکاوا هەلی کوتابووە ناوخانەقی وابو العباسی بەدیل گرتبوو وناردبووی بۆسەردارسپاهـ .. ئـەویش ناردبووی بۆ « بهاء الدولە » ، بەلأم لەڕێ پەیکی بهاء الدولە پیا گەیشتبوو هـەر

لەوێ فەرمانی بەکوشتنی دابوو ۰ جا ۱۰صفر کوژراو سەرەکەی
نێردرا بۆ بهاء الدوله ، پاش کوژرانی ئەمواصله ئنجا بهاء الدوله
کەوتە کنە کردن بـۆ کوشتنـی بـەدر ، جـا ساماتێکـی زۆری
خستـەژێر دەستی سـەردار سـپاهـو خستیـە ڕێ بـۆداگیر
کردنی ولاتـەکانی ژێر دستی « بـەدر » ، سپا جماو گەیشتـــە
« گوندی ساپور ، بەدر نامەیێکی بەمجۆرەی بۆسەردار سپاه
نووسی : ۰۰ تۆ دەسەلاتی ئەومت نەبوو ئەو هەرێمو شارانـە
وەرگریەوە کە « بني عقيل » لێیان داگیر کردی ، کەلەوێوە تا
بەغدا تەنیا دە فەرسەنگ ڕێیە ناچاربووی لـە گـەلیان ڕێك
بکەوێ !! ئەی چۆن ئـەتوانی شـالاو بکەیە سـەر ولاتی منو
هەولی داگیرکردنی قەلاو دژەگانی منبدەی ، کەلەتۆ سامانو
گەنجینەم پترە ؟! ئەوەی‌من هەمە تۆنیتە ؟! باباش بۆت ڕوون
بکەمەوە وپیت‌بلێم : منوتۆ دوو ڕێمان لە بە رایـە : (أ) شـەڕ
کەسەرئەنجامی ڕوونـنیە ، وناژانرێ کـام لا سـەر ئەکـەوێ ؟
ئەگەر ئێوە سەرکەوتنو منشکـستم خوارد ئەوەپەنا ئەبەمەبەر
قـەلاو کۆنگـەرەکانی ناوچیای ژێردەستمو سـوودێکت دەس
ناکەوێ ، ئەگەر دەسەلاتم نەما ئەکەومە ئەم دەشتـی خوایـــە
وهەرجارە لە لایێکەوە ، شالاوتان بۆدێنمو دنیاتان لێ ئەکەمـە
چەرمی چۆلەکە ، ئەگەر تۆشکایو سـەرنەکـەوتی ئـەوا لای
گەورەکەت شەرمەزاروڕسوا دەبیت (ب) ئاشتی : کەوابێ ئەوا
هەنێ پارەو پولت بۆدەنێرم بیبەبۆ گەورەکەتو خۆتی لێ‌ڕزگار
بکە ( الكامل ۹/۱۹۵ ـ ۱۹٦ ، وروضة الصفا ٤/۵۲ ) ۰

هەرلەم ساڵەدا «سیدەخاتونی ژنی فخرالدولە» کەخۆی پادشایی‌و
سەرکاریی وڵاتی « ڕەی » وهــەرێمی چیای گرتبووە ئەستۆ
« مجد الدولە »ی کوڕی هەربەناو پادشاھ بوو ، لەنیوان خۆیانا
تێك چووبوون وناخۆشی کەوتبووە بـەینیان : هۆی تێکچوون
ئەوەبوو : « خطیر ابو علي » بووبوو بەوزیری مجد الدولـەو
کاروفەرمانی هەمو وەرگرتبووە دەستخوی‌و «سەیدە خاتوونی»
خستبووە ژێر چاودێری ، « سەیدە » ئەمەی بۆ قووت نەئەدرا،
بەدزی‌یەوە شاری « ڕەی »ی بەجێ هێشت‌و چوو لە قەڵاکەدا
خۆی قایم کردو قەڵاوانی داناو وخۆی بەدزی‌یەوە چوو بۆلای
«بەدر» کە ئەوحەلە بارەگای فەرمانڕەوایە کەی لە «خوزستان»
بوو ، بۆ داوای یاریدەو کۆمەك ، بەدر خۆی‌و گەورە پیاوانی
وڵات پێشوازی‌یان لێ‌کرد ، پاش حەسانەوەی، «بەدر» ابو عیسا
شادی » بەسپاوە خستەڕێ‌بۆ هەمەدان ، ئنجا خۆشی بـەدوایا
کەوتەڕێ لەوێ سپاکەی « شمس الدەولەی کوڕی فخر الدولە»ی
برای « مجد الدولـە »و کوڕی خود سـەیدەخاتونی لـەگەڵ
سپاکەی خۆی نارد ، شاری «ڕەی» یان گـەمارۆداو شەڕێکـی
زۆرتونو تیژیان کردو شارەکەیان داگیر کردو مجد الدولە شیان
بەدیل گرت‌و دایانە دەست « سەیدەخاتون » جا ئـەم دایکـــە
دوستوری دا زنجیرو پاڵەهەنگیان کردو خستیانە زیندانو «شمس
الدولە » لە جێی ئەوکرا بەفەرمانڕەوای ژێر دەستی « سـیدە
خاتوون‌و » ابو بکر رافع یش‌دانرا بەوەزیر کـەلەوەبەر بـەکێ
بووله نوکەران و پیاوانی بـەدر ، ئنجا بـەدر ماڵئاوایی لـــە

سەیدە خاتون کردو گەڕایەوە بۆ خوزستان پاش ماوەیی ئنجا «سەیدە خاتون» لەگەڵ شمس الدولەی کوڕی تێکی داو ناردی «مجد الدولە»ی کوڕی لەبەندیخانە دەرهێناو کردیە فەرمانڕەواو شمس الدولە گەڕایەوە بۆ هەمەدانو وهاواری نارد بـۆ بـەدر ئەم جارەزۆر نیگەران بوو لەحاست ئـەم نالەباریـەداو هێزێکی نارد بۆیاریەی‌و خۆی نەچوو ، چونکە لـەم کاتەدا لـەگەڵ هلال ( هليل )ی کوڕی تێکچووبوو بـەدەردی‌خۆیەوە خـەریك‌بوو . وەك لەمەودواباسی ئەکەین ( مجمل التواريخ ٣٩٨ والكامل ٩/ ٢٠٣ - ٢٠٤ ) .

سالی ٣٩٨ك = ١٠٠٧زا لە ( بەغدا - واسـط - کوفـە - بطائح تاتابەدان بەفرێکی یەك‌گەزی باری کەتابیست ڕۆژی تەواو هەمو ڕێگەکانی بەست هەر لەو سالەدا بوومە لەرزە یێکی تونـد شـاری دینـەوەری وێـران کـرد ، ١٦ هـەزارکـەس بەمردویی لەژێر خاکا دەر هێنرانو کفن‌ودفن کران ، خوا ئەزانێ چـەندی ترلـە ژێـر خراپـەکانا ماونـەوە ( الكامـل ٩/٢٠٨ ) بومەلەرزەکـە شەوی یەکشـەمبە ١٦ مانگی شـەعبان ڕووی دا ( المنتظم ابن‌الجوزي ٧/٢٣٨ ) .

هەر لەم سالەدا «ابوالعباس‌الضبی» وەزیری مجدالدولە - کە سەیدە خاتون بەوە تاوانباری کردبو : گوایە:براکەیی ژار خوار کردووەو - هەڵاتبو چوبووە وەروگرد (بروجورد) وپەنای بردبووە بەر « بەدر » ( الكامل/٩/٢٠٩ ) .

سالی٤٠٠ك = ١٠٠٩زا كه بەدر چوو بۆ هاواری شمس‌الدەولەو گەیشتە «بەرزیگورد» - یا «بوزنگورد» - هەوالیان دایێ کە هلال (هلیل)ی کوڕی لە دینەوەر ئالآی یاخێتیو سەرچلی هەلکردووەو، سپایێکی زۆری لە کوردەکان کۆکردۆتەوەو گەنجینەو سامانی باوکی ( واتاهی بەدری ) تالآن کردووە ، جا بەدر لەگەلّ هەلیلی کوڕی کەوتەشەڕەوە ، بەلام سپاکەی نهێنبری‌یان لێکردو تەکینەوەو خۆیان دایە پالّ هەلیلو نامەردانە بەدریان دەسگیر کرد ودایانە دەس کوڕەکەی ، بەلآم بەدر بەدزی‌یەوە خوێندی بەگوێیاو پێی وت : کوڕم ! من پادشاهیو گەنجینەم بۆتۆیە : من پیربووم تۆ من بنێرە « درازینە » - ( ئەم قەلآی درازینەیە ئەمڕۆ ناونیشانی نەماوە ) کەلەوێ بۆخۆم بەنوێژوخوا پەرستی‌یەوە خەریكبم وتۆ پادشایی خوتبکە .. هەلیل بەقسەکانی باوکی خەلّەتاو ناردی‌یە ئەو کۆنەقەلآیە ، هەرکە بەدر گەیشتە ئەوێ کەوتە نامەناردن بۆ بهاء الدولەو بۆشمس الدولەو بۆبوبکر رافعو ابو عیسا شادی داوای هێزو سپای لێکردن ؛ دانەی تەماحی نابەبەر دەمیان ، هەروا ئەسپردەی ناردە لای گۆرانەکانو داوای کۆمەكو یاریدەی لێکردن . ( وادیارە بەدر هەر بەقەستی داوای دژی درازینەی کردووە کەلە ناوەندی هەرسێ لادا بوودو لە هەموویانەوە نزیكبووە ) جا لەوەرامی نامەکانی بەدرا « ابو غالب » سەرەك وزیری « سلطان بهاء الدولە » بەسپای سولطانەوەو ابو بکر رافع بەسپای شمس الدولەوە وابو عیسا

محمد یش بەسپای خۆیەوە کەلەوحەلەدا لەلایەن بەدرەوە سەرداری « اسدئاباد » بو ، هەموبان لەدەروازەی نەهاوەند کۆبوونەوەو لەشکربەزیان کردو کەوتنە چاوەڕوانیی بەدر ، لەلایەن گۆرانەکانیشەوە هێزێك بەهاواریەوە هات ، هەلیل لەم ساجمان ورەشبگیرە بێئاگابوو ، کە هەوالی پێ گەیی لەدینەوەرەوە ڕوی کردە نەهاوەندو شالاوی کردە سەر هێزەکانیانو کەوتەشەڕەوەو کوشتاری لێکردنو لێی بەدیل گرتن ، عبدالملك ماکان واسماعیل صملوك وابو العباس حاجب هەمو لەناودیلەکانا بوون ، ابو بکر رافعو ابو عیسا شادی محمد هەلاتنو لەقەلای نەهاوەندا خۆیان قایم کرد، هەلیل یەکێکی نارد بۆلای رافع کەپێی ڕابگەێنێ : ئەگەر ئەتەوێ خۆت ڕزگاربکەیو هەر لەجێی خۆتا بمێنیەوە ئەوا « ابو عیسا شادی بدە بەدەستەوە ،ئەبوبەکر رافع ئەم کارە نالەبارەی کرد ، لای وابو ئەگەر ئەبو عیسا نەما ، ئیتر ئەستێرەی بەختی ئەگەشێتەوە ، جا ابو عیسای دایە دەستیان ، هەلیلیش دایە دەست بەرزیکانیەکانەوە کوشتیانو تەرمەکەیان بردەوە بۆاسدئاباد لەوێ ناشتیان ، پاش ئەوە کەهێزو کۆمەك لەهەرلاوە گەیشتە بەدرو گۆرانەکانیش گەیشتە فریای ئنجا بەدر .لە قەلاکە هاتەخوارەوەو لەگەل هەلیل کەوتەشەڕەوە ، هەلیل شکستی خواردو بەدیل گیرا ، زنجیرو پالهەنگ کرا ، سەرەك وەزیر ابو غالب ساماتێکی لەرادەبەدەری لەقەلای « پەرستار بود خواست » ( ناوەکە

هەڵەیەو مەبەست شاپور خواستە ) دەرهێناو بـەتاڵان بردی ،
کەبریتی بوو لەشتومەکی زێرین‌وزیوین وگەوهـەرو مرواری‌و
جل‌و بەرگ‌و وکاڵای‌بـەنرخ ، هەمو ولاغـەکانی سپایی‌بارکرد
لەماڵی تاڵانی‌و بردی بۆبەغدا ، پاش گەڕانەوەی ئەم سپاوهێزانە
ئنجا بەدر گەڕایەوە قەڵای شاپورخواست ( واتا فلك الافلاکی
ئەمڕۆ )و زۆربەکوژرانی « ابو عیسا شادی » زاواو فەرمانبەری
خەفەتبارو دڵئازاربوو ، لەداخا کەوتە کوشتاری بەرزینی‌یەکان
وڕوی دایە گۆرانەکان وپێشیانی خست ، ئەم شەڕوهەرایـــە
لەمانگی ربیع الاول ساڵی ٤٠١ك = ١٠١٠زا دا دوایی هات .
( مجمل التواریخ ٣٩٩ ـ ٤٠٠ ) ئەم هەواڵە مێژوییەی گێڕامانەوە
هی کتێبی « مجمل التواریخ » بوو کەنووسیمان ( ساڵی ٥٢٠ك
نووسراوە ، بەر لەدایك بوونی ابن الاثیر بە ٣٥ ساڵ وبەرلـە
نووسینی الکامل بەنزیکەی‌صەت‌ساڵێك ) ، جا لەبەر ئـەوەی
هەندێ لە هەواڵ‌و قەوماوەکانی تێکەڵ‌و پێکەڵەو لەالکامـل دا
باشتـرو بەرێکـی وپێکـی نـووسـراوە ، باسـەکـە لـەوێوە
وەرئەگرینەوە ، ابن الاثیر نووسیویە :

ساڵی ٤٠٠ك = ١٠٠٩زا ناکۆکی‌و ناخۆشی کەوتە نێوان
بەدرو هیلالی کوڕی ، هۆی ئەم ناخۆشی یە بـەم جۆرەبووە :
دایکی هیلال لـەعێلی شازەنگـانی ( شازنجانـی ) بـوو پـــاش
لەدایك‌بوونی هیلال بـەدر خستبویـە لاوەو ژنەکـەی تـری
پێش‌خـستبوو ( واتا هەوێ‌کەی دایکی هلال ) جـا هلال دوور
لەنازونیعمەتی چاودێری باوکی ژیابوو ،کەچی ابو عیسای کوڕی

هەویکە لەنازونیمـــەتو چاودێری باوکا ژیابوو ، هلال هــەر لەمناڵییەوە لەم باری ژیانە نارەحەتبوو ، کەهەڵچوو گەورەبوو ڕۆژێ‌لەڕۆژان لەگەڵ‌باوکی چووبووە ڕاووشکار ، لەناکاو شێرێ لـەبێشـــە لاَن دەرپـەڕیـو ، یاســـای بـەدر ئەوەبـــو خۆی بەدەستی خۆی شـێرەکە بکوژێو تۆکەروسپایی دەخـل نەکەن ، بەلاَم هلال ئەم هەڵەی لەدەست وەرگرتبوو ، بێ‌ئەوەی داوای مـاوای لێبکات هــەڵی کـوتابووە سـەرشـێرەکـەو کوشتبووی ، بەدر تووڕەبووبوو وتبوی : « وائـەزانی جهان گیریتکردووە ؟ چ فەرقێ هەیە لەنێوان ســەگو شێرا ؟ » پاش ئەوەهەمیشە سەرنجی ئەدا کە هلال توندوتیژە ، لـەبەر ئـەوە حەزی ئەکرد لێی دووربێ ، هەر لەبەرئەوە « صامغان »ی دایێ کەفەرمانڕەوایی تیابکات ، هلال کەچووە « صامغان » کەوتــە دەس‌درێژی ســنوری ولاَتـەکانی ژێردەستی « ابن الماضــی » کەخێوی شارەزورو دۆستی بەدربوو ، بەڵکو دەس‌نیای بوو ، جـا بەدر بانگی کردونـەئی لێکردو داوای لێکرد جارێکی‌تری دەس‌درێژی سنورنەکاتو ابن الماضی دلگیرنەکات ، بەلاَم هلال نەك هەرقســەکانی باوکی لـەگوێ نـەگرتو بـەس ، بـەلکو هەرەشەی نارد بـۆ « ابن الماضی » .. کـەبەدر بـەوەی زانی بەتوندی سەرزەنشی کردو هەرەشـەی‌لێدا ، بـەلاَم ســودی نەبووهلال ئـەمجار لـەڕقی باوکی بـەسپاوە هـەڵی کوتایـــە ســەرشارەزورو داگیری‌کـرد وابن الماضــی وکـەس‌وکاری هەموکوشتو ماڵ وسامانیانی هەموتالاَن‌کرد ، بەدر لەم کارەی

هلال زۆر نیگەرانو نا ڕەحەت بوو بەڵام هلال بەوەش‌وازی نەهێنە کەوتە خەڵاتکردنو دیاری دان بەفەرماندەکانی سەربەباوکی‌و هەموبانی لێی هەلگێرایەوە ، بەدر ناچار نزیکی شاری دینەوەر لەگەل هلال کەوتەشــەرەوە ، کــە هــەردووهێز تــەقین‌بــەیەکا هۆزەکوردەکانی ئەوناوە بوونە کۆمەکی هلال ، بەدری باوکی لەشەڕا شکا وبەدیل گیراو بردیانە لای هلال ، هەندێ لـــــە سەرانو فەرماندەیان هلال یان هاندا کەبیکوژێ ، بەڵام هلال وتی: «من زۆڵ نیم باوکی خۆم بکوژم وچووبۆلای ویێی وت »: بابەگیان ! تۆ هەر فەرمانڕەوابەو من‌دانێ بـەسەردارسپاهـ .. بەدر کەوتەفێڵو پێی‌وت : کوڕم ! ڕازی‌خۆت بۆ کەس مەدرکێنە هەمو ولاتەکە بۆتۆ تەنیا یەکێك لە قەلاکان بۆمن تەرك‌بکـــە تیابحەسێمەوەو بەخواپەرستی یەوە خەریك‌بم . بــەڵام بــەدر کەگەیشتە ئەو قەلایەی بــۆی تەرخان‌کــرا کەوتەقــایم کــردنو سەخت‌کردنی‌و هەوالی نارد بۆ « ابــو الفتح کــوڕی عــەییار ( عناز )و ابو عیسا شادی کوڕی محمد ـ کەلە اسدئاباد بوو ـ هانیانی‌دا کەولاتەکەلەدەس هلال‌وەربگرنەوە ، جا ابــو الفتح ڕووی‌کردە « قرمیسین »و داگیری‌کرد وابو عیساش چوو بۆ « شاپورخواست »و لەوێ هــەموســامانو ئاژالو زلەمومەری هلالی تالان کــردو ڕوی‌کــردە نەهــاوەند کــە ابو بکــر رافعــی تێدابوو ، بەڵام هلال لێی ڕاپــەڕی‌و کــەوتــە دوای وڕاوی‌نا وبەشیروتیر کەوتە ناوهێزی دەیلەمی‌و کەللە پاچــەکردنیان ، ونزیکەی ٤٠٠ کەسی لێ‌کوشتن،نەوەد کەسیان لەپیاوماقوولانو

ـسـەران بوون ئنجا ابو بكر رافع ابو عيساى گرت‌و دايـــــــە
دەس‌هلال ، بـەڵام هلال نـەيكوشت‌و لێى‌بورد ( لـە مجمـل
التواريخ‌دا كەتێيەڕى نووسراوە هلال ابـو عيساى دايـــــــە
دەس‌بەرزنى‌يە كان كوشتيان ) پاشان بەدر نامەى‌نووسى بـــۆ
بهـاء الدولە،جا فخر الملك ابو غالب ى وەزيرى خۆيى بەسپاوە
ناردە هاوارى بەدرەوە ، فخر الملك ڕوى‌كردە شاپور خواست .
هلال كەوتە ڕاوێژى لەگەڵ « ابو عيسا شادى » ولێى‌پرسى :
ســـپاى بهـاء الدولـە هات ڕاتچى‌يـە ؟ ابـو عيسا وتـى :
مەچورەشەڕەوەو پەيامى بۆبنێرە : كەمن مل‌كەچم‌و فەرمانبەرم،
بەماڵ‌وسامان ڕازى‌بكە ئەگەر ڕازى‌نـەبوو تەنگـەتاويان‌بكەو
خۆت ڕزگاربكە ، ئەوان‌تواناى درێژەدانيان بەشەڕنيە ،ئەم‌سپايە
وەكو ئەوسپايەنيە كە لەدمرولزەى نەهاوەند شەڕت لەگەڵ‌كرد !
ئەوانە باوكى‌تۆ سالەهاى ساڵ بۆژەو زەبوونى كردبـوون ..
« هلال وتى : ڕاستت لەگەڵ نەكردم وفێن برێت‌كرد مەبەستت
ئەوەيە كەمن ووردموورده بێ‌هێزبم‌و باوكم‌بە هێزتربێت ، ئنجا
كوشتى،وشەو هەلى‌كوتايە سەر سپاكە ويستى بەسەريا زاڵ‌بێت.
بەڵام هەركە دەنگى هەلبڕى « فخر الملك » سواربـوو لەسپـاى
خورى‌و هەمو گرانبارى بەجێ هێشت‌بۆ پاسەوانان وكەوتەڕێ
بۆشـەڕ كـەهلال زانى كارێكى سـەخت ڕووى‌داوەو تواناى
بـەرانگارى‌نيـە ، هـەناسەى سـاردى‌پـەشيمانى هەلكێشـا
كە بە قسەكەى ابو عيساى نەكردو بێ‌تاوان كوشتى ئنجا ئەسپردەى
نارد بۆلاى « فخر الملـك » وڕايگەيانـد : كـە مـن بۆشەڕنـە

هاتووم ، بۆئەوە هاتووم لەتۆ نزیك‌ببمەوە ،ئەمەوێ فەرمانبەریی خۆم دەربخەم ، فخر الملك بەقسەكانی قایل‌بو ، بەلاّم ویستی رای‌بەدر بزانێ ، جا نامەی بۆی نووسی كە حاڵەكە وایە بەدر كەوتە جنێودان بەئەسپردەكەو نامەی نووسی بۆ فخر الملك : نەكەی بخەڵەتێی ، ئەمەفێڵە ڕاستی‌نیە ، هلال خۆی بێ هێزونانەوان دیوە ، نەهێلی هەناسە بكێشێت ، كەئەم وەرامە گەیشتە « فخر الملك » ورەی‌قایم‌بوو ، لەوەبەر وای‌ئەزانی كەبەدر ئەشێ دلی بەهلال بسوتێ ، ئنجا سپای‌بەرەوپێش تەكان‌دا وشەڕگەرم‌بوو هلال شكستی خوارد وبە دیل‌گیرا ، كەهێنایانە بەردەم فخر الملك ، زەوی‌یەكەی ماچ‌كرد وتی‌مەمدەرە دەست باوكم چی تریم لێ‌دەكەی ڕازیم فخر الملك وتی : باشە نیشانێ بنێرە كە خەڵكی ناوقەلاّكان خۆیان بدەن بە دەستەوە ، نیشانێكی‌دا ، بەلاّم دایكی‌و پاسەوانەكان قەلاّكەیان نەدایەدەستەوە داوای ئەمانیان‌كرد ، فخر الملك ئەمانی بۆناردن‌و خۆی‌چووە قەلاّكەوەو پشكنی‌و هەرچی تیاهەبوو هەموی پێچایەوە ، چل‌هەزاركیسە زێڕو گەلێكی‌تر گەوهەرومرواری‌و بەردی گران بەهاو كالاّوچەكی تیابوو هەموی‌بەتالاّن برد ( الكامل ٢١٣/٩ تا ٣١٦ ) .

بالێرەدا لەیادمان نەچێت كەلەم ساڵەوە « ابو الفتح » بووە بەخێوی « قرمیسین = كرماشان » ئەویش‌كەبەفەرمانی بەدر چووەداگیری‌كردووە ـ .. بابیێنە سەرولاّتەكان كەتا ئەم دەورە لەژێر دەستی « بەدر »دا بوون ئەمانەبوون : شاپورخواست

( واتا فلك الافلاك ـ يا ـ قەلآی هەرسین ) دینەوەر ـ وەروگرد ( مەبەست برۆجوردە ـ نەهاوەنـد ـ ئەسـەدئاباد ـ ئـەمـوازو دەوروبەری وگەلێ دزوقەڵاو شـاری‌تری ( الكامل ٩/١١٦ ـ ٢٤٩ ) سەرەڕای هەرێمی شارەزور ..

سـاڵی ٤٠٤ك = ١٠١٣ز ا كە هلال دەسـگیركرا ، بـەدر شـارەزوری خستە ژێردەستـی فەرمانبـەرانی فخـر المولـك ؛ ئالەم‌دەمەدا « طاهر كوڕی هلال كوڕی بدر » هەڵی كوتایە سەر شـارەوزور ولـەگـەڵ سـپای فخـر المولك‌دا كـەوتـەشەرەو وشارەزوری داگییركردەوە ، كە فخر المولك بـەم حاڵەی‌زانـی ئەسپردەی نارد بۆلای طاهرو گلەیی لێكردو داوای‌كرد :دیلەكان بەربدات ، جادیلەكانی بەردا ، بەڵام شارەزوری لـەژێردەسـا مایەوەتا لەگەڵ ( ابو الشوك ) عەیار ( عناز ) كـەوتەشـەڕەوەو لەشەڕاكوژراو ابو الشوك شارەزوری دایـە « مهلهلی برای ( الكامل ٩/٢٤٦ » .

**رەوشتی بەدر :**

ئەمەندەی کەنووسرا باسی فەرمانڕەوایی‌و کاروباری وڵات بەڕێوەبردن بوو ، ئنجا بابێینە سەرباسی ڕەوشت‌و خووی جوانی بەدر ومەردایێتی‌و سایەداری وپەنادەرێتـی ئـەو ، دەستاوێـزو بەڵگەمان بۆئەم باسانە ئەو هەڵنان وپەسن‌و ستایشانەیە کـە « ابو شجاع ظهیر الدین ڕۆزراوریی هەمەدانی وەزیری المستظهر بالله عباسی » لـەو نەیلـە دا کـە بۆ کتێبی « تجـارب الامم »ی نووسـیوە ئـەلیت : « بـەدر ئەم سورشتانـەی تیا هـەبوو : مەردایێتی ، جوامێری ، ڕاستاڵی ، دادپەروەری ، توندوتیژی دەربارەی سپا ، نەرم‌وناسکی دەربارەی گەل‌و کوڕانی هۆز ، ڕامیار ، کـارەما ، شـارمزای کۆکردنـەوەی سـامان بـەناوی باج‌وپیتاك لە دەولـەمەندان‌و ، بڵاوکردنـەوی بەسەر گـەداو هەژاراتا ، وپاشەکەوت‌کردنی سامان‌و ماڵ لەگەنجینەی میللەتا، خاوەنی‌ورەو ، جەرگ‌قایم‌و نەبەزو چاونـەترس ، وکۆڵ‌نەدەر وخێرخواو وئاسایش‌پەروەر ... تاد ( ٢٨٧/٣ - ٢٩٩ ) .

گەلالەی قسە ئەم هەموو‌ڕەوشتە جوانانەی هەبوو ئـەم سورشتانەی لەخۆی پێچابوو نموونەیێ لە وشیاریی ڕامیاریانەی ئەو جورە بوو کـەلەگـەل تیرەکـەیا ئـەجولایـەوە : تیرەی

بەرزیکانی خراپترین تیرەبوو لەزۆرداریی‌و ستەم لەخەلك کردن‌و سەرکێشی وسەرچلی وڕیگری‌و جەردەیی‌و خوێن‌ڕشتن‌و تالآن‌وبڕۆدا ... کەبەدر جلەوی فەرمانڕەوایی ولآتی گرتە دەست ، کەوتە ڕێ‌نومایی و ئاموژ گاری کردنی ئەم تیرەیە ونیشاندانی ڕێگەی باش‌و پیاوانە بەوان ، یەکێ لە سەرمەشقەکانی بەم‌جۆرە بوو : لە سەرەتای فەرمانڕەواییدا ناردی هەمو سەرانی بەرزیکانی‌و دەوروبەری کۆکردەوە ودوستوری‌دا کوشتی‌یەکی زۆریان سەربڕی ، وهەموجۆرە خواردنێکیان لەگوشت دوروستکرد وسفرەیان‌بۆ ڕاخراو فەرموویان لێکرا ، کەچوونە سەرسفرە کەوتنە چاوەڕوانی ئەوەی نان‌بێت ، نان نەهات ... دامان ، بەدرهات وتی بزانم نافەرموون بخۆن ، ئەوانیش‌وتیان : ئایا چێشت‌و گوشت بێ‌نان ئەخورێ !؟ بەدر وتی : خۆ هەموتان ئەزانن کە هیچ‌خۆراکێ بێ‌نان ناخورێ! ئەی بۆچ دەغل‌و دانی فەلآو کشتیارەکان ئەدەنە ڕان‌و گاگەلەکانتان وبەرەلآی ئەکەن ؟ ئەی‌بوچ خەرمانەکان ئەسووتێنن ؟ بوچ نەتەوەکەتان بێ‌نان ئەهێلنەوە ؟ من ئێوەم بۆ ئەوە کۆ کردوتەوە پێتان ڕابگەیێنم : لەمەودووا هەرکەس دەغل‌ودانی فەلآکان بخوات ، هەرکەس خەلەوخەرمانی کشتیارەکان بسووتێنێ چەرمی لە چەمەر ئەکێشم ، سەری بەشمشیر ئەپەڕێنم .. پاش ئەم‌قسانە دوستوری‌دا سەرسفرەکان پڕکرا لەنان‌و فەرموون (باسم الله بکەن)ی‌وت .. پاش ئەم ئاموژگاری‌یانە ئیتر بیرای بیرای ئەوکارە خراپانە

لەقەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەوا ڕووی‌ئەدا چونکە لەسەرکاری خراپ بێ‌بەزەییانە ئەکەوتە کوشتاریان .. ئابەم جۆرە سامی خۆیی بەسەروڵاتەکەدا بڵاوکردەوە !

دوونەیێکی تری لەکاری ئاموژگاریانەی بەدر بەم جۆرەبوو : جارێکیان سەربازێ لەسپاکەی تووشی کابرایێکی هێزم‌چنەوەی دارکەر بووبوو، کە کۆڵەکەی لەسەرڕێ خستبوو ، سوارەکە سەرنجی دابوو کابرا چەند کولێرەیێکی پێ‌یە لێی سەندبوو ڕوییبو ، کابرا وچانی سەندبوو تا بەدر گەیشتبوو، لای‌وڵێی پرسیبوو : ها لاڵۆ ! بزانم کۆڵەکەت لەسەرڕێ خستووە ؟ کابرا وتبووی میرم !! من هەژارێکم بەهێزم فرۆشی ئەژیم لەگەڵ خۆما دووکولێرەم هێنابوو کەپاش گردوکۆی کۆڵە هێزمەکە بیخۆم‌و توانای هەڵگرتنی کۆڵەکەم هەبێ ، بەڵام یەکێ لەسوارەکان دووکولێرەکەی بەزۆر لێم‌وەرگرت ، ئێستەبرسیمە ناتوانم کۆڵەکە هەڵبگرم بچم‌بیفرۆشم‌و نان‌و خۆراکی ئەمڕو بۆ خێزانەکەم دابین‌بکەم !! بەدروتی : ئەتوانی کابرا بناسیەوە ؟! پیاوە کەوتی بەڵی بەچارەیا ئەیناسمەوە ! بەدر کابرای لەگەڵ خۆی‌برد ولەتەنگەبەرێ داینا وتی : لێرە دانیشە ئێستا سپاکە دێت‌لێرەوە ڕائەبووری باش سەرنجیان بدە کابرا بناسەوە » ، کە سوارەکان ڕەت‌بوون کابرای هێزم‌کەر سوارەکەی‌ناسیەوە وتی میرم ! ئا ئەم کابرایەبوو نانەکانی لێ‌سەندم بەدر دوستوری‌دا بەسوارەکە دابەزێ‌و کولەهێزمەکە بخاتە سەرپشتی‌و بچێ لەشار بیفرۆشێ‌و

پارەکەی بداتە کابرا ، سوارەکەوتە تەقەلاو هەوڵ کەڕازی بکات بەدەقاتو صەتقات ، سوودی‌نەبو ، ناچار دابەزی کولەکەی هەلگرتو چوو لەشار فروشتی‌و پارەکەی هێناو دایە کابرا ، ئابەم‌جۆرە سامی خستبووە دلی سەربازو سپاییەکانەوە کەدەس‌درێژی‌مالی کەس‌نەکەن، خەلکی ولات ئەترسان وخرایەیان نەئەکرد ..

لەبارەی ئابوری وپاشەکەوتی گەنجینەشەوە ئەم نمونەیە بەسە « کاتی فخر الملك ابو غالب خلف قەلای « دزبوز »ی داگیرکرد ئەوەندەی سامان تێدابوو کەلەگەنجینەی ولاتە گەورەکانا نەبوو .. جگە لەم کارانە کە ووترا ، لەسەرکەلی چیاوشاخەکان ولەسەر ڕێ‌گاکان پاسەوانی دانابوو بۆ وەرگرتنی باج‌و پیتاك ودەیەك ، ئەم دەسکەوتانەی دائەنا بو بەرژەوەندی ولات . ئەگەر بیزانیایە یەکێك لە فەرمانبەرانو مووچەخۆران دزیی ئەکات یابەرتیل وەرئەگرێ بەزندانو کوشتن سزای ئەدا . هەروا کەبیزانیایە فەرمانبەرێك دەس پاکەو ژیانی تەنگە یاریدەی ئەدا ، هەروا سامانێکی زۆری تەرخان کردبوو بۆ کارگاو کارخانەو دوروستگردنی پردو کردنەوەی ڕێگا بۆناوچیاکان ، ودامەزراندنی بازاڕو خانو کاروان سەراو هێنانی هەموجۆرە کوتالو شتومەك ، وبۆیاریدەدانی ڕێبوارانو هاتوچوکاران .. دەربارەی پێش هاتیش زۆر وریابوو ، زووزوو چارەی بۆ پەیدا ئەکرد .. بۆ وێنە : کە « یەمین الدولە ابو القاسم محمود کوڕی سوبکتوگینی غزنوی « بڕیاری‌دا شالاوبکاتە شاری « ڕەی »

بۆداگیر کردنیو ئەسپردەی ناردبۆ لای « سیدەخاتونی »
دایکی فخر الدولە کە بەئاسانی ولآتەکە بدات بەدەستەوە ،
سەیدە خاتون بۆ چارەوتەگبیر پرسی بەبەدر کردبوو ، بەدر
لەوەراما بە سیدە خاتوونی وتبوو : با ئەسپردەکە لە پێشا
بێتەلای من ئنجا بیت بۆلای تۆ ، جا بەدر بەرلەوەی ئەسپردەکە
بگاتە پایتەختە کەی دوستوریدابوو هەرلەسەر شەقامەکەوە
تاکۆشکەکەی سپای تەیار بەهەمو جۆرە چەکێك بەریز بوەستێو
خەریکی مەشقبێت لەو جێگەیەی پێی ئەوترێ « دەروازەی
رەی » تاقەلآی شاپورخواست ، هەرکە ئەسپر دەی سولطان
محمود گەییە ئەوێ ولەمسپاوە درایە دەس ئەوسپاو لەوسپاوە
درایە دەس ئەولەشکرو لەو لەشکرەوە درایەئەوهێزو
ولەوهێزەوە درایەئەوهەنگو لەوهەنگەوە درابووە ئەو لق
تاگەییبووە بەردەرگەی بارەگای بەدرو چووبو
نامەکەی گەیاندبوو سەری گێژبووبوو ، ئنجا بەدر لەوەرامی
نامەکەیا نووسیبوی دۆستایێتیو ئاشتی باشترە لەشەروهەرا ..
کەکابرای ئەسپردە وەرامی نامەکەی بردبووەوە بۆسولطان
محمود وچۆنێتی بارودۆخی ولآتەکەشی بۆی گێرابووەوە ئیتر
نیازیشەری نابووەلاوە ، ئەمەش جۆرێبوو لەفرەوفێلی جەنگیی
بەدرو پیلانی شەری ..

هەروا کە « فخر الدولە »ش لەسەر تەختی پادشایی
دانیشتو شاری « رەی » پایتەختی بوو بریاریدا کە « قابوس
کوری وەشمگیر » بکاتە میری ۆلاتەکەی ، بەلآم « صاحب

کوڕی عبادی وەزیری » ڕێی نەدابو ، کە فخر الدولەمرد ، خەڵکی گورگان چوون قابوسیان لە « نیسابور » ەوە هینایەوە کردیانە ئەمیری خۆیانو ئەمکارەبووەهۆی هەراوئاژاوە ، جابۆچارە پەیداکردن داوایان لەبەدر کرد تەگبیرێ بکاتو مشورێ بخوات . بەدر بەم جۆرە وەرامی دایەوە : جێگری فخر الدولە گەنجەو خوێنگەرم نابێ هەرلەئێستاوە ڕێی بدرێ کەسامانوگەنجینەی وڵات لەڕێی کاری بێئەنجاما خەرج بکات ، باشوایە چاوەڕێ بکرێ ئەگەر دیتیان شایەستەیی ولێوەشاوەیی تیایە ئەوا ئەتوانێ مولکی لەدەس چووی خۆی وەربگرێتەوە ، ئەگەرنا شایەستەش بێت ئەوا سوود لەوکارمدانیە کەئێوەبڕیارتان لەسەرداوە . بەڵام دەسوپێوەند بەقسەی بەدریان نەکردو ئامۆژگاریەکانی ئەویان لەگوێ نەگرت ، سپایان بەڕێخست بۆشەڕ لەگەڵ قابوسو شکستیان خواردو سەرنەکەوتن ، پاشئەوە بیروڕای « سیدە خاتوون » وبیروڕای بەدر لەسەرئەوە یەکیگرت کەدەبێ « ابو علی خطیر » لەوزیری لابدرێو دەسگیربکرێ ... تاد ( ذیل تجارب الامم ۳/۲۸۷ - ۲۹۹ ) .

جگە لەوانەی وترا ، بەدر پەناگاو سایەداربوو نەوەك هەربۆ گەداو هەژار ، بەڵکو بۆوەزیران وفەرمانبەرانیشو بۆسەردارانی سەربە ئالبویەی وخەلیفەی عباسیش ، هەرکام لەوەزیرانو سەرداران لێیانبقەومایە خۆیان ئەگەیاندە دەرباری بەدر ، بۆ گەواهیوبەڵگە « هلالی صابئی » نووسیویە : ساڵی

٣٩٢ك = ١٠٠١ز ا ابو العباس الضبی وەزیری « مجد الدولە »
لەشاری رەیەوە هەڵاتوخۆی گەیاندە وەروگرد ( بروجورد )
وپەنای بردەبەربەدر ، هۆی ئەم پـەنابردنە ئـەمەبوو : لـەپڕ
سپەهبودی مەزنمرد - کەبرازای سیدە خاتوون بوو - تاوانی
مردنەکەی بەجۆرێکی نهێنی خرایـە ئـەستۆی « ابـو العباس
الضبی » گویا ئەوژارخواری کـردووە ، « سـیدە خاتوون »
داوای لەوەزیرکرد دووصەت دینار تەرخان بکاتبۆ مەصرەفی
پرسە ( فاتحە ) وەزیر لەوەراما وتبوی : سیدە خاتوون کەخۆی
خەریك ئەکات بەشیوەنوپرسەو فاتحەی کەسێکەوە کەمردووەو
نایێتەوە وبۆئەوە دووصەت دینار خەرج ئەکات، باشتروایە داوای
دووصـەت دینارەکە بکات بۆخـەرجی سـەربازەکان .. کـەئەم
قسەوالە گەیێتەوە سەیدە خاتوون وتی : ابو العباس راسـت
ئەکات ناتووانی کوڕی‌پرسەو فاتحـەی کـەسێ ببینێ کـەخۆی
کوشـتوویـە ؛ کـە ابو العباس ئـەمقسـەیـەی بیستـەوە
ترس کەوتەدڵی‌یەوە، بە جۆرێکی نهێنی «ابو القاسم کوڕی گەجی
قاضیی دینەوەری » نارد بۆلای بەدر بۆتاقی کردنەوەی نیـازی
وداواڵێکردنی : کەرێ‌بدات « ابو العبـاس » پـەنا بباتـەلای ،
تارۆژگارێکی وەها بێتـە پێشەوە کـە « ابو العباس » بتوانێ
پاکانـەی خۆی‌بکاتو باوەری سـەیدە خاتوون بـەلای خۆیا
رابکێشێت ... بەدر لەوەراما بەقاضی وت : کـەیفی خۆیـەتی
خەزئەکا لەخۆی تێك‌نەداتو هەرلەوێ بمێنێتەوەو لـەسـەرخۆ
دڵی سـەیدە خاتوون دڵنیا بکات کـە ئاگای لـەوتاوانەنیـە .

وحەزیش ئەکات ئەوێ بەجێ بهێڵێ .. ابو العباس ئەم قسانەی زۆر بەدڵ نەبوو جارێکی تری قاضی ناردەوە بۆلای بەدر . ئەمجارە بەدروتی : من بیروڕای خۆم نیشانداوە ئەو کەیفی خۆیەتی چی بەباش ئەزانێ ئەوە بکات ، « ابو العباس » لەدڵە راوکێدا ئەژیا ، پاش ماوەیێ ڕووی کردە بارەگای بەدر لەوەروگرد ، بەلام نەک بەدر هەرخۆی نەچوو بەپیریەوە ، بەڵکو هیچ کەسێکی لەپیاوماقوڵانی دەوروبەری خۆیشی نەنارد ، بەلام دوستوری بەفەرمانبەراندا کەخانووی بۆئامادەبکەن ومانگانەیێکی زۆری بدەنی ، لەوماوایەدا کەلەوێ مایەوە پترلەپێنج هەزار درهەمی بۆصەرفکرا ، ابو العباس تکای کرد کەمانگانەی بۆنەبڕێ ، پاش ماوەیێ بەدر داوای لە « سیدە خاتوون » کرد ابو العباس بگێڕێتەوە سەروەزیری ، بەلام ابو العباس نەیوێرابگەڕێتەوە بۆشاریڕەی ، ئنجا « ابو علی خطیر » کرا بەوەزیر ، کەچووە سەرکورسی وەزارەت داوای لە بدر کرد بەناوی « وەزیر » بانگی بکاو قسەی لەگەڵ بکات ،بەلام بەدر گوێی نەداو ملی بۆ ئەم جۆرە خۆ بەزلزانینە دانەهێنا ، لەسەر ئەوە نێوانیان تێکچوو بەجۆرێ کە گەیشتبوو «قسەی ناشرین بەیەکوتنو ، جاری ناحەزی دان ، ابو علي خطير نامەی نووسی بۆهەمو سەردارانی دەوروبەر کەهەر یەکە لەلای خۆیەوە بەبەهانەیێ بچێت بەگژبەدراو لێی نەترسێ ( ذیل تجارب الامم ٣/٤٥٢ - ٤٥٣ ) :

وادیاره هەرئەویش هانی « هلال »ی دایێ کەدژی باوکی ڕاپەڕێو شۆرشی دەرباره هەلبگیرسێنێ •••

هەروا کە ابو سعد کوڕی ابو الفضل بوو بەوزیری مجد الدوله « بەدر ڕووی خۆشی نیشان نەدا ، هۆی ناکۆکییان ئەوەبوو کەلەوەبەر « ابو سعد » لەلایەن « مجد الدولـه »وە سەرکاریی کاروباری هەمەدان ماهین (واتا دینەوەرو نەهاوەند)و سوهرەوەردو ئەبهەر بوو ، شتێکی دیاری کراوی ئەدا بەشمس الدولەی برای مجد الدوله ، بەدر کوڕی حەسەنوەیهی‌ش لە هەمەدان خانێکی کڕیبوو بەناوی خۆیەوە بەونیازەی فرۆشیاری تیادابنێ بۆفروشتنی ئەو دەغڵودانومێوەو شتومەکی تره کەلە ولآتەکانی ژێر دەستی خۆیەوە ئەنێررایە هەمەدان بۆفروشتن . هەروا بۆئەوەی ئەوکاروانچی‌یانەی ولآتی خۆی بیکەنە بارخانە ، جابۆئەوەی ئەم کاره سەربگرێ بڕیاربوو ملێونیك‌و دووصەدهەزار درهەمی تێ‌بچێ ، بۆڕاپەڕاندنی ئەم‌کارە « ابو غالب کوڕی مأمونی صەیمەری » ناردە هەمەدان کەلەگەڵ ئەوکەسەی کارەکە بگرێتەئەستۆو قەوالەی‌بکات ڕێك‌بکەوێ ، «ابو سعد کوڕی ابو الفضل » ئەم کارەی زۆر پێ‌ناخۆش‌بووبوو، ونەیویستبو سەربگرێو گالی دەستەیێ دەیلەمی دابوو شالآویان کردبووە سەر « ابو غالب » کەلە خانووەکەی « ابو عبد اللـه محمد کوڕی علي کوڕی خەلەفی نیرمانی»دا دائەنیشت کەئەویش جێگرەوەی بەدربوو لە بەڕێوەبەری هەمەدانا • ئەم دەستە دەیلەمی‌یەی کە « ابو سعد » هەڵی خەڵەتاندبوون ، لە پڕ هەڵیان

کوتابووه سەر ابو غالبو ماڵەکەیان داگیر کردبوو ، ابو غالب خۆی نەدابوو بەدەستەوە لەدەسیان هەڵاتبوو وڕووی کردبووە وەروگرد ( بروجورد )و لەوێ لای ئەوەی لێدابوو کەزۆرشتی بەتاڵان چووەو ڕستەیێکی دووردرێژی نووسیبۆ ئەمیربەدر وداوای لێکرد : کەماوەی بدات هەڵبکوێتە سەرزەوی و وزارەکانی ژێردەستی ابو سعدو ئەوەندەلە موڵکومزوی و زارەکانی زەوت بکات کەئەوزیانەی پێهەڵبێنێ ، بەدر ماوەی ئەوتولەیەیدا ، ابو غالب بەلای کەمەوە بایی پەنجا هەزار دیناری لێ داگیرکرد ، کەئەم هەواله درا بەسعدوتی : «هەروای دادێیم کەیەحیای کوڕی عەنبەر داویە بەسەریا سامانو ماڵەکەی بەتاڵان بردوه » .. ئەم یەحیا کوڕی عەنبەرە کابرایێکی جەردەی چەپەڵ بوو ، کەبەدر قسەکەی پێ گەیشتەوە گرتیە ... ئەم کاتەدا وارێك کەوت « ابو علي خطير » لەڕەی دەسگیرکراو لەوەزارەت دەرکرا ، ئەم « أبو سعد کوڕیفضله » خۆی ئامادە کرد بۆ ئەوەی بکات بەکورسی وەزارەت ، وبدر نەیەویستو ڕێی نەئەدا لەم کارەدا سەربکەوی جا ابو العباس الضبي خستە تەك ابو عیسا شادیو بەسێهەزارسوارەوە ناردی بۆ « ڕەی » بۆ ئەوەی کاروباری وەزارەتەکە بگرێتە ئەستۆ ( ذيل تجارب الامم ٣/٤٥٢ - ٤٥٣ )

... الدوله کوڕی فخر الدوله - کەلەباتی دایکی فەرمانڕەوای هەمەدان بوو - هەرکات لەگەڵ « بدر »دا ڕووبەڕووببوایە بەمجۆرە لەگەڵی ئەدوا : « گەورەم ! ئاغام !

پەروەردگارم ! ناصرالدین والدولە ابو النجم بـەدر ! ئەمیـری موسولمانان ! » ( مجمل التواریخ ٤٠٤ ) .

**دەورانی نسکۆ :**

وردەوردە دەورانی فـەرمانـڕەوایی بـەدر بـەرەونسکۆ ئەچێت و لەزۆرلاوە هـەولی کوشتنی ئـەدرێ ، سـالی ٤٠٥ك ١٠١٤زا بەدر لـەگەڵ « خۆشین مـەسعود » نیوانیان تێکچوو ( ئەم ناوە لە الکامل دا ٩/٢٤٨ ) « حسـین کـوڕی مسعودی کوردە » ، ولە شرفنامـەدا بۆتـە « حسین کـوری منصـور » ( لاپەرە ٨ دەستنووسی دانەر ، چاپی میصر لاپەرە ٤٠ وتەرجومە عەرەبیەکەی خۆم ٣٦ ) جا لەکناری سپیدرود ( « مینوروسکی » بەسیروانـــی دانـــاوەو منلامۆوایـەسیمینـەرودی ســـەقزە ) کەوتنەشەڕەوە ، شمس الدولە چوبۆیاریدەی بـەدر ، کـەلەوێ بیستی بەدر بەسەر « خۆشین »دا زاڵبووە گەرایەوە ، ئەوەبوو بەدر خۆشینی گەمارۆدا ، پاش ماوەیێ هـەندێ لـە گۆرانان سوێنیان بۆیەك‌خوارد کەبەدربکوژن ، لەگەڵ ئەوەشا کەئـەوان لەلای‌بەدر لەهەموکەس نزیکتربوونو کەسیش گومانی نەدەکرد ئەوجۆرە ڤێنبڕی‌یە دەربارەی بەدر بکەن . لـەناکاو دەسیان دایەکوتـەك ( زوپین )و هـەلیان کوتایـە ســەربەدرو تـەنافی خیوەتەکەیان بڕی‌و کوشتیـان ، ئـەوجێگەیـەی کەئەویانلێـی کوشت ناوی « گوشخد » بوو ( لە الکامل‌و شرفنامەدا بۆتـە کوسجد ) بەکناری سپید ڕود ە وەبوو ، تەرمەکەیـان برد لـــە

مشهدی امامی علي لەکوفەناشتیانو گۆڕەکەی زیارەتگایـــە
( مجمل التواریخ ٤٠١ ) بەڵام ابـن الاثیر باسی کوژرانیبـەدر
بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە : « لەمسالەدا ـ مەبەستی سالی ٥٠٤ك =
١٠١٤ازا یە ـ بەدر کـوڕی حـەسـەنوەیهی فـەرمانڕەوای چیـا
کوژرا ، هۆی کوژرانی ئەوەبوو کـەشالاوی کردبووە ســەر
« حسین کوڕی مسعودی کورد » بۆداگیرکردنی ولاتەکەیو
قەلای « کوسجد » ولەوێدا گەمارۆیدابوو ، ماوای گەمارۆکە
درێژەی کێشا تا سـەرمای سـەختی زسـتان دەسیدا ، یارانو
یاوەرانی بەدر هەمو لـەگیان بێزاربوون وبڕیاریاندا بیکوژن ،
بۆئەوەی لەوحاڵە رزگـابین ، یەکێ لە دلسۆزانی هاتـەلایو
پێیوت : هـەندێ نیازیان دەربارەت خراپـە ، وتـی : کین ؟
ئەوسەگانەی کەبتوانن کاریوابکـەن ؟ بڕۆن دووربکەونەوە ،
دیسان کابرا لەپشتی خێوەتەکەوە وتی : ئەو هەواڵەی کـەپێتم
ڕاگەیاند ئەوەتا بڕیاری تەواوی لەسەر درا ، بەڵام بەدر دیسانەوە
گوێی نـەداین ، ولـەخێوەتەکـە دەرچوو چووەبانگردێ لێی
دانیشــت ، جا هـەندێ لـەکەسانی تیرەیێکی « جورقـان »
پەلاماریاندا کوشتیان وبنـەوبارگـەی سپاکـەیان تالانکـردو
لاشەکەیان بەجێ هێشت ، ئنجا « حســین کـوری مســعود »
لـەقەلاکەوە دابـەزیوبینی لـەســەرپشــت کـەوتوتـەزەوی
دوستوریدا کفنیان کردو تەرمەکـەی خستەڕێ بو « مشهدی
علي خ٠خ» کەلەوێ بنێژری ٠ پاش کوژرانی بەدر جورقانەکان

هەڵاتن‌و پەنایان بردە لای « شمس الدولە ابو طاهر کوڕی فخر الدولەی بوەیهی‌و خۆیان خستەژێر فەرمانی ئەو (الکامل ۹/۲٤۸)

باڵەم باسانەی وەرمان گرت دەربارەی بەدر ئەنجامێکی زانایانە وەرگرین :

۱ - بەوەدا کەتەرمەکەیان بردووە بۆ « کوفە = نجف » دیارە لەسەر ڕچی شیعەیێتی بووە ، نەسوننی بووە نەکاکەیی ، وئەوەشیڕوونە کاکەیی مردوویان ناتێرن بۆکوفە ونجف •

۲ - مینورومسکی « گوش‌خد = کوسجد »ی کردووە « بەکوسەی هجیج »و « سپیدرودی » کردووە بە «میروان» « وجورقان » دانراوەبە « گوران » هەرومك لە « مجمل التواریخ » دانووسراوە ، من لامەوایە « جورقان » گەورکانە نەك « گوران » ، ڕەنگە نووسەرەوەی ڕوونووسی مجمل التواریخ گۆڕیێتی ئەوانەی کوشتوویانە پاڵیان داوەتە « شمس الدولە » لەهەمەدان‌و تائەمڕۆ « جورقانە »کان لەوێ هەرماون، وتائیستە هەر شیعەن •

۳ - لامەوایە ناوی « خوشین » ڕاستنیە ، چونکە « خوشین » یەکێکە لەپیرانی کاکەیی ، ئەوان لەبنەڕەتا باوەڕیان بەوەنیە کەعەلی وکوڕی عەلی‌مردبن‌و ، گۆڕیان جێگە زیارەت بێت ، کە خۆشین تەرمەکە بنێری بۆنەجەف ، بێگومان ئەم « حسین مسعودە » لەسەرانی شیعە بوومو هەمو ئەزانین کەلە هەوراماننا هەرگیز شیعەنەبووە ، وئێستەش تیانیە •

٤ - من لام‌وایه « سپیدرود » هەرئاوی « سیمینەروده »
کەلەچیای سەقزەوه دێ، ناوی « سەقزیش ( هەر وەك
مێژونووسان بیریان لێکردۆتەو ) لەبنەڕەتا « سکادۆ »
( قەلاّی‌سکاکان )بووەو لەسەردەمانی تورکمان‌و
تورکەمغولەکانا ناوەکە بووەبە « سقز » ، بەگومانی من کەبەدر
لەسەرکێوه کەکوژراوه وتراوه « کۆ سکەدۆ » پاشان ئەم ناوه
داتاشراوه بۆتە کۆسادۆ = کۆساجد = کۆشخد ، گەرچی
هەندێ لایان وایه ناوی « سەقز » هەر تورکی‌یه ولەناوی
بنێشتی تورکی یەوەهاتووه چونکه لەوێ داروەن ( بنیشت )
زۆره .. ( فەرهەنگی معین ، فەرهەنگی دائرة المعارفی فارسی )

٥ - ئەگەر ناوەکه « کوسەی هەجیج » بوایه وەك
پروفیسور مینورسکی گومانی کردووه (حسین کوڕی مسعود»
نەیئەتوانی له «بدر » یاخی بێت چونکه هەم لەلای کرماشانەو
هێزی بۆ گەمارۆی ئەهێنا هەم لەلای حەلەوانو شارەزوورەوە .

٦ - دیاره « حسین مسعود » کەلەزستانا لەبەدر یاخی
بووه هەرێمەکەی سەخت‌ودوور بووه هەمو ئەیزانین کە
هەرێمی « سەقز » ساردترین بەشی کوردستانه ، ولەلای
شارەزووریشەوه ئەوله هەمەدان نزیکترەو تیرەی « گەوركان »
که عەرەبی‌یەکەی ئەبێ به « جورقان » هەر له « بانه » «وسقز»
هەبێ ...

بەلی ! بەدر کوڕی حەسەنوەیهی بەڕاستی فەرمانڕەوایێکی
مەزن‌و زەبەردەست‌و دادپەروەرو جوامێرو دەست‌بلاّو بووه ،

هەروا سایەدارو پەنادار بووە ، بنەماڵەکانی بوەیهی هەرکامیان لـەناوخۆیانا خۆی بـەستەملێکراو زۆرلێکراو بزانایـە هاواری ئەبرد بۆبەدر وەك ئەونمونەیانەی تێپەڕی ، هەروا فەرمانبەرانی خەلیفەش هەرکامیان نسکوێ بهێنایە پەنای ئەبردە لای بـەدر چونکە خەلیفەی عباسی زۆری خـۆش ئـەویستو هـەر وەخت تەنگانەی بوایە داوای یاریدەی لێی ئەکرد ...

قەڵـەمڕەوی دەستـەڵاتی : وڵاتـەکانی ژێردەستی بـەدر ئەمانەبوو « اسدئاباد » کە ابو عیسای زاوای تیا سەرداربوو « نەهاوەند » کە ابو بکر رافع تیا بەڕێوەبەربوو « کرماشان »و ( حـەڵەوان ) کـەسەردەمێ « ابـو الفتح محمد عیار »ی تیا کردبوو بەڕێوەبەر ، « خانەقین » کە ابو جعفر کوڕی عـوامی تیادانابوو ، « شارمزور » کەخستبویە ژێردەستی « ابن ماضی » « صامغان » کە دابوویـە هلالی کـوڕی هـەروا « دینـەوەرو شاپورخواستو خوزستان» کەخۆێ تیافەرمانی ئەکردو سنوری تادەوروبەری بەغدابوو ( تاریخ یمیدی ٣٥٨ ) .

بەدر حەزی لەگەشەپێدانی وڵات بوو بەباغاتو کشتوکاڵو دورستکردنی مزگـەوت قوتابخانـەو بازاروخـان وڕێگاوبـان وجۆگەوڕوبار وپرد، شوێنەواری پردی ئالیشتەر لـەلوڕستـان گەواهێکی زیندوو شایـەتێکی مێژوییـە ئـەم بەردەنووسـە بـەدیواری پردەکـە وەبووەو تائێستا ماوەتـەوە ، بۆبـەڵگـە ودەستاوێژ :

« بسم الله الرحمان الرحيم هذا ما أمر ببناءه الامير الاج
ابو النجم بدر بن حسنويه ابن الحسين اطال الله بقائه في سنـ
تسع وثمانين وثلاث مئة من الهجرة النبوية ...» درێژایی ئەمپر
٢١٣ مەترو بەرزایی کەمەرەکانی ٢٠ مەتربووە ( کوردو پیوستگ
نژادیو تأريخی او لاپەڕە ١٩٥ وکرمانشاهان باستان لاپەڕە ١٨
والکامل ٢١٦٢١٣/٩ ) .

پردی ئالیشتەر ( لوڕستان ) کە بە فەرمانی
بەدری حەسەنوەیهی دورووست کراوە

کورسی‌یە بەردینەکەی میر بەدری حسنوەیهی

قەڵای سەرماژ لاپەڕە (٥٩)

دەقی ئەو نووسینە کوفیەی کە لە چواردەوری

کورسی‌کەکەدا ، هەڵکۆڵراوە

## ٤ ـ هلال ( هليل ) کوڕی بەدر :

لە مەوبەر وتمان : دایکی هلال لە عێڵی شازەنگانی بوو ، بەدر جگە لەدایکی هلال ژنێکی تریشی هەبوو کەدایکی « ابو عیسا »بوو ، هلال لەکۆشی ئەودایکەتۆراوە دوورخراوە پرلەڕق وکینەدا لە دایك بووبوو هەڵچوبوو ، کەگەورەبوو باوکی لێی بەگومان بوو خۆی لێی لائەدا ، هەرێمی « صامغان »ی دابوێ کەبیبیا بەڕێوە، هلال هەرکەبووە سەرداری صامغان چونکە ئازاو جوامێرو دەس بڵاوبوو خەڵك لەدەوری کۆئەبوونەوە . کەهێزی زۆربوو کەوتە شەرفرۆشتن بە «ابن ماضی» فەرمانڕەوای شارەزور کەدەس تێژی باوکی بوو ، بەدرپەیامی بۆنارد کەشەڕ بە ابن ماضی نەفرۆشێ وبەتوندی « نە » ی لێکرد، بەڵام سوودی نەبوو ، هەڕەشەی بۆنارد شێرگیر تربو، شالاوی کردە سەر شارەزورو داگیری کردو خۆی پتربە هێزکرد ئنجا لە هەڵێکا کەبیستی باوکی دوورە لە هەرێمەکەوە بەهانەهانەی هەندێ لەسەرانی سپای باوکی وسەرانی خێڵ وعێڵی ولاتو سەرانی ئال بویە هەڵی کوتایەسەر ولاتەکانی ژێردەستی باوکی ، هەر لەدینەوەرەوە تا نەهاوەندو ئەسەدئاباد هەموی داگیرکردو

بەدری باوکیشی بەدیل گرت ( هەرومك لەمەوپێش دیاردیمان بۆکرد ) بەلام بە نهێنی لەگەل باوکی کەوتە وتووێژ، لەسەر ئەوە رێك کەوتن فەرمانڕەوا یی ولات بۆهلال بێت وبەدر لەیەکێ لەقەلاکانا بۆخۆی بەنوێژوخوا پەرستی یەوە خەریك بێت ، بەلام بەدر هەرکە گەیشتە قەلاو جێی خۆی خۆش کرد ، کەوتە قایم کردنی قەلاکەو سەخت کردنی کونگەرەو بارویو نامە نووسین بۆسەردارەکانی ژێردەستی : وەك ابو الفتح محمد عیار ، کەلەوەبەر لەولاتدەری کردبوو ، ابو عیسا شادی محمدی زاوای کەسەرداری اسد ئاباد بوو ، وابو بکر رافع سەرداری نەهاوەند ، کە هەریەکەیان لای خۆیەوە راپەرێو شالاوبکاتە سەرهلال ، جگەلەمانە نامەی نووسی بۆ « سلطان بهاء الدولە ئال بویەی دەیلەمی » لەبەغدا کەبگاتەفریای ، ودانەی تەماحی زۆری بۆهەلرشتن و بەلێنی زۆری دانێ ، جا سلطان بهاء الدولە فخر الملکی وەزیرو سەردارسپای نارد بۆفریای ، جا بەسپاییکی زۆرەوە جماو کەوتەرێ ئەم هێزانە لەناکاو هەلیان کوتایە سەرهلال ئەو راپەری بۆ بەرانگاری و لەشەرا بەدیل گیرا ، پاش ئەوە بەدر گەرایەوە شاپور خواست ( الکامل ٩/٢١٣ ـ ٢١٦ کرمانشاهان باستان ١١٨ ) .. سوودی باوك وکور لەم تێکچوون ولەگەل یەك جەنگینەدا تەنیا ئەمانەبوو : گەنجینەکانی ولات بەتالان چوون، شارودێ لەژێر سمی ولاخی دوژمنا پێ شێلکرانە قەلاچوبوونی مرۆڤی کورد ، زال بوونی ئال بویەی دوژمنی پەنجاسالە بەسەر ولاتەکەدا ... تاد .

## ٥ ـ طاهری کوڕی هلال :

لەپێشا دیاردیمان بۆ ئەوەکرد کە هلال بەدیل‌گیراو فخر الملك سپای نارد بۆ شارەزوورو طاهری کوڕی هلال شالاوی کردە سەرسپاکەی‌و شکستی پێداو شارەزووری وەرگرتەوە ، ئنجا شمس الدولەی دەیلەمی کەلەوەبەر بە بەدری دەگوت : گەورەم = ! پەروەردگارم ! هەر کەسالی ٤٠٥ بەدر کوژرا ، جورقانی یەکانی کوژیاری بەدری پەناداو هەلی کوتایە سەر ولاتەکەی بۆ داگیرکردنی ، لەم حەلەدا « طاهری کوڕی هلال ) گەرچی لەبری باوکی سەرداری شارەزور بوو ، ( بەلام لەترسی بەدری باپیری ، خۆی حاشار دابوو ) ڕاپەڕی‌و چووەکژ شمس الدولە دا ، بەلام شکستی خواردو بەدیل گیرا و خرایەزیندان ، شمس الدولە هەرچی سامانی ئەوناوە بوو ڕای‌پێچاو تالانی کرد ، عێلە لوڕەکان‌و شازەنگانیەکان کەلەوەبەر لەپال بەدر دابوون هەمو خۆیان دایە پال « حسام الدولە ابو شوك کوڕی ابو الفتح محمد عیار » ، سولطان الدولەی بوەیهی کەبەمەی زانی هلالی لەزیندان دەرهێنا ( مجمل التواریخ نووسیویە ! لەزیندان هەلات‌و چووەلای سلطان الدولە ) سپایێکی خستەتەکی‌و ناردی بۆ ڕزگارکردنی ولاتەکەی باوکی لە چنگی « شمس الدولە » ، جالە مانگی ذی‌القعدەی هەمان سالا کەوتنەشەڕەوە ، هێزەکەی هلال چونکە هەمو دەیلەمی بوون

لەشەڕا هەڵاتن و هلال خۆی بە تەنیا مایەوە وبەدیل گیراوکوژرا.

مجمل التواريخ نووسیویە : درایەدەس « پولادوەندەکان لەخوێنی عبدالملك ماكان دا کوشتیان ..

ساڵی ٤٠٦ك شمس الدولە ویستی ولاتەکەی پتر پەرەپێبدات ،جا هەڵی کوتایە سەر ولاتەکانی ژێردەستی ابو شەوك و بۆداردەسی ناردی طاهری لەزیندان دەرهێناو سوێنی دا کەلەگەڵیا دۆستو دڵپاك بمێنێ تاسەر ، وهێزێکەوەبنێ ، بەمجۆرە طاهری بدری حەسەنوەیی لەگەڵ ابو شەوك عەیاری کەوتە شەڕەوەو لەیەکەم شەڕا شکا ، بەڵام طاهر وازی نەهێنا لەشکرێکی تری رێکخستو کەوتەوەشەڕەوە ، ئەمجارە « سعدی ابو الفتح محمدی برای ابو شەوك ابو الفتح» لەشەڕا کوژراو خود «ابو شەوك» هەڵاتو گەڕایەوە حەلەوان ، «ابو الحسن مزيدی اسدی» کە هاوسوێنی بوو هەوالی بۆنارد کە ئەگەر پێتەویستە کۆمەکو یارمەتی بۆبنێرێ ، بەڵام ابو شەوك هێزی شەڕی نەمابوو « طاهر » چوو لە « نەهرەوان » دانیشتو لەگەڵ « ابو شوك »دا رێككەوتو خوشکەکەشی خواستو دڵنیابوو حەسایەوە ، کە « ابو شەوك » زانی دڵنیایەو ترسی نەماوە لەهەلێکا هەڵی کوتایە سەری و لە تۆڵەی خوێنی سەعدیی برایا کوشتی ، یاروياوەرانی « طاهر » تەرمەکەیان برد بۆ بەغدا لە ( باب التين ) لەگۆڕستانی « قريش = امام موسا كاظم » ناشتیان ... ( مجمل التواريخ ٤٠٠ - ٤٠٤ والكامل ٩/٢٦١ ) .

## ٦ ـ بدر کوڕی طاهر :

لەماوەی ئەو سالآنەدا کەشەڕوشۆڕ لەناوا هەبوو ، وادیارە ئەم « بدر »ە بەسەرۆکایتی عێلو خێلەکانـەوە خەریكبـووە ولەشەڕوشۆڕو ڕامیاری بەدووربووە ؛ بـەلآم سالی ٤٣٨ك = ١٠٤٦زا لەپڕ ناوی هاتەناوان ، ئەوەبوو کە « ابراهیم ینال »ی برای « طوغرول بەگی سەلجوقی » کەلەگەلّ « عیار = عنـاز » یەکان لەشەڕابوو ، ئەم بەدرەی دانا بەفەرمانڕەوای قرمیسـین ( کرماشان ) بەلآم « مهلهلی کوڕی ابو الفتح محمد عیاری » ( عناز ) شالآوی کردە سەر « قرمیسین » و بەدر بەجێی هیشت. (قاموس الاعلام ب ١ لا ٥٣٦ پیتی (آ) نووسیویە ناوی «اینـال» بۆ یەکەم جار بەکارهاتووە . «غولام حوسین» لە دائرە المعارفی فارسیدا نووسیویە اینال برای دایکی‌ی سولطان طوغرولـە ؛ وشەی « اینال » واتا سەرداری عێل وتیرە .. بەلآم دوکتور حسام‌الدین نەقشبەندی لە زمانی « خوارزمی »یەوە نووسیویە: ناوەکە « ینال »ە هەروەك لـە الکامل‌دا هاتووە واتا جیگرەوە (و لی عهد ) باشە مالی ئاوابێ .

لەمەزیاتر دەربارەی ئەم بدرە هەوالی تری دەس‌نەکەوت ، بەلآم سالی ٤٣٩ك یـەکێکی‌ تری‌لـە نـەوەکانی بـەدری‌کوڕی حەسەنوەیهی لەقەلآی « سەرماژ » بووەومردووە ، پاش مردنی ئەو ئنجا ئیبراهیم‌اینال توانیویە « دژی سەرماژ »داگیربکـات ( الکامل ٥٣٩/٩ ) بێ‌گومان ئەمەیان بەدر نـەبووە چونکـە

« بەدر » وەك ڕابورد ، خود اینال هێنایە پێشەوە .. ناوی بنەماڵەی « حەسەنوەیهی » لەم ساڵە بەدداوە بزرئەبێ ، بەڵام لەشەرەفنامەدا لاپەڕە ٣٨٢ فارسی و ٣٠٧ تەرجمە عەرەبی خۆم گویا هلال کوڕی بەدر سێ کوڕی هەبووە دوای کوژرانی باوکیان لەلایەن شمس الدولە وە ، قەلفڕیان کردووە ، یەکێکیان چۆتە ناو « ئاکو »و یەکێکیان چۆتە ناو « برادوست » وسەرداریتی ئەو ناوەیان گرتۆتە دەست کەوابی فەرمانڕەوایێتی برادوست کەبۆتە دوولق : لقی ئورمی - برادوست »و لقی « صومای » لەلایەن وەچەکانی بنەماڵەی « حەسەنووەیهی » یەوە دامەزراوە ، بۆیە برادوستی یەکان خۆیان بەهەندێ لە تیرەکانی لقی گوران ئەزانن ، بەناوبانگترین سەردارانی ئەم دولقە فەرمانڕەوایە « شاە محمد »و « غازی قران » ونەوەکانیان بوون کەدەسەلاتیان تا هەزارەی دووەمی کۆچی ( شازدەیەمی ها . د . بەسیح ) هەر بەردەوامبوو ( شەرەفنامەی فارسی ٣٨٢ - ٣٨٥ و شەرەفنامەی عەرەبی تەرجەمەی خوم ٣٠٧ - ٣٠٩ ) . پاشان هەرلەم بنەماڵەیانە خانی لەپزێڕین هەڵکەوت کە خیوی شۆڕشی بەناوبانگی قەڵای « دمدم » .. ( بۆدرێژەی ئەمباسە سەرنجی فەرمانڕەوایی موکریان بدەن نووسینی من کەچاپ کراوە) علي محمد ساکی ش بنەماڵەی « برسق » دەباتەوە سەر حەسەنوەیهی وە دەڵێ : ئەم برسقە کوڕی بدری کوڕی حەسەنوەیهی یە ، ئەم بنەماڵەیە لە « ئالشتەر »ەوە تا نەهاوەند تا

« هەمەدانیان » لەژێر دەسابوو ، پاشانبوون بەفەرمانبەرانی سەلجوقی یەکانو تادامەزرانی فەرمانڕەوایی لوڕستان هەر ئەوان لەو ناوەدا فەرمانڕەوابوون ، لەوێ بەردەنوسێك دۆزراوەتەوە گوێا : هی برسقی ئەوەی ئەمبرسقەیە ( جغرافیای تأریخی وتاریخ لوڕستان ۳۷ ) من لامەوایە ئەمبیروبارەڕەی «علي ساکی» هەڵەیە چونکەناوی « برسق » تورکی‌یەو لەدەورانی غوزو سەلجوقی‌دا پەیدابووە ، پاش مردنی بەدر بەدەیانساڵ .. تەنانەت سەرچاوەیێکی ڕوون نیە کە پیا ڕابیەڕموێن .. ئەگەر لەوبارەوە سەرچاوەیێ هەبێ دەبێ برسق نەوەی ئەم بدرەبێ کەابراهیم ینالماوەیێ کردویە بەئەمیر ...

دیاردەیێکی سەیرە ! ، لەسەردەمی بەدر بەدواوە «تکنیە» لەناو سەرانی کوردا زۆر بووە ، وەکو « ابو عدنان » ، « ابو علاء » ، کە مرۆڤ ناتوانێ ناوەڕاستی یەکانیان بزانێ ، ئەم پەیڕەوی‌یە لە ڕێرەوی عەرەبی شتێکی ناشیرینە ، لەناوکوردا : تەنیا ژنبەمێردی ئەڵێت : « باوکی فلان ! » ئەمەش لەوێوە هاتووە ، کەعەرەب لەکۆنەوە ژنانیان ئەم « کنیە » یان بەکارهێناوە بۆجەخت لەسەر ئەوەی کەئەو منالە هی پیاوەکەیەو تهێنبڕی و دزەکاری لەتێوانا نیە ، ئەمە گەیوەتە ناوکوردیش ، بەلاّم ئەوەی کەپیاوێ بلێ « باوکی فلان » زۆر قۆڕە ، کە پیاوێکی ناسراو بەمناڵێکی هیشتا قنگ‌گواوی‌یەوە بناسێترێ ..

پاش ڕانەوەی دەسەلاّتی بەرزینی یەکان ( واتا : عەیشانی ـ حەسەنوەیهی ) ( ۳۰۰ ـ ۴۳۹ك ( ۹۱۲ ـ ۹۶۰ز ) کەروون

کرایەوە ، دینەودرو زۆر لەشارەکانی تری کەوتنە ژێردەسەڵاتی بنەماڵەی « عیاری = عنازی » کەسی سالی بەرایی دەسەڵاتیان ، فەرمانبەرو سەربە فەرمانڕەوایی حەسەنوەیهی بوون ، پاشان وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ فەرمانڕەواییانکرد ، هەر لە اسد ئابادەوە تا دەسکەرە (دەستگورد)ەوە تا مەندلی ( بندنیجین ) تا دقوقاء ( تاوغ )و خانیجار ( قەرەهەنجیر ) یان لەژێر دەستابوو ئێمە باسی فەرمانڕەوایی « عەیاری » ئەهێڵینەوە بۆسیبارەی « حەلەوانو فەرمانڕەوایانی » لەوێ درێژە بەباسیان ئەدرێ ..

باێینەوە سەرباسی ئەوەی کە دوکتور حسام‌الدینی نەقشبەندی جارێ « خانیجار » ئەکا بە « طوزخورماتو »و جارێك « خولەنجان » ، راستی‌یەکەی « خولەنجان » لەبنەڕەتا « خوێلانگا = جێی‌خوێ » بووە کەئەکا « طوزخانە » ئەم‌ناوە لەجێگەیێکی تریش لەکوردستانا هەرهەیە « خوێلێنەکەی مملحەی قەیتول»، بەڵام « خانی‌جار»=واتا شوین کانیاوی زۆر» ئەمەش هەرلایقەرە هەنجیر بەهەزارکانی ئاوئەبرێت کلدانی‌بەکان پیان‌وتووە « بیت نیقاطور » وئەکەوێتە باکوری کەرکوك بە دوورایی پێنج‌سات ( کلدوئاثور ادی‌شیر ج/۳ لاپەرە ٨٣ )

هەرێمی دینەومر تا شارە کە وێرانبووە، گەرچی دەوڵەتانی داگیرکاری وەك‌ئالبویە ، سەلجوقی ، مغول، تاتار، گورگانی، ئێلکانی جارجار داگیریان کردووە ، بەڵام دەسەڵاتیان تەنیا لەشارەکانا ڕەوابووە، دەرەوەی شارەکانو دووری‌شەقامەڕێ‌کان

هەموو بەنەس ئـەمیرانی ناوخۆییەوەبووەو لەلایەن خۆیانـەوە بەڕێوەبراوە ..

ســالّی ٥٢٩ك « ١١٣٤زا « دبیس کـــوڕی علـی مزیدی اسدی» کە بەبنەماڵە لەگەڵ سەرانی کوردا هاوسوێن‌و دۆستبوون، ولەسەرەتادا شاری « حله »یان پێکەوە لەگەڵ جاوانە کوردەکان دورست کردبوو ، ئەم‌پیاوە کەزۆرجار هەرێمـەکانی سەربـە خەلیفە «المسترشد بالله »ی تالاّن ئەکرد بیستی سلطان مسعودی ساجوقی بڕیاری داوە شالاّو بکاتە سەر بەغدا ؛ چونکە خەلیفە نایەوێ وتاری هەینی ( خطبة جمعه ) بەناویەوە بخوێنرێتەوەو ، بەسلطان بناسرێ ... خەلیفـەش کەئـەم هەوالـەی بیستبوو سپای تەیارکردبوو بۆ بەرانگـاریی ، هـەردوولـەشـکر لـــە هەرێمی دینەوەر تەقین‌بەیەکا ؛ سەربازەکانی خەلیفە تورك‌بوون هەموو هەلاّتبوون بۆناو سپای سلطان‌و خەلیفە لەشەڕا شکستی خواردبـوو بـەدیل گیررابوو ( تاریـخ گوزیدە ٣٥٩ وتجارب السلف ٢٩٤ ) .

سالی ٥٦٣ = ١٦١٠زا ) تورکمانەکـانی ئیوائی ســەر بـە « پەرچەم » و «سلیمان شای» کوڕی زۆر جار هەڵیان کرتاوەتە سەر ولاّتی چیا ( هەمەدان ـدینەوەر ) ، سەر ئەنجام ئەوەبوکە « جلال‌الدین خوارزم شاه » هەڵی کوتایە سەریان وقەلاّچوی کردن وهەموویانی لەناوبرد ( جهان گوشای جوەینـی ٣/٤٥٣ )

سـالی ٥٩٠ك = ١١٩٣زا سـلطان عـلاء الدولـە تکش بڕیاری‌دا ڕووبکاتە عراق ، خەلیفەی عباسی « الناصر لدین الله »

مجدالدین قصابی وەزیری خۆیی‌نارد بۆ وتووێژ کردن لەگەڵی‌و، بۆ بەئاشتی بڕینەوەی نیازو ڕێك‌کەوتن ، وەزیر کە گەیە « اسد ئاباد » وسەرانی کوردی ئەوناوە هاتن بەپیری‌یەوەو لێی‌کۆبوونەوە بای لەخۆباییتی چوو بەلووتیاو خۆی لیّ‌گوڕاو کەوتە هەوسی ئەوەی کە « سلطان علاء » بێتە پیری ئەوەوە . ئەم ئارەزووەی خۆیی بەدزی‌یەوە لای هەندێ لەدەوروبەری درکاندبوو کەبگاتە سلطان ، هەرکەئەم هەواڵە درابوو بەگوێی سلطانا ڕقی هەستابوو ودوستوری دابوو کەسپا تەیاربێت وبجمێت وپێش‌بکەوێ، کە وەزیر دۆنگەی جمانی سپای کردبوو، هەستی بەکاری هەڵەی خۆی‌کردبوو ، دوو پێی هەبوو دووی‌تریشی قەرزکرد وبەرەودووا هەڵات‌و سپای تەکش تا « دینەوەر » پێشکەوت ( جهان گوشای جوینی ۳/۳۳ ) .

لەنێوانی ساڵانی ٦١٥ ٧٩٥ك = ١٢١٨ - ١٣٩٢ز دا واتا سەردەمانی مغول تاتار لەجەنگیزەوەتا هولاکو وتاپاشماوەکانی ابو سعید گورگان چونکە کوشتارو تاڵان‌کردن‌و خرابکاری هەمو ایران‌و کوردستان‌و عراق‌و جی‌یانی تری هەمو گرتبووەوە ئیتر جێی باسی « دینەوەر »و هەریمی چیا بەجۆرێکی تایبەتی نەماوە ، بەڵام لەساڵی ٧٩٥ك بەدواوە کەکوڕانی تەیموری لەنگ بە پێشداریی سپا گەیشتنە قەزوین - سلطانیە ، ودەبوو بەرەوبەغدا شاڵاوبکەن ، پەیك لەلایەن تەیمورەوە گەیشتە « ئەمیرزادە محمد سلطان‌و ئەمیرزادە پیرمحمد » کەروو بکەنە « چم‌چماڵ » ، جاکەگەیشتنە دەوروبەری « سونقور » دمغل‌و

دانی ئەوناوەیان دایە دەرخواردی ڕەوەی چارەوا کانیسپا ،
بۆسبەینێ کەدەبوو سپا بچێت بەرەوبەغدا هەواڵهات
کەکوردەکانی کوردستان ( بێگومان مەبەستی کوردستانی
ئەردەلانی ئەوحەلەیە کەلەودەمانەدا ، دەولەتێکی بەهێزو
سەربەخۆبوو داگیرکاران بەدزو جەردەیان ئەدانە قەلەم ) یاخی
بوون، دەبێ بچن ئەوناوە لە پیاو خراپ وڕێگرو دزو درۆزن
پاك بکەنەوە ؟! جا کە گەیشتنە « چمچمال » ویستوون ،
ئیتر ئەم سەردارانە «سونجكبەهادر ، تەیمور خواجە ، ئاق‌بوغا،
مبشربەهادر » بەلەشکری سوارەوە شالاویان کرد بەرەو
کوردستانو شازادەکانیش ڕویان کردە دمربەندی « تاشی‌خاتون
= تاج‌خاتون» ، کە گەیشتنە ئەوێ یەکێك لە سەردارانی کورد
هەر بۆئەوەی خۆی بخاتە بەرچاو هاتەلای شازادەکان وتی :
من لە هەمو کەس باشتر شارەزای ئەم ڕێگا یا نەم وئامادەم ڕێ
نومایتان بکەمو ببم بەپێشەنگتان ، ئەمیر زادە محمد سلطان
ڕووی‌دایەو خێراتنی کردو شمشیرو کەمەربەندی زێری خەلاتی
دایێ ودوستوریدا بەشیخ علي بەهادر هێزێك ڕێك‌بخات
ولەگەلیا بڕوات ، ئالەم کاتەدا « ئیبراهیم شا »ی کورد
کەلەسەرداره گەورەکانی کوردبوو هاتەپیشوازیو بەنەوینی
وفەرمانبەری خۆیی نیشانداو کوڕەکەشی کەناوی « سلطان
شاه » بوو بەدیاریو دەهەنەوە گەیشت کەدیاریەکان
بریتی‌بوو لە چەندئەسپ وشتی گرانبەهای تر ، هەرکە سەردار
ئیبراهیم گەیشت «ئەمیرزادە محمد سلطان» پەیکی نارد بەدوای

«شیخ علي بەهادر »دا کەشالاو نەکاتو بگەڕێتەوە .
لە گەڕانەوەدا ئێوارانێ کە خەریکی شێو خواردن بوون .
ئەوکابرا کوردەی کەخۆی کردبوو بەپێشەنگو لەئەنجامی
کارەکەی نائومید بوو زانیبووی کە ئیتر دەسەلاتی
بەرناکەوێ ، لەپڕ هەڵی کوتایە سەر « شیخ علي بەهادر »و
دایە بەر شمشێرو دەربەڕیو خۆی لەدەستهێزەکان رزگارکرد .
پاش ئەم بەزمە خود «تەیمورلەنگ دوستوری دا هەڵکوتنە سەر
کوردستان ، جا ئەمیرزادە محمد سلطان روی کردە چیاکانی
کوردستانو خەڵکێکی زۆری کوشتو گەلێ گوندو ئاوایی
سوتاندو شاری وێرانکرد ولەیەکێ لەچیاکانا کە هەزاران کەس
خۆیان قایم کردبوو ، گەمارۆیان دانو ٧٠٠ کەسیان لەلوتکەی
کێوەکانەوە هەڵدایە خوارەوە « ظفەرنامە ٢٣١ ، ٣٤٥ ، ٢٤٦ »
نزیکەی دووسالی رەبەق ئەمیر تەیمور گورگان بەوێرانکاریی
کوردستان وکوشتارو تالان کردن وسوتاندنی ولاتەکە
خەریك‌بوو ، نە دینەوەر مایەوە نەشارەزورو نەشارانی تری
کەدەستی پێی گەیی ونە حەلەوان هەموی وێرانکرد .. زۆر
سەیرە « کلاویخو » بەم جانەوەرە گەلێ : « سولطانی
دادگوستەر » ..

سالی ٨٠٥ك =١٤٠٣زا تەیمور فەرمانیدا بە « ئەمیرزادە
روستەم » کە بودەسگیر کردنی « قەرەیوسف » روبکاتە بەغدا
وبینێ بەکۆمەك‌و یاریدەری « ئەمیرزادە ئەبوبەکر » هەروا
فەرمانی دا بە « توکل ئەرەس بوغا » لەهەمەدانەوە و « تومان

سوجی » لەنەهاوەندەوە شاهزادە « روستەم » لە « سونقور » وِدینەوەرەوە بکەونەتەکی ( ظەفەرنامە ٤٣٥ ) ٠

ئەمیر تەیمور خۆشی بەدینەوەرا دەهات بەلاّم بەکرماشانا خۆشی نەدەهات ، ( کرمانشاهان باستان ١٢٥ ) ٠٠

من لام وایە سەرچاوەی ئەمباسە ڕاست ناکات چونکە شاری دینەوەری وێران کردبوو پاش ئەوە هێزەکانی تەیمور جارێکی تریش وەك ئەودوای ولاّتی کورد دەستی ویرانکارانەی پیِا هێنا ( دائرە المعارف الاسلامیة باسی دینەوەر ( ٣٧٤/٥ )

بالێرەدا وەکو ئەڵێن دواگولاّو « مسك الختام » سەم کارەپیاوانەیانەی هەندێ کورد بۆشانازی بەگەلاّلەیی تۆمار بکەم :

١ ـ سەردارێکی کورد بەمەبەستی ئەوەی تۆلە لە لەشکری دوژمن بکاتەوە بەئامانجی سەرنگوم کردنیانو ، لەناوبردنیان ، خۆی ئەکا بەپێشەنگ ، بەلاّم « ئیبراهیم پاشای کورد کەناوێری نەبەزانە خۆی ڕاگرێو بەرانگاری بکات ، داوەکەی هەڵئەوەشێنێتەوە ، بەلاّم دیسان سەرکردەی لەشکری دوژمن کەللە پاچەئەکاتو بەناوجەرگی هێزی دوژمنا دربەڕیچکەی پاسەوانان ئەداتو بۆیدەرئەچێ !! خۆزگا « علی بەزدی » ناوی ئەمقارەمانەی تۆمار ئەکرد : کە ( شیخ علی بهادر »ی کوشت !

٢ ــ هەرلەم شالآوەی تەیموری لەتگدا کوردێکی پیاو خۆی لەقەڵای « طوزخورماتوو »دا لەبوسە ئەداو بەتیرێ « شاهزادە عومەر شێخ تەیمور » ئەپلکێنێتەوە ..

٣ ــ هەروا « دەرویش احمدی لوری فەرەنجی لەبەر » بەناوی ئەوەی کە سکاڵانامە ئەداتە دەست « شاهرۆخی کوڕی تەیموری لەنگ » کەلەبەردەستیدا ئەوەستێ لەناکاو خەنجەرەکەی هەڵئەکێشێ وئەیداتە بەرخەنجەر ...

٤ ــ لەمەبەریش وتمان : شوانێکی کوردی دەوری شاری کوت « بوجگومی » سەردارسپای دەورانی خەلیفەی عەباسی چۆن بەتیرێ جەرگ بڕی !! .

( ظەفەرنامە ٢٥٣ ، احسن التواریخ ١١/٩٢ ــ ٩٤ ) .

## « زانایانو ئەدیبانو شێخانو دەروێشانی بەناوبانگی دینەوەرو هەرێمەکـەی :

### ١ ـ عبدالله حسن دینەوەری :

یەکێ‌بووە لـەهاودەمانی امام حســن کـوڕی امامی علــي (خ•خ)و پرسیاری لێ‌کردووە : ئەی امام ! ئەتوانم جاریەیێکـی دەنـگ‌خۆش بکڕم کەبەکرێ گۆرانی بلێ بۆ خەڵك‌و بەوپارەیـە ژیانی خاوو خیزانم بە سەربیەم ، فەرموی تەنها گورانی‌یەکانی وشـەی خراپی گوناهکارانـە نەبێت باسی نیـە ( برهان الحـق لاپـەڕە ٣٧ ) بـەڵام نـاوی سـەرچاوەی نـەبردووە ، وبـاوەڕ ناکەم‌زانایانی شیعە ئەم فەرمودەیە بەڕاست‌بزانن ..

### ٢ ـ ابن قتیبەی دینەوەری :

ابو عبدالله محمد کوڕی مسلم کوڕی قتیبەی مەروەزیی دینەوەری : ساڵی ٢١٣ك = ٨٢٨ز لەسـەرەتای مانگی رەجبـدا لەدینەوەر لەدایك‌بووە ؛ پاش هەڵچوون باوکی خستوویەتی‌یە قوتابخانەو فێری بەرایی خوێندەواری بووە ، کەقۆناغێکی باشی لەخوێندنا بڕیوە چووەتە بەغدا ، ئنجاکوفە ، بـەصرە ، ولـەم شارانەدا لەلای زانایانی بەناوبانگ‌و گەورەمەلایان خوێندوویە، زانستە ئیسلامی‌یەکانی تەواوکردومو هەر لەبەغدا دەسی داوەتە

دەرس وتنەومو هاتوچوکردنی لای زانایانی زانستیو کەوتــە فێربوونی فەلسەفە وکەلامو ئەدەبو مێژو ، ولــەم زانستانـەدا بەجۆرێکی باش شارەزا بوو ، لەناومەلاو قوتابیەکـانا ناسراو ناوبانگی بەرزبووەوە ،قوتابخانەکەی بووە قیبلــەی فەقێیـانو ئەدیبانو هونەرمەندان، ئەوخۆی گەرچی بە پەیڕەوی قوتابخانەی نەحویبەصرە ئەدایەقەڵەم لــەڕووی زانستیعـەرەبیو ئــەدەبی یەوە ، بەڵام زۆرجار بیروڕای قوتابخانەی کوفــەی بەباشتــر دائەناو پەسەند ئەکرد، وجارجارە هەردوڕایەکەی تێکەڵئەکرد، و لەگەڵ ئەوەشا کەزبانی مادەرزادی « ابن قتیبە » کوردی بوو ، بەڵام لەئەدەبی عەرەبیدا ئەوەندە شارەزاو کارەما بووکــە ئــەو ڕینموونی نووسەرانو ئەدیبانی ئەکرد ، بۆ دەستاوێز وبەلگــە کتێبی «ادب الكاتب» چاترین نمونەیە . ابن قتیبە لەزۆرتریــن جۆری زانستا قەڵەمی خــستۆتەکارو کتێبی نووسیوە ، ژمارەی دانراوەکانی لەچل تێپەڕیوە ، ئێمە ئەمناوانــە تۆمــار ئەکەیــن کەمێژوونووسان جەختیان لەسەر کردووە !

١ ــ كتاب معاني الشعر دوازدە باسی جیا جیایە

٢ ــ عیون الاخبار دەباسی جیاجیایە

٣ ــ عیون الشعر دەباسی جیاجیایە

٤ ــ كتاب التقفیە ابن الندیم وتویە : ( ئەم کتێبە لەکتێبەکــەی بەندەنیجی زلترە وتەنها سێ بەرگی لێ دیوە )

٥ ــ كتاب الشعر والشعراء دووبەرگە

٦ ــ كتاب ادب الكاتب

٧ - كتاب الحكاية والمحكي
٨ - كتاب الخيل
٩ - كتاب جامع النحو
١٠- كتاب مختلف الحديث
١١- كتاب اعراب القرآن
١٢- كتاب ديوان الكتاب
١٣- كتاب قراء الدور
١٤- كتاب خلق الانسان
١٥- كتاب القراءات
١٦- كتاب المراتب والمراقب من عيون الشعر
١٧- كتاب التسوية بين العرب والعجم
١٨- كتاب الانواء
١٩- كتاب مشكل القرآن
٢٠- كتاب دلائل النبوة
٢١- كتاب اختلاف تاويل الاحاديث
٢٢- كتاب المعارف في التاريخ
٢٣- كتاب جامع الفقه
٢٤- كتاب اصلاح غلط ابي عبيدة
٢٥- كتاب المسائل والجوابات
٢٦- كتاب العلم
٢٧- كتاب الميسر والقداح
٢٨- كتاب حكم الامثال

٢٩ـ كتاب الاشربـة
٣٠ـ كتاب جامع النحو الصغير
٣١ـ كتاب الرد على المشبهة
٣٢ـ كتاب آداب العشرة
٣٣ـ كتاب غريب القرآن الكريم
٣٤ـ كتاب غريب الحديث
٣٥ـ كتاب انساب الاكراد
٣٦ـ كتاب الرد على الشعوبيـة
٣٧ـ كتاب تفضيل العرب على العجم
٣٨ـ كتاب البلدان
٣٩ـ كتاب الصيام

هەرواگەلێ کتێبـی تری کـەمێژونووسـان دەربارەیـان بیروڕایان یەك‌ناگرێت • بەڵێ ! ابن قتیبە لەبەغـدا جێگەیێکـی دیاری وپایەیێکی بەرزی وەرگرت لەبەرئەوە بەغیلی پێ‌برا ، کە کتێبی « التسویـە بین العـرب والعجم »ی نووسی بەتاوانـی شـعوبیێتی تـاوانبار کـراو لـەسـەر ئـەمـەتووشی ئـازارو چەرمەسەرێ‌بوو ، تارادەیێ کە بە زندیقو بێ‌دین ناوئـەبرا ، لەم‌ناوو ناتۆرەیانە زۆر ئازوردەو دلگیربوو ، بەغدای بـەجێ هێشتو گەڕایەوە دینەوەر ولەوێ بەپایەی قاضیێتی ساڵەهای ساڵمـاـەوە ، هەرجـەندە بیرونی لـە « الاثار الباقیـة ٢٣٨ »دا سەرزنشێکی ابن قتیبە دەکاو دایئەشورێ لەسەر ئەوەی لەکتێبی « تفضیل العرب علی العجم »دا زۆر بەسەرو پۆتەلاکی عەرەبـدا

هاتووەو ، هەلّی ناون ، چاپووکانە بەناوی چاپی ناوی ئەبـاو ئەمەدەقی قسەکەیتی : « وان کان ابو محمد عبدالله بن مسلم بن قتیبه الجبلی یهول ویطول في جمیع کتبه ، وخاصة في کتابه في تفضیل العرب علی العجم ... الخ ... » جا لەگەلّ ئـەم ناتۆردیـەی « بیرونی » مـن ، وەکو زۆر لـەمێژوو نووسـان لاموایە دوو کتێبی « الرد علی الشعوبیه وفضـل العرب علـی العجم » هي ئەونین ، ئەگەرهی ئەوبوایەن ، لەبەغدا شاربەدەر نەئەکرا ... هـەروا ئـەوەی کـە « ابن ندیم » نووسـیوبـە ! « نازناوی دینەوەری کەنووساوە بە « ابن قتیبـەوە » لـەبەر ئەوەیە کە ماوەیێکی زۆر لەوێ قاضی بووە » وادییارە کە ابن ندیم لەبیری چووە کە قتیبەی باپیری « عبدالله کوڕی مسلم کوڕی قتیبه » لەدینەوەرەوە باری کردۆتە شـاری « مـەرو » ولەوێ بەمەروەزی ناوبراوە وپاشان هاتۆتـە کوفـە ، وگویا « عبدالله » لـە کوفـە لـەدایك بـووە بـەلاّم دیسان نازناوی « دینەوەری »یان هەرپاراستووە ..

ابـن قتیبـە نووسینی کتێبی « الامامـە والسیاسة »شـی ئەدرێتەپالّ ، ئەگەر راستبێ ئەوکتێبە نووسراوی ئـەوبێت ، دەبێ ئەوەی کاتێ نووسیبێت کە لەبەغداوە گەڕاوەتـەوە بـۆ دینەوەر لەڕقی ئـەوەی کەبە زنـدیقوبێ دین ناتـۆرەی بـۆ هـەلبـەستراوە .. مێـژونووسـان هـەروەك دەربارەی کـەی لەدایكبوونی ؟ ناڕێکن ، هەروا دەربارەی مردنیشی قسەیـان یەك ناگرێت گوایە لەیەکێ لەم سالاّنەدا ( ٢٧٠ ، ٢٧١ ، ٢٧٦ ، ك

= ٨٨٣ ، ٨٨٤ ، ٨٨٩ز ) بـەمەرگی لـەپر ( فجأة ) مردووەو لەکوفە لەتەنیشت گۆری ابو حازم القاضیەوە نێژراوە (فهرست ابن ندیم ١٣٠ تـەرجمەی فارسـی ، الکامل ٤٣٨/٧ ، المنتظم ، وفیات الاعیان ، الاعلام زرکلي ، دائرة المعارف اسلامي و ..)

## ٢ ـ ابو حنیفەی دینەوەری :

احـمـد کـوڕی داوود کـوڕیوەنـەندی دینـەوەری ، لەسەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچیدا لەشاری دینەوەر هاتۆتە دنیاوە وهەرلەوێ سەردەمی منداڵیو گەنجی بەسـەربردووەو ، فێری خوێندن بووەو زانستـە سـەرەتاییەکانـی خوێنـدووەو زانستـەئایینـی یەکـانـی تـر فێـر بووە، پاشـان ڕوی کردۆتـە بەغـداو شـارانی کوفـەو لە بەصـرە بـۆ خوێنـدنی باڵا ، لـەوێ ئـەدەبومێژوو بـەشی فەلسەفــەو بـەلاغـەی لای « ابن السکیت » وەلایانیتری خوێندووە ، ولەوێوە چۆتە « مەدینەی منوره » و « بیت المقدس » وهەرێـسـەکانی کناری کەنداو . سالی ٢٣٥ك = ٨٤٩ز لەتەمەنی ٢٥ سالیدا چووەتە ئەصفەهانو لەوێ رەسەدخانەی داناوەو کەوتوتە لێکۆڵینەوەی بارودۆخـی ئەستێرەکـانو چـۆنسوڕانیـان ، جگەلـەوە، لـە زانستەکانی گیانلەبەر ناسیو کەش گۆڕان ناسییو گیاناسـیو نحوصەرفدا پسپۆڕی تەواوبووەو زانایان ئەویان بەهاوشانـی « جاحظ » داناوە ، لەمێژو زانیشدا بەدەسەڵاتبووە بەشێکی

زۆری کتێبەکەی ( الاخبار الطوال )ی تەرخانکردووە بۆباسی بەسەرهاتی پادشایانی دێرین و کۆن ..

بەڵی ! ابو حنیفه نووسەرێکی مەزنبووە ، گەلێك کتێبی داناوە ، مێژوونووسان لەبارەی ناوی هەندێ لەکتێبەکانیەوە نارێکن لەبەرئەوە ئێمە تەنیا ناوی ئەوکتێبانە تۆمار ئەکەین کەهەمویان رێکن لەسەر ناویان :

١ ـ تفسیر القرآن الکریم ١٣ بەرگ
٢ ـ الوصایا في احکام المیراث
٣ ـ الشعر والشعراء
٤ ـ الاخبار الطوال في التاریخ من بدء الخلقة حتی سنه ٢٢٧هـ = ٨٣٣م
٥ ـ اصلاح المنطق
٦ ـ حساب الدور والعول
٧ ـ جواهر العلم
٨ ـ نوادر الجبر
٩ ـ الجبر والمقابلة
١٠ـ الجمع والتفریق
١١ـ البحث في حساب الهند
١٢ـ النبات
١٣ـ کتاب الوصایا
١٤ـ الفصاحة
١٥ـ الانواء

١٦- الرد على رصد الاصفهاني
١٧- كتاب البيان
١٨- رسالة الطب
١٩- القبلة والزوال
٢٠- كتاب البلدان ( الكبير )
٢١- كتاب الزيج
٢٢- كتاب ما يلحن فيه العامـة
٢٣- كتاب في حساب الخطأين
٢٤- كتاب الباه
٢٥- النباتات التي تؤكل ثمارها

گویا ابو حنیفە لەلایەن رکن الدولەی بوەیهی یـەوە بانگ کراوەتە ئەصفەهانو لەوێ رەسەدخانەی دوروست کردووەو ، بە هەستێرەناسی یەوە خەویـك بـووە وتزیکـەی حـەفتا سـالێ ژیاوە ، مێژونوسان کاتی مەرگی ئەویـان بەچاکـی نەزانیـوە ( ٢٨١ - ٢٨٢ - ٢٩٩ك = ٨٩٤ - ٨٩٥ - ٩١١ )کە کەیمردووە ( فهرست ابن ندیم ١٣٢ ، الکامل ٧/٤٧٥ ، الاعلام زرکلي ١/ ١١٩ ، وپێشەکیی کتیبی الاخبار الطوال تەرجمەی فارسی صادق نشأت )

**٤ - ابو علي دینەوەری :**

احمد کوڕی جعفر هەر لە دینەوەر لەدایـك‌بووەو لـەوێ فراژیبووەو نراوەتە بەر خوێندن ولـەقوتابخانـەدا سەرەتـای

زانیاری خوێندووەو چووەبۆ « بەصرە » لایزانای گەورە « مازنی » بەشێ لەکتێبەکەی سیبەوەیهی خوێندووە ، پاشان چووەتە بەغداو لەوێ چووەتە حەلقەی دەرسی « مبرد »ەوە ، لای ئەو بۆجاری دووەم کتێبەکەی « سیبویهی » خوێندووە ، ئنجا ژنی خواستووە : ( کچەکەی « ثعلب » ) بەلام لای ئەونەیخوێندووە ، کەلێی پرسراوە بۆچ لەلای خەزورت ناخوێنی ؟! وتویە : « مبرد » لای ئەو ماموستایانە خوێندوویە کەخۆیان قوتابی سیبویهی بوون ، بەلام « ثعلب »بە مەتالا کتێبەکەی خوێندۆتەوە .. ئەم احمدە پاش ئەوەی سالەها بەخوێندنو دەرس وتنەوە خەریك‌بووە ، ڕووی کردۆتە میصر لەوێ کتێبی « المهذب »ی داناوە دەربارەی زانستی نحوی عربی ، ولەپێشەکی یەکەیا دیاردی بۆ نووبەرەکی بیروبارەڕی مەلایانی هەرێمی بەصرەو مەلایانی کوفە کردووە ، هەرباسێکی نووسیبێ دیاردی کردووە کە هی‌کام لایانە ! بەلام دیاردی بۆهۆی دووبەرەکی‌ی‌ئەو مەلایانە لەسەرباسەکە نەکردووە، پاش ماوەیێ دوبارە چاوێکی گێڕاوەتەوە بەکتێبەکەی خۆیاو داویە لەبێژنگو لەهەلە وئاڕێکی خاوێنی کردۆتەوەو ، پێشەکیەکەی لابردووە وبیروڕای بەصریەکانی بەچاتر داوەتە قەلەم ، ولەم کارەیا ڕایبەڕمووە بە کتێبەکەی « اخفش »ی ناوەنجی دا کەناوی « سعید کوری مسعد » بووە جگەلەوە کتێکی تریشی داناوە دەربارەی بۆناوەکانی ( ضمائر ) ناوقورئان ، لەمەشا ڕایەڕمووە بەکتێبی « معانی »ی فراء دا

هەروا کتێبێکی تری داناوە بەناوی « اصلاح المنطق » ،
هەرکەیستوویە « اخفش بچووك علی کوڕی سلیمان »
ڕووی کردۆتە مصر ، ئەومصری بەجێ هێشتووەو
گەڕاوەتەوە بۆعراق ، تا « اخفش » لەمصر گەڕاوەتەوە ئنجا
چووەتەوە بۆمصر ولەوێ کراوە بەقاضیو، تامردنی
سالی۲۸۱ك = ۹۰۲زا هەر قاضی بووە ( معجم الادباء
۲۳۹/۲ ، الاعلام زرکلی ۱۰۲/۱ ، فەرهەنگی دیهخودا ۱۱٤٥
پیتی ( أ )

## ٥ ـ شیخ ممشادی دینەوەری :

یەکێکەلە صوفیە ( دەرویشە ) هەرەبەناوبانگەکانی
ولات ، ولەشێخانی گەورە ، هاوشانو هاوتای شیخ جونەیدی
بەغدادی (نەهاوەندی) بووە، دەربارەی باسی کەراماتی لە سەر
گوزەشتەکانا زور نووسراوە، ئێمە کارمانبەوەوە نیە ، سالی
مردلی بەراستی نەزانراوە (۲۹۷، ۲۹۸، ۲۹۹ك=۹۰۹، ۹۱، ۹۱۱زا)
( طبقات شعرانی ۱۰۱/۱ ، نفحات الانس جامی ۹۲ ، تأریخ
گوزیدە ٦٤٧ )

## ٦ ـ علي دینەوەری

کوڕی محمد کوڕی نەصر : لەسالانی ۳۱۲دا ناوی هاتووە
کەمەلای چاك بووە وزۆر کەس لایان خوێندووە ( المنتظم ٦/
١٤٠ ـ ١٨٧ ) .

### ٧ ـ کسائي دینەوەری :

ابو بکر ، خەڵکی کوهستا نی عراقە، پاش هەڵچوون وبارِ بـوون‌و تـەواوکردنی خوێندەواری خووی‌داوەتـە دەروێشـی وصۆفیتی ورێورەوشتی خودا ناسین ، ولای‌زور لەشێخانی سەردەم بـۆ فێربوون ماوەتـەوە ، پاشـان چووەتـەلای شـێخ جونـەیدی نەهاوەندی ( بەغدادی ) کەبە « سـید الطائفـە » ناوی ڕۆیشتووە ، لای‌ئەو ماوەتەوە ، کـەشێخ چووەبۆ حـج ( سێ‌جارلەسەریەک ) ئەم لەبەغدا لەجێی دانیشتووە تامردووە ، شیخ جونەید زۆری خۆش‌ویستوە، ئەو بەرلە شێخ جونەیـد مردووە بەڵام نەنووسراوە چ سالی . (نفحات الانس جامی ١٢٧)

### ٨ ـ ابو بکری دینەوەری :

کـوڕی احمـد کـوڕی مروان کوڕی مهـرانی مالکی ی دینەودری . لەفەرمایشتەوانەکانی بەناوبانگە ، بەزبانی فارسـی کتیبێکی لەمێژووانووسیوە ، چەند سالێ لە ولاتی مصر لەشاری « قولزوم » ژیاوە کەبەسەر زریەی سوورەوەیە ولەوێ قاضـی بووە ، پاشـــان بووە بـــەقاضـــی شـــاری « أســـوان » ، زۆر کتێبـــی دانـاوە ، ( المجالســـە وجـواهـــر العلـــم کتیبێکی ٣٠ بەرگی‌بووە ، بەرگی ٢٦ لەکتیبخانەی ظاهریـەدا ماوە ـ الرد علی الشافعي ، مناقب مالك ، محاسن النوادر والاثار ٢٥ بـەرگ‌بـووە .. المجالسـە ڕوونوسـێکی لـەکتیبخانـەی ئاياصـوفیـاش لەئیستـانبـول هەیـە ئـەمزانایـە سـالی ٣٣٣

( وهـەندێوتویانـــە ٣١٠ك ) ٩٤٤ز ا ( وەیـا ٩٢٢ ) مردووە .
( اعـلام زرکلي ٢٤١/١ ، کشـــف الظنـون ١٥١/٣ ، الحـــدم المخطوطات گورگیس عواد ١٩٩ )

٩ - ابو حفص دینەوەری :

عمر کوڕی سهل کوڕی اسماعیل دینـەوەری کرماشـانی ( قرمیسیني ) یـەکێ بووە لەزانا نـاسـراوەکان پـاش ژیانێکی دوورودرێژ لەدینەوەر ئنجاچووەتـە کرماشانو ماوایێ لـــەوێ ماوەتــــەوە وخـوێندەواری بڵاو کـردوتـەوە ، وبـەدانانـی کتێبسەرگەرمبووە ، لەزانستی فەرمایشتا گەلێ کتێبی دانـاوە سالی ٣٣٠ك ٩٤١١ز ا بەمەرگی خوایی مردووە ( هدیة العارفین ٣٨١/١ )

١٠- ابو جعفری دینەوەری :

احمـد کـوڕی عبدالله کـوڕی مسلم کـوڕی قتیبـەی دینەوەری ، یەکێبووە لەزانایانو ئەدیبان لەبەغدا لەدایکبووە ، لای ابن قتیبـەی باوکی قورئانو ئەدەبـو مێژووی خوێندووە ، « ٢١ » کتێبی لـەنووسراوەکانی باوکی لـەبەربووە ، وماوەیێ لەبەغداقاضی بووە وکتیبەکانی باوکیشی بـەدەرس وتوتـەوە ، پاشان سالی ٣٢١ك چوەتە مصر لـەوێ زۆرکـەس ســوودیان لە بەری زانستی ئەو وەرگرتووە ، قوتابیەکی زۆر لە هەڵقەی دەرسی ئەوا کۆبووەتەوە سالی ٣٢٢ك = ٩٤٣ز ا کۆچی دوایی

کردووەو هەرلەوێ نێژراوە . ( وفيات الاعيان ۱/۲۵۱ الاعلام زركلي ۱/۱٤۹ ، فەرهەنگی دیهخودا پیتی ( أ )

**۱۱- ابو بکری ضرابی دینەوەری :**

ابو بکر احمد پاش خوێندنی بەرایی وفێربوونی زانستی سەرەتایی شاری دینەوەری بەجێ هێشتووەو چووەتەبەغدا لەوێ دەستی کردووە بەفێربوونی زانستی فەرمایشت و مێژووی وپاشان کەوتوتە دەرس وتنەوە وسوودوبەهرەی زانینی خۆی بەسەرقوتابی یانا پەخشیوە ، تاسالی ۳۸۲ك = ۹۳۹ز لەبەغدا مردووە ( تاريخ بغداد ٤۲۷ )

**۱۲- ابو الحسن دینەوەری :**

علي کوڕی عبدالله سالی ۳۲۸ی قاضی بووە ، ئیترتەرجمەی ژیانی نازانرێ . ( المنتظم ۳۱۵/٦ )

**۱۲- ابو الحسن دینەوەری :**

علي کوڕی محمد کوڕی سهلی زەرنیگەر ( صائغ ) لەشاری دینەوەر لەدایك بووەوە ، هەرلەوێ گەوردبووە پاش خوێندنی سەرەتایی لەلای شیخ ابو جعفر صیدلانی بۆتەفەقی وپاش خوێندنی ئامادەیی سالی ۳۳۱ك = دینەوەری بەجێ هێشتووەو چووەتە مصر ، کەدەورانی فەرمانڕەوایی « ئیخشید » بووە ، لەوێ ماوەتەوە سالی ۳۳۱ - یا - ۳۳۳ك =

٩٤٣ یا ٩٤٤زا مردووه ، ابن جوزي لـه المنتظم دا ( ٦/٣٦٨ )
ـنتێکی سـەیری نووسیوه ـ کـەهەرچـەند لـەقسەی پیاوی
خـوێندەواروزانا نـاچێت وتـەنیا لـەپڕوپـوچی دەروێشـی
کوردستانەوه نزیکه ، بەڵام‌ئێمه هەر ئەیگێڕینەوه : « مەمشادی
دینەوەری صـوفیی بـەناوبانگ وتویـه : ڕۆژێکیان بـەبیابانا
ئەگەڕام سەرنجم‌دا هەڵوێی باڵەکـانی کـردۆتـەوەو لـەنگـەری
بەستووه ناجۆڵێ لەودۆخه سەرم سووڕمـا چووم بـەرەولای
سـەرنجم‌دا کەسیبەری لـه ( ابو الحسـن صـائغ ) کـردووه ،
کەلەوکاتەدا ! خەریکی نوێژبوو ( تاریخ گوزیده ٦٥٣ ، نامەی
دانشوران ناصری ١٣٥ حلیة الاولیاء ١٠/٣٥٣، نفحات الانس
جامی ١٦٢ .

**١٤ـ عباس کوڕی هەیثەمی کوڕی بزورك میهر (بزرجمهر)ی دینەوەری :**

بـەداخەوه تەرجمـەی حـالی دەس‌نـەکـەوت ( ٨/٥٦٥
طەبـەری ) .

**١٥ـ ابو العباس دینەوەری :**

احمد کـوڕی محمد لەپاوەمانی صەدەی سێیـەمی کۆچیدا
لەدینـەوەر لەدایـك‌بووەو هەرلـەوێ فریشـــکی گرتـووەو ،
هەڵچووەو نراوەتـه بەرخوێنـدن وزانستـه سەرەتاییـەکـانی
خوێندووه ، ئنجا هاوڕێتی لەگەل مەزنانی وەك عبدالله خرازو
ابو محمد حریری وابن العطار کـردووه کـەئەمانـه هـەمویان

ئەبەناوبانگانی عرفانی وصۆفیتی بوون ، طەریقەتەکەی ئەچێتەوە سەر « یوسفی کوڕی حسین » کەلەزانایانی پلەیەکی ڕۆژگاری خەلافەتی « المستکفي بالله عباسی » بووە ، پاشان چووەتــە بەغداو مـاوەیێ لـەوێ ماوەتـەوە تا لەئـەرمەی خـەلافـەتی « المطیع لله »دا چووەتە « ترمذ » ولەوێ « خواجە محمد کوڕی حامد » بەخۆیو فەقێیەکانو موریدو صـوفی یەکـانی یـەوە هەمو هاتوون بەپیری یەوە ، ئەم خواجـە محمدە خۆی لــە قوتابیانی «شیخ ابو بکری وراق»بوو ، جالە تورموز بەڕەوشتی صوفیتیو دەرویشی یـەوە خـەریك بووەو خـەلکیکی زۆری ڕینومایی وڕیبەدێی کردووە • ابو العباس جگەلـەوەی کەمـەلا چاك بووە ، لە خوا ترسو گوشەگیر بووە ، هەروا شاعریش بووە ، ئەم شیعرە عەرەبی یە هی ئەوە :

« رأيتك يدنيني اليك تباعدي + فباعدت نفسي لابتغاء التقرب »

واتا : ( کەبینیم چەندە خۆ دووربگرم لەتۆ نیزکترم خـۆم بەتەن دوور خستەوە بەلکو نزیکتـربم لەتۆ ) ئەمپیـاوە سالـی ٣٤٠ك = ٩٥١ز لەشاری ترمذ ەوە چووەبۆ سەمەرقەندو لەوێ کۆچی دوایی کردووە ولەوێ نێژراوە ( طبقات کبری ١٢١/١ ، نامەء دانشوران ناصری ٣٦/٨ ، فرهنك دهخودا پیتی ١ ( آ ) ١٣٤٩ ونفحات الانس جامی ١٤٤ )

دوور نیە گەحافظي شیرازی ئیلهامی لەمشیعرەوە وەرگرتبی کەدەلێ :

گرچه دوریم از بساط قرب همت دور نیست
بندهء شاه شمائیم‌و ثنا خوان شما

١٦ـ حسین دینوری :

حسین کوری موسا کوری هبةالله »ی دینەوەری کەبەنازناوی « جلیس » ناسراوە لەدینەوەر لەدایك بووە و لەوێ هەلچووەو خوێندوویەو دەورانی سوختەیی‌و وستەعدی ، مەلایی وماموستایی هەرلەوێ تەواو کردووە لەزانستی نحودا بووە بە پسپۆڕو زانایەکی مەزن ، چەند کتێبێکی داناوە ، لەوانە « ثمار الصناعه والحروف السبعه » ناو ئەبەین ، سالی ٣٤٠ – یا – ٣٤٩ك چۆتە بەغداو لەوێ کۆچی دوایی کردووە ( کشف الظنون ١/٥٢٣ ، هدیه العارفین ١/٣١١ فەرهەنگی دیهخودا (ح)

١٧ـ ابو بکر بورهانی دینەوەری :

محمد کوڕی حسین یەکێ بووەلە زانا گەورەکانی زانستی فەرمایشت ، سالی ٣٤٩ك چووەتە بەغداو لەوێ ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە ( تاریخ بغداد ٣/٨٣ )

١٨ـ ابو محمدی دینەوەری :

جعفر کوڕی هارون کوڕی ابراهیم ، یەکێ بووە لەزانایانی لەزانستی ڕێزمانا ( نحو قواعد ) زۆر شارەوزا بووە ، ابن‌شاتان کەزانایێکی ناسراو بووە لە سالآنی ٣٤٤ك=٩٥٥زا دا زۆر شتی

زانایانەی لە زمانی ئەوەوە گێڕاوەتەوە ، سالی مەرگی لەنیوەی سەدەی چوارەما بوو ( معجم الادباء ) ٣٠٥/٧

**١٩ـ ابو بكر دینەوەری :**

محمد کوڕی داوود ، گوایە لەبنەڕەتا خەلقی « رەقـە » بـووە وسـالی ٢٠٥ك = ٨٢٠ز لـە دینـەوەر لـەدایك‌بـووە وگەورەبووە ونراوەتە بەر خوێندن ، زانستەکانی عەقلی‌و نەقلی خوێندووەو کارامەبووە ولـەناو صـوفی یەکـانا بـەخواناسـی ناوبانگی دەر کردووە ، پاشان ڕووی کردۆتەشام ولەوێ لەپایەی « عەلی رودباری دا ، دانراوەو لەهەلقەی دەرسی « ابـو عبداللـە جـلا »و « ابـو بکـری ڕەقـەیـی وابو بکـری مصـری‌دا دانیشتووەو ، بەهرەمەند بووە ، وەکوتراوە : پترلەصەت سال ژیاوە ، دەربارەی دەمی مردنی بیرورای مێژونووسەکان ناڕێکە ( ٣٥٠ ـ یا ـ ٣٦٠ ـ یا ٣٦٢ك = ٩٦١ ، ٩٧٠ ، ٩٧٢ز ) مردووە. ( الکامل ٦١٢/٨ ، طبقـات الکبـری ١١٩/١ ) هـەرچۆن‌بێ ، زانیاریەکە توزی‌ئالوزە دەبێ بەلای کەمەوە ١٤٧ سال ژیابێت نەك‌کەمتر ، من‌لام‌وایە ٣٠٥ ، ٣٠٦ بووە کراون بەوەی رابوردو ( المنتظم ٥٦/٧ ، دائره المعارف الاسلامي ١١٥/٤ ، دائره معارف بطرس بستاني ٣١ ، نفحات الانس جامي ٢٠٠ لـەفارسی یەکـەدا تەنیا نفحات نووسرابوو کاکەحەمـە ڕەخنـەی لێگرتبوو مالی ئاوابێت ) .

**٢٠- ابو بكر دینەوەری :**

احمد کوڕی اسحاقي دینــەوەری ، ئەم زانایــە بەناز ناوی « ابن سني » و « الحافظ » ناسراوە کە هۆی یەکەمیان ڕوون نیە . هۆی دووەمیان ڕەنگــەئەوەبێت کەدەهەزار فــەرمایشتی پێغەمبەری لەبەر بوویێت چونکــە لەفەرمایشتــا پسپوربــووە ، هەروا لەمێژووشا ، خۆی گوتیا : لەقوتابیانی « احمد کــوری شعیب » بووە ؛ و چەند کتێبی داناوە : « عمل الیوم واللیل » ؛ « الایجاز في الحدیث » ؛ « کتاب القناعه » وەلە سالی ٣٦٤ك = ٩٧٤زا مردووە ( فەر هــەنگی دیهخودا ١٢٧٢ هدیه العــارفین ٦٦/١ دائره المعارف بطرس بستاني ( ٥٣٩/١ )

**٢١- ابو محمد عبدالله کوڕی محمد کوڕی وهب کوڕی بشر کوڕی صالحی دینەوەری :**

لەدینەوەر لەدایك بووە ولەوێبارِ بووەو ، خوێندوویەو ، لەزانستی فەرمایشتا زۆرشارەزابووە ، دیارە دە هەزار حەدیثی لەبــەربــووە کەنازنــاوی « الحــــافظ »ی دراوەتــی ، لــــە صەدەیچوارەمی کۆچی دا لەزماني زۆر لەزانایانەوە شتیبستوە ئەوەندە زیرەكو هوشیارو شایەستە بووە زانای مەزن « ابــو زرعه » لە وتووێژو مشتومڕا بەرامبەر بەئەوبۆڕی خواردووە سالی مردنی نەزانراوە ( دائره المعارف بطرس بستــاني ١٥٤/٨

**٢٢- ابو عبدالله دینەوەری :**

محمد کوڕی عبدالخالق ، لەدینەوەر لەدایك بووە ولەوێ هەلچووە وخوێندوویە و،پایەێکی مەزنی لــە صوفیتیدا بووە

ولەگەورە شیخەکان دراوەتەقەلەم ، کتێبێکی بەناوی « عمل الیوم واللیل » نووسیوە پیاوێکی قسەخۆش‌و زبان پاراو بووە ، چووەتە حج‌و ماوەیێ لە کعبەدا ماوەتەو ، پاشان گەڕاوەتەوە دینەوەر ، جگەلەوەی مەلاچاك‌و صۆفی‌بووە ، شاعری چاك‌بووە ئەم‌بەیتە هی‌ئەوە :

« اذا اللیل البسني ثوبه     تقلب فیه فتی موجع »

واتا : [کەشەو بەرگی ڕەشی خۆیی بەسەرا کێشام ، لەژێریا لاوێکی دەردەدار هەڵەگەوزێ‌تەوە] ئەم‌پیاوە ساڵی ٣٦٤ك = یا ٣٧٠ یا ٣٨٠ ك = مردووە ( طبقات شعراني ١/١٢٥ ونامەی دانشوران ناصری ٧/٨٣ )

## ٢٢ـ ابن گەچی دینەوەری :

ابو القاسم یوسف کوڕی احمد کوڕی یوسف کوڕی گەچ گەچی ، لەشاری‌دینەوەر لەدایك‌بووە ، پاش هەڵچوون‌و بارپوون فێری خوێندن بووەو بۆتەمەلاییکی هەرەچاك لەڕچی ئایینی شافعی‌دا ، خۆی دۆستی « ابو الحسن قطان »بووەو لەحەڵقەی دەرسی ابو القاسم عزیزی‌دارکی »دا دانیشتووەو ، لەوانە بووە کە سەرداریتی لەزانستی وجیهانی‌دا بە دەست هێناوە ، فەقی‌وشاگرد هەمیشەبۆخوێندن پەنایان بۆ بردووەو لەبارەی ڕچی ئایینی شافعی‌یەوە خاوەن‌بیرورابووەو ، زۆرکتێبی داناوە بۆخەلك کە سوودو بەهرەی لێوربگرن ،

بەڵگە لەسەرئەوەی کەلە زانینا زۆر پایەبەرزبووە « ابـو علـي کوڕی شعیبی سـەنجی » پلش تـەواوکردنی خوێندن لـەلای « شیخ ابو حامد اسفرائینی » واجازەی مـەلایێتی وەرگرتن ، چووەتەلای ابن گەچ کە سەرنجی زانایی‌و وپایەبەرزی ئـەوی داوە پێی وتووە : بەم هـەموزانایی‌و شارمزاییـەوە بۆچ ناوت لەناوانیـە ، وەك ابو حامـد کەئـەم ناوەبـەرزەی وەر گرتووە وبەتولەپێی تۆ ناگات ؟! لەوەراما ئەڵێت : ئەو ، بەغدا بـەرزی کردۆتەوە ، من ، دینەوەر نزمی کردوومەوەو ناوی‌بزر کردووم!' ئەم ابن گەچە سالەهای ساڵ لە «وەروگرد»و دینەوردا قاضی بووەو یەکێ بووە لەبەرێزترین کەس لەلای بەدری کوری حەسەنوەیهی ویـەکێکیش‌بووە لـەهەرە دەوڵـەمەندە خاوەن سامانـەکان ، (هەروەك لەباسی بەدرا ڕابورد) سەرەك وەزیری مەجدالدەولـەی بوەیهی کردوویە بە هۆ (واسطە) لەلای بەدر کەپەنای‌بـدات !! هەرئەو ساڵە کەبەدرکوژرا لەلایەن جوزقانەکانەوە (گەورکان)، ئەویش لەلایەن عەیارەکانەوە ( ابو جاسملر نەوەك بنـەماڵەی عیاری ) کوژرا ( الکامل ٢٥١/٩ دائره المعارف اسلامي ٥/٤ )

٢٤- ابو القاسم دینەوەری :

عبد الصمد کوڕی عمر کوڕی اسحاق ، مەلای چاكبووە، ئایینی بـەپێی ڕچی شـافعی زۆرباش زانیوە لای اصـطخری خوێندویە ، فەرمایشتی لەلای « ابو بکری نەجاد » بیستوە ، پیاوێکی گۆشەگیربووە ، بەرەنجی شانی خۆی‌وکرێی دەستی

ژیاوە، پیاوێکی ڕاستاڵو هەمیشە لەگەڵ ئامۆژگاریی خەریك‌بووە ساڵی ۳۹۷ ك ۲۳ مانگی ذی الحجە لەبەغدادا لەگەڕەکی « درب شماس » مردووە ولەگۆڕستانی امام احمد بن حنبل تێژراوە ( الکامل ۶۶/۱۰ هدیە العارفین ۳۸/۱ والمنتظم ۷/ ۲۳۵ )

۲۵- ابو سعد دینەوەری :

نصر کوڕی ابراهیم : لەزانایانی سەدەی چوارەمی کۆچی‌یە ، بە بەغدایی ناوبانگی ڕۆیوە ، بەکاری صەرافی‌و پارەگۆڕینەوەوە خەریك‌بووە ، ویەکێ بووە لەنووسەرە دیارەکانی سەردەمی « یمین الدولە سلطان محمودی غەزنەوی سوبوکتکینی » ( ۳۷۷ - ۴۲۱ = ۹۸۷ - ۱۰۳۰زا ) سلطان بۆ وەرامی نامەکانی « القادر باللە عباسی » هەمیشە داوای یارمەتی لەئەوکردووە ، ئەم پیاوە کتێبێکی زۆری داناوە ( روائع التوجیهات في بدائع التشبیهات ، ثمار الانس في تشبیهات الفرس ، التعبیر القادری ( الرؤی والاحلام ) کەساڵی ۳۱۷ك بۆ « خلیفەی عباسی القادر باللە » دایناوەو لەگەڵ « صاحب بن عباد » دا هەمیشە نامەیان لەگەڵ یەك‌گوڕیوەتەوەو صاحب بەوشەی ( یا ولدی نامەی بۆی نووسیوە ساڵی ۴۱۰ك = ۱۰۱۹زا لەنیشاپور مردووە . ( الاعلام زرکلی ۳۵۲/۸ ، هدیە العارفین ۴۹۰/۲ ودائرە المعارف غلام حسین بە هەڵە نووسیویە ساڵی ۲۹۷ مردووە ) .

٢٦- ابو بكرى دينەوەرى :

محمد کوڕی عبیداللە کابرایێکی دەوڵەمەندو ناودار ، [ سلطان « جلال الدولە » هاتۆتە دیتنی ، لەگەڵ ئەوەشا کەگۆشەگیر بووە ] سالی ٤٣٠ك شەوی یەکشەمە ٢٣ شعبان لەبەغدا مردو لەمزگەوتی رەصافەو چەند مزگەوتی تریش نوێژی لەسەرکرا ، ولەگۆڕستانی « باب حرب » نێژرا ( ٨/ ٣٠٣ المنتظم ) .

٢٧- المقری الدینوری :

ابو بکر محمد کوڕی مظفر کوڕی علي کوڕی حرب ناسراوبە « المقری » یەکێ بووە لەماموستایانی زانستی قورئان وتجوید وتەفسیر وحەدیث ، سالی ٤٣٥ك = ١٠٤٣ز لەبەغدا مردووە ( تاریخ بغداد ٣/٢٦٥ ، المنتظم ٨/١٩ بەڵام باسی مردنی نەکردووە ) .

٢٨- ابو بكر القاری الدینوری :

محمد کوڕی علي کوڕی ابراهیم دینەوەری : زاناو فەرمایشتەوانو خواناس بووە وگۆشەگیرو خۆپارێز لەگوناه وکاری ناڕەوا ، سالی ٣٧٢ك - ٩٨٣ز لەدایكبووەو سالی ٤٤٩ك = ١٠٥١ز هەرلە بەغدا مردووە ( تاریخ بغداد ١٠٦٣ )

٢٩- ابو بکر شروطی دینەوەری :

محمد کوڕی احمد کوڕی عیسا کوری عبادی شروطی ، خەڵکی دینەوەرەو لەوێوە چووەتە هەمەدان ولەێوە گەڕاوەتەوە

دینەوەر، ئنجا چووەبۆبەغدا لای « ابو اسحاقي بەرمەکی » گوێی لەدەرس بووە ، پیاوێکی زاناو بەهونەرو راستگۆو لەخواترس بووە ، لـەنیوەی مانگـی صەفـەری سالـی ٤٩٤ك = ١١٠٠زا مردووە ( المنتظم ١٢٧/٩ ) .

**٣١ ـ ابو بکری دینەوەری :**

عبدالغفار کوڕی عبدالرحمان لەشرع‌وئایینا زۆر مەلابووە، ئاخرین کەسە لەبەغدا بـەپێی ڕچی ( ثوری ) فـەتوای ئایینی دابێت ، ئەو لەبەغدا لەمزگەوتی مەنصور بووە ، خاوەنی پایـەو فەرمانو جێی ڕێزی هەموان‌بووە ، سـالی ٤٠٥ك = ١٠١٤زا لەبەغدا مردووەو لەپشتی مزگەزتەکەوە نێژراوە ( المنتظم ٧/ ٢٧٤ ) .

**٣١ـ ابو نصری دینەوەری :**

احمد ( لاموایە کوڕی فەرەجی کوڕی عومەری ئیبەریـی. بـاوکی شـەمدەیە ) سـالی ٥٠٦ك = ١١١٢زا لـەبەغدامردووە ( ڕۆژی‌یەکەمی جومادای یەکەم ) ولەگوڕستانی تایەتی خۆیان لە « باب ابرز » نێژراوە . ( وفیات الاعیان ٢٦٦/١ ، الکامـل ٢٠٨/١٠ )

**٣٢ـ ابو الفضل احمد :**

کوڕی محمد کوڕی فضل کوڕی عبدالخالق «ابن الخازنە» ی دینەوەری : لەشاری دینەور لەدایك‌بووە ، لەخانەوادەیێکی زانیاری‌و هونەری وخواناسیدا پێ‌گەیوە ، پاش فراژی‌بوون

وهەڵچوون تراوەتەبەرخوێندن ، لەفێربوونی ئەدەبو مێژوو وزانستی ترا زۆر بە هرەومر بووە ، لە خۆش خەطی دا کارەماو لەشاعری دا ناوبانگی دەرکردووە، گەلێ لە «مەقاماتە کانی حریری» بە خەطی جوانی ئەوماوەتەوە ، کتێبێکی بەناوی « قەناعەت » داناوە ، دیوانی شیعرەکانی لەلایەن « ابو الفتح نصرالله »ی کوڕی یەوە ، پاش مەرگی خۆی، کۆکراوەتەوە، ئەمەەلبەستانەی لە هەڵنانو پەسنی باغێك وگەرماوەێکی « حکیم ابو القاسم اهوازی » داوتووە ، کەخولکی کردووە بۆمیوانبوونو چاو پێکەوتني ئەوجێگەیە :

« وافيت منزلـه فلـم ار حاجبا
الا تلقاني بسن ضاحك »
« والبشر في وجـه الغلام امـارة
لمقدمات ضياء وجه المالك »
« فدخلت جنتــه وزرت جحيمــه
فشكرت رضوانا ورأفة مالك »

واتا : (رووم کردە مالی نەمدی دەربانێ
پێشوازم نەکا ، مەر ، بەڕووشادی »
ڕووخۆشیی نۆکەر نوخشە بەڵگەیە
بۆ گەشی چارەی خێوی ئابادی »
« دیتم بەهەشتیو دوزەخی گەرمی
سپاس بودەربان ، میهری خاوەندی »

هەروا ئەمچوارینەشی دەربارەی کەسانێ وتـووە : کـە ڕەوشـتجوان وڕاستاڵ وجوامیرن ، بـەلآم بێبـەشن لـە هـەموناز ونیعمـەتی جیهـان ، پێچـەوانـەی ئـەو کەسانەی کـە ساختەچیو بەدخوو ناشایەستەی ژیـانن کەچـی خێـوی هەمـو نازو نیعمەتێکن :

« من یستقم یحـرم مناه ومن یزغ
یختص بالاسعاف والتمکین »
« انظر الی الالف استقام ففاتـــه
عجم وفاز به اعوجاج النون »

واتا : « ڕاستاڵ لەمیوا بێبەشەو قەڵب
ئەگات بەپایەو ئارەزوویی خۆی »
« سەرنجی ئەلفی ڕێوڕاست بدە
نیتکی نەدرایێ ونون خستیە ناوخوی »

هـەروا تەماشـای ئـەم هـەلبەستـە جوانەبکـە کەوتوویەبـۆ ئەوەی لەسەر پارچە مافوورێ بنوسرێت :

« فرشت خدی للمشاق قاطبـــة
فصحن خدی لهم ارض اذا عشقوا »
« لولا اخضراری من سقیا مدامعهم
لکنت من زفرات الوجد احترق »

واتا « ڕوخسـارم کردە ڕایـەخی دلدار
گەوز دەن لەبانی یارانی نازدار »

« چیمەنی دەروون بە ئەشکی شادی
تەڕنەکەن ، ئەمکات سۆزش بەدموار »

ئەم ابن الخازنە بیستویەکی مانگی صەفەری سالی ٥١٢ھ ـ یا ـ ٥١٨ك = ١١١٨ ـ یا ـ ١١٢٤زا مردووە ( وفیات الاعیان ٤٦/١ ، کشف الظنون ٧٦٥ ، اعلام زرکلي ٢٠٨/١ )

**٣٣ـ ابو حامد دینەوەری :**

عبدالعزیز کوڕی عومەر ، یەکێ بووە لەدەوڵەمەندانو خێرەومەندانی بەناوبانگ وهەژاردۆست ، لایخەلیفەو خەڵك بەڕێز .. فەرمایشتی لەلای « محمد الجوهری » خوێندووە سالی ٥١٤ك لەشاری هەمەدان مردووە ( ٢٢١/٩ المنتظم )

**٣٤ـ ابو عبدالله دینەوەری :**

حسین کوڕی ابراهیم ، لای « طەراد ، وتەمیمی » وەمەلای تری دەرسی فەرمایشتی بیستووە، ڕۆژی سالی ٥٢٦ك شەوی یەکشەمبە لەبەغدا مردووە ولە « باب حرب » نێژراوە ( ٢٨/١٠ المنتظم )

**٣٥ـ مقلاص دینەوەری :**

ابو الحسن کوڕی علي کوڕی مطهر کوڕی مکي کوڕی مقلاصي دینەوەری زانایێکی خواناسو پارێزگارو گوشەگیر بووە ویەکێ بووە لەقوتابیانی « حجە الاسلام محمدی غزالي ، وفەرمایشتی لە « نصری کوڕی البطر »و هاودەمانی بیستووە ،

ولەزمانی «ابن عساكر» یشەوە زانستی بڵاو كردۆتەوە ۷ مانگی ڕۆژو ساڵی ۵۳۲ك = ۱۱۳۷زا كۆچی دوایی كردووە ( طبقات الشافعیە ٤/٢٨٤ )

### ۳٦ـ كسار مقری دینەوەری :

شیخ ابو نصر احمد كوڕی حسین ، یەكێ بووە لەزانایانی تجوید وتفسیری قورئان ، لە نووسراوەكانی تەنیا كتێبی « المنیە في القراءات» ماوەتەوە ( كشف الظنون ٢/١٨٨٩ وفیات الاعیان ٢/١٥٠ – ٤٥٤٨ )

### ۳۷ـ ابو بكر دینەوەری :

محمد كوڕی علي كوڕی محمد ، لەشاری دینەوەر لەدایك‌بووە ، ژیانی منداڵیتی هەر لەوێ ڕابواردووە وخوێندنی سەرەتایی فێربووە ، ئنجا ڕووی كردۆتە بەغدا ولەوێ دامەزراوە ، شیعرێكی زۆری هەیە لەبارەی شادی ، شەیدایی ، گوشەگیری وشەراب نۆشیەوە ، ئەم هەڵبەستە هی ئەوە :

« اصبو الی شرب الخمور وانما
لصبوحكم لا الصلاة اذاني »

« طلعت شموس الراح من ایدیهم
مثل النجوم وغبن في ابدان »

« حەز لەنۆشینی شەرابم بەم بەیانە
بۆ « صبوحي » بانگ ئەدەم نەك بۆنوێژ »

« مەی وەکو خورشید لە لەپیانا هەڵات
وەك ستارە بە لەشیانا ئاواو سەرە لێژ »

بەداخەوە نەساڵی هاتنە دنیایو نەلەدنیا دەرچوونی بەتەواوی نەزانراوە ( دائرة المعارف بطرس بستاني ) •

**٣٨ـ احمدی دینەوەری :**

احمد کوڕی محمد کوڕی ابو بکر کوڕی ابو الفتح یەکێبووە لەزانایانی هەرەبەرزی ڕچی ئایینی حەنبەلی ، کتێبی زۆری داناوە یەکێلەوانە « التحقیق في مسائل التعلیق »ە وادیارە لەژیانا زۆر تووشی دەمەتەقێی لە گەڵ نەزانان بووەو هەمیشە ئەم هەلبەستەی خۆی دووپات کردۆتەوە :

« تمنیت ان تمسي فقیها مناظرا
بغیر عناء والجنون فنون »

« ولیس اکتساب المال دون مشقة
تلقیتها ، فالعلم کیف یکون ؟! »

واتا : خۆزکە ئەبوویتە مەلای ڕەخنەگر
بەبێ ماندووبوون ، شێتییش زۆرجۆرە ! »

« ماڵ بەدەس هێنانبێ عەزیەت نابێ
ئەیزانین ؟ چلۆن ؟! کەمەتا گۆڕە »

ئەمزانایە مانگی جومادای ساڵی ٥٣٢ك = ١١٣٧زا مردووە ( الکامل ١٠/٦٦ ، هدیه العارفین ١/٣٨ ، المنتظم ١٠/٧٣ )

### ٣٩ـ شەهدەی دینەوەری :

شەهـدە کچی ابـو نصر احمـد کوڕی فـەرج کـوڕی عمر ئیبەری دینەوەری‌یە ( ژمارە ٣٠ ) بەڕاستی تاجی شانازیـی ژنانـە ، شائەدیبی ئافرەتـە کوردەکانـە ، کەبـەزبانی‌یێکانـە هەڵبەستی‌وتبێت ، سـالی ٤٨٢ ـ یا ـ ٤٨٥ك = ١٠٨٩ ـیا ـ ١٠٩٢زا لـەبەغدا لـەدایك بـووە ، ڕۆژگاری جـوانی خۆیـی بەخوێندن وفێربوون بەسەر بردووە وبووەتە زانایێکی تواناو نووسەرێکی بەناوبانگ‌و ، خەطخۆشێکی لێهاتووی کـارەما ، زانستی فـەرمایشتی لەلای « ابـو الخطاب احمـد الشاشـي » خوێندووە ، ولـەم زانستەدا بووەبـەپسپـۆڕ ، ئنجا شـووی کردووە بە « ابو الحسن علي کـوڕی محمد کـوڕی یـەحیای دوەینی » کەلە سەرەتادا لەماڵی « ابو نصر احمد »ی باوکی‌دا نوکەربووەو خود باوکـی لەمنداڵیـەوە پـەروەدەی کـردووەو وفێری خوێندمواری کـردوومو پـەیوەندیی دۆستایێتی بـۆی پەیداکردووە لەگەڵ « خەلیفەی عباسی المقتفي بالله »دا ; لـە ئەنجاما « ئلي » بووەبەیەکێ لەپیاو ماقوڵانی بەغدا ، ونازناوی « ثقة الدولە »ی وەرگرتووەو بەناوی خۆیـەوە قوتابخانەیێکـی گـرنگی دورستکردووەو بـەهۆی‌ناوبانگی شـەهدەو بـاوکی شەهدەوە باشترناسراوە ، شەهدەخاتون ڕۆژی‌یەك شەمە١٣ محرم الحرام سالی ٥٧٤ك = ١١٧٨زا لەتەمەنێکی ٩٠ سالیدا کۆچی دوایی کردووە ، ولە « باب ابرز » لای‌باوکی نێژراوە ، پاشان تەرمی مێردەکـەشی ( کەلـەوەبـەر سـالـی ٥٤١ك مردبـوو

هەرلەماڵەکەی خۆیاتێژرابوو ) لەگۆڕ دەرکراو هێنرا لە ( باب ئابزر ) لەتەك گۆڕەکەی « شەهده »دا تێژرا ( الکامل ۱۱/ ۲۰۰ - ٤٥٤ ، وفیات الاعیان ۱۳٦/۱ والخیرات الحسان ۲/ ۲۵۹ والاعلام زرکلي ۲۵۹/۳ وبطرس بستاني ٤٨/۹ )

**٤٠- ابو الفتح دینەوەری :**

شێخ ابو محمد مبارك کوڕی ابو الفتح احمد ، خەڵکی دینەوەرە ، ولەبەغدا لەدایك بووە ، یەکێ بووەلە فەرمایشتەوانەکان ۱٦ ذی الحجه ۵۸٦ك = مردووە ( خریدە القصر حاشیەی لاپەڕە ۲۱۳ ج۳ ) .

**٤١- شیخ محمودی دینەوەری :**

سەرۆکی شێخانی سەردەمی خۆیبووە ، لەسەردەمی « بایدو » خاني مغول وغازان خاني مغول »دا زۆر بەڕێزو خاوەنشکۆبووە ، ولەلایەن خانەکانەوە بەدۆست دراوەتە قەڵەم ، تەنیا دەربارەی ژیانی ئەوەندە ئەزانین کەتاساڵی ٦٩٤ك لەژیانا بووە ( تاریخ غازان خان تألیف رشیدالدین فضل‌الله ۸۱ ) .

**٤٢- ابو الحسن دینوری :**

علی کوڕی عبدالواحد کوڕی احمد کوڕی عباس ، لەزانایانبووە ، لەکتیبی « رسالة کتاب المسائل »دا ناوی هاتووە ، ئەمکتیبەی خوێندووە بەگوێی لێبوون ، ساڵی

٥٩٦ ك = هێشتا زیندو بووە ( فهرس مخطوطات المجمع العلمي العراقي ـ کۆکردنەوەی میخائیل عواد ٣/٣١٢ ) •

٤٣ـ ابراهیم دینەوەری :

ابراهیم کوڕی محمد کوڕی ابو نعیم عمر کوڕی جمال‌الدین شاهدی خطیب لەوزانایانەیە کە « ذهبی » لەکتێبی « معجم »ە کەیا ناوی هێناوە ( المعجم الذهبي پیتی (أ) ) •

٤٤ـ احمد اسود دینەوەری :

یەکێ بووە لەشێخە هەرەگەورە کانو سەرۆکی طەریقەتی « سهروردیە » بووە ، دەربارەی شێخ مەمشادی دینەوەری کەلەپێش ئەوا بەچوار صەدسال مردووە ( ژمارە ٥٠ ) ارادە واخلاصي هەبووە ، وبە گۆشەگیری ژیاوە • ( مناقب احمدیە ٢٦٧ ) •

٤٥ـ ابو بکری دینەوەری :

ابو بکر منصور کوڕی سرحانی صالحیی ، مانگی ڕۆژوی سالی ٦٥٧ك = ١٢٥٨ز لەدایك بووە ، پاش خوێندن وپێکەیین بووە بەیەکێ لە فەرمایشتەوانەکانی ناودار ، مانگی ذی القعدە سالی ٧٤٦ك مردووە ( علماؤنا سەرچاوەی نادیارە ) •

٤٦ـ محمدی دینەوەری :

محمد کوڕی ابو بکر کوڕی عمری دینەوەری ، بەناز ناوی « العجمي الصالح » ناسراوە ، سالی ٦٤٣ك لەدایك‌بووە ، بەرگی یەکەمی « افراد ابن شاهینی » بەمدەرس وتووتەوە بە « علي

کوڕی محمدی کوڕی بەدری کــوڕی یعیش » ســالی ۷۱۷ك کۆچی دوایی کردووە ( علماؤنا سەرچاوەی نادیارە ) •

**٤٧ـ غیاث الدین ابو سلیمان داوود کوڕی علي کوڕی یوسفی دینەوەری :**

یەکێ بووە لە صۆفییە گۆشە گیرەکانو لەفەرمایشت زانــە بەناوبانگەکان ( مجمع الالقاب ٤/١٨٨ ) •

**٤٨ـ ابو عبدالله دموەنیِ دینەوەری :**

لەگوندی دموەنی سەربەدینەوەر لەدایكبووە ، هەمیشــە شـێتو شــەیداو دلبراو ( مجـذوب ) بووە ، ویــەکێبـــووە لەصوفییە ناسراوەکانو دەربارەی وتراوە / : « لەژیانا مەستو لەمردنا مەست » ( نامەی دانشوران ناصری ٧/١٨٢ ) •

**٤٩ـ مەلا پەریشان دینەوەری :**

ابو القاسم لەزانایانی صدەی نۆیەمی کۆچیبە ، پەیڕەوی ڕچی « پیتباوەرە » ( حروفیــە ) دیوانێکی بچوکی کــوردی هەیە ، لەسەردەمی « شیخ رەجەب پرسی » نووسەری کتیبــی « مشارق الانوار »دا ژیاوە ( مقدمەی دیوانەکەی ) •

**٥٠ـ مەلا عبدالکریمی دینەوەری :**

عبدالکریم کــوڕی ســلیمان نــەوەی مصــطفای کــوڕی حەسەنی قاضی دینەوەر وســنــدە کــوڕی عبــدالوهــابێ کــوردی خالدی ( کەلوری ) ـ لەسەرڕچی شافعی بووە ، چووەتە شاری دەمەشق لای ژمارەیێ لەمەلا گــەورەکان خوێندوویــە ، پاشان

ڕێگای دەرویشیو صوفیتی گرتووە ، ولەوانەیە کەلە صەدەی دوازدەدا ژیاوە ( مشاهیر الکرد وکردستان ٣٤/٣ ) بەداخەوە سەرگوزەشتەکەی دووردو درێژەو ئاڵۆزە ) ٠

**١٥ـ حاج نعمەالله دینەوەری :**

ساڵی ١٢٨٨ك = ١٨٧١ز لەگوندی « جیحونئاوا »ی نزیك دینەوەر هاتۆتە دنیاوە ، دەورانی منداڵیو لاوی لەکرماشان بەخوێندن وفێربوون بەسەر بردووە ساڵی ١٣١٨ك گەڕاوەتەوە گوندەکەی خۆی لەگەڵ دەرویشیو خەڵوەکێشیو خواپەرستی خەریكبووە ، وبەدانانی کتێبیشەوە خۆی سەرگەرم کردووە ، دەربارەی گەورە پیاوانی ئەهل حەق ( کاکەیی ) بەمەلبەست کتێبی « شاهنامەی حقیقت »ی داناوە کە بریتییە لە ١١٥ ١١ بەیت بەفارسی ٠٠

**سەرنج :**

لەصەدەی هەشتەم بەدواوە کە دینەوەر لەلایەن تەیموری لەنگەوە وێران کراوە ، ئەوزاناو ناودارو هەستیارو شێخوصوفی یانەی کەنازناوی دینەوەریان پێوەیە ، ئەوانە یاخەڵکی هەرێمی دینەوەرن یاخەڵکی گوندی دینەوەرن کەجێی شارەکۆنەکەی گرتۆتەوە ٠٠

جگەلەم زاناپانە ناوی صەدەهایتر لەمێژووەکانا هاتووە ، بەڵام چونکە سەرگوزەشتیان دیارنیە ، باسی ئەوانمان نەکرد ،

بەهیوام ئەم ئاساندنی دینەوەرە سەرمەشقێ بێت بـۆ گەنجان کەمێژووی گوندو شارەکان لەبیر نەکەن ، ئەوەك وەك شارەزوور ودینەوەرو حەلەوان وشارانی تریکورد لـەلایەن ، دوژمنـەوە ژێروژووربکرێن ...

بـەغـدا - ٢٢/٣/١٩٩٠زا ( ٢٥/٨/١٤١٠ك ) ( ٢٦٩١ سەرەتای دامەزرانیماد ) .

# سپیارەی دینەوەرو
# فەرمانڕەوای حەسەنوەیهی

## سەرەتا :

حەلەوان یەکێکە لەوشارە هەرە کۆنانەی کوردواری کەتا سەدەی هەشتەمی کۆچی ( چواردەی زایینی ) بەرانگاریی دوژمنی کردووەو ، بەرپابووە ، پاشان گێژەڵۆکەی ڕەشەبای شملی شەڕ بنچینەوبناغەی لەڕیشە ورەگ دەرهێناوە ، بەلام هەم ناوی جاویدان ماوەتەوەو هەم خاکو مرۆڤی نەبەردی ..

دەربارەی مێژووی کۆنی حەلەوان دەستاوێزو بەلگەو بەردەنووس زۆرە ، بەلام هەندێ لە هەواڵەکان قسەلۆکوتێکەڵ بەئەفسانەن‌و هەندێکیشی دەنگ‌وباسی مێژوویین کەلەسەر تاتەبەردنووسراون‌و لە کتێبا تۆمار کراون ، وپشتاوپشت داستان ئاسا بۆ خەلك گێڕراونەوە .

نووسینه وتنه :

لەسەرەتادا دیاردیم بو ئەوە کردبوو کەدەربارەی « فەرمانڕەوایی عەییاری » وتارێکم بە فارسی نووسیبو بۆ کونگەرەی زانکۆ ، وتارەکە لەلایەن نووسەری بەرێز « کاکە حەمەی مەلاکەریمی بیارەوە » کرابوو بە عەرەبی و لەبەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردیدا بەسەرناوی « امارة بنی عیار وحکومتهم .. » بە پەراوێز ورەخنەو ڕاستکردنەوەوە بلاو کرابوەوە ، پاش ئەوە بۆتێروتەسەل کردنی ئەم باسە سیپارەیێکی تریم ئامادەکرد دەربارەی حەلەوان بەکوردی ولەژمارەکانی ٢١ - ٢٢ گۆڤاری کاروان دا بەهەلەیێکی چاپی زۆرەوە بلاو کرایەوە ، نووسەری بەرێزوزانا « کاك کەمال غەمبار » وەری گێرا بەعەرەبی و هەر لەهەمان گۆڤارا لەژمارەکانی ( ٤٦ - ٤٧ ) دا بلاو کرایەوە ، بەداخەوە ئەوەندە هەلەی چاپی ودێرپەڕاندنی بەرکەوتبوو خوێنەر بێزی لێ ئەهاتەوە ، دوکتور حسام الدین نەقشبەندی مالی ئاوابێ لە گۆڤاری نەوروزا لەژمارەکانی ٧ - ٨ - ٩ دا وتارێکی پڕ لە ڕەخنەوڕاستکردنەوەو ڕێنومایی دەربارەیان نوسی جاێەوانە، پالی پێوەنام کەجارێکیتری چاو بگێرم بەوتارەکاناو، بە پێی پەیوەندی ، « عیاریو حەلەوان » تێکەل بکەم وبەچەش وخوێیەکی تازەو زانیاریی سەربارەوە لەقالبی سیپارەیێکی نوێدا داڕێژمەوە ، جاپاش هەولێکی زۆرئەم سیپارەیە هاتە بەرهەم کە ئەخرێتە بەرچاوی خوێنەرانو خوێندەواران بە هیوام ببێتە هۆی ڕەزامەندی وپەسنی ئاشنایانی مێژوو ، ئیتر پشت بەیەزدان وکار لەئێمە ..

محمد جمیل ڕۆژبیانی

**ناوی حەلەوان :**

لەبارەی ناوی حەلەوانەوە کە لەچیەوەهاتووە ، واتەوات زۆرە ، « بەکری » نووسیویە : حلوان هەروەکو جورجانی وتوویە : ئەم‌ناوە لەوێوە هاتووە کە بەواتا « پاریزەری سنوری بی دەشت » چونکە حەلەوان سەرەتای عراق‌و پاومانی سنوری چیایە ، محمد کوڕی سهل‌یش وتوویە : بەناوی حولوان کوڕی عمران کوڕی الحاف کوڕی قضاعەوە ناونراوە ، بەلام یەکەم‌ڕاستە .. ) ( معجم ما استعجم ب١ لا / ٤٦٣ ) . جا ئەی‌خوێنەری‌بەڕێز بۆ ئەوەی بزانی کەئەم جۆرە باوەڕانە قسەلۆکەی گیرفانی پیرەژنانە ئەلێم : گورگانی ( جورجانی ) هەم‌فارسی باش زانیوە هەم‌کوردی وتورکی وعربی ولەهیچ شێوەیێکی ئەم‌زبانانەدا وشەی « حل = حەل » بەواتای « حد = سنور » نەهاتووە ، کەوابێ ڕاکە ، جێی باوەڕنیە .. یاقوتی حەمەوی‌ش هەرئەم جۆرەباوەڕەی دووپات کردۆتەوەو نووسیویە : ناوی حەلەوان لەوێوە هاتووە کەیەکێك لەپادشایانی ئەم جێگەیەی بەقەوالە خستۆتە ژێر فەرمانی حولوان کوڕی عمران کوڕی الحاف کوڕی قضاعەوە ( معجم البلدان ٢/٢٩٦ ) پێتی (ح) بەلام کام پادشاهـ ؟ لەکام ڕۆژگارا ؟ ئەمانەلەکوێ ژیاون‌و خەلقی کوێ‌بوون ؟ ئەم جورەڕایە ئەفسانەی پیرەژنانەیە لە ئاوەزێکی ڕەگەزپەرستانەوە هەلقولاوە !

ابن الاثیریش نووسیویە : « شارەکانی ئەرەجان‌و حەلەوان لەلایەن قوباد ( کاوێز )ی ساسانیەوە (٤٨٨ ـ ٤٩٦ز!)

دوروستکراون • ( الکامل (٤١٤/١) وادیاره ئەو لـە طەبـەری وەرگرتووە ( تاریخ الامم والملوك ٩٢/٢ ) ، کە ئەم هەوالـەش دیسانـەوە پێچەوانـەی مێژووە ، چونکـە وەك لـە تاتەبەردە نووسراوەکان دەرئەکەوێ شاری حەلەوان لەسەردەمی «کاسی» یەکوردەکانا هەبووەو سێ‌هەزارساڵ بەرلـە هاتنەدنیای عیسا (ح•خ) ناوی حەلەوان لەتیکستەکانی «عێلامی»دا هاتووە، ئەوەتا « دیاکونوف » نووسیویـە : « ئاکومی دووەم کـەبەنازناوی کالێ‌ری بەناوبانگ بووە شازدە سەدە بەرلە

زایین . لە « بابل » دامەزرێنـەری زنجیرەی نوێی بنـەماڵەی پادشاییتی « کاسی » بـووەو خـۆی بەجێگـری پرتـەوداری « خوا شوکامونا » وبەپـادشای « کاسـی » و « ئەکـەدی »و کیشوەری پان‌وپۆڕی بابل‌و پادشای ئاپادان وئالمان‌و گوتیانی دەبەنلك ؟! داوەتە قەلەم ، ئەم‌وتەیانەی لەوبەردە نووسـەدا یـە کە خۆی‌بۆ یادگار بە جێی هێشتووە ، ومەبەستی لە « ئالمـان » حەلەوان »ی داوێنی چیای زاگروسە کەئەکەوێتە لای سەرووی ڕوباری سیروان (دیالی)وە (مێژوی ماد ، وەرگیرراوی فارسـی کەریمی کشاوەرز لاپەڕەکانی ( ١٥٥ ـ ١٥٧ ) •

بەداخەوە لەتەرجمەکـەی کاك‌کـەمال غەمبارا بۆعـەرەبی ئەم‌هەڵەیانە ڕوویداوە : « دیاکونوف » بووە بە « باکوف » « شازدەسـەدە » کەوتووە ، پرتـەودار کراوەبـە « قـەوی » کەمەبەست تیشکدارە نـەوەك‌قـەوی ئاپادان‌بۆتـە « پاون » ئەمە نموتەیێکی ئەوهەڵەیانەیە باسم کرد ••

خۆر هەڵاتناسی مەزن « گیرشمـەن »یش نووسیویـە : کاسی‌یەکان لەسەردەمی « ئامارنا » دا ـ کەلەگـەڵ میصری‌یەکان پەیوەندی دوستایەتی‌یان هەبوو ، هەواڵیان لەیەکئەگێڕایەوە ـ هەرکە « ئەداد نیراری » یەکەم لەقەڕاڵانی ئاشوری شاڵاوێکـی سەختی کردو دەستی‌دایەوە نوێکردنەوەی سپای ئاشوری ـ ئەم « ئامارنا »یە بەهۆی پەیمانێکـەوە بەستبـووی ، توانـی لـەدەوروبەری « حـەلەوان » پارێزگاریی وڵاتـەکـەی خـۆی دابین‌بکات ( ایران ازاغاز تا اسلام ترجمەی فارسی محمد معین لاپەڕە ٥٦ ) .

ابو حنیفەی دینـەوەریش نووسیویـە : ئەردەوان پـوری ئەشـەپـوری ئەشـکانی فـەرمانڕەوای مـاهـان ( واتـا دینـەوەرنەهاوەند ) و هـەمەدانو ماسـەبزان ( واتاپشتکو ) ومیهر گان کوچلکو حەلەوان بووە ... تاد ( الاخبار الطوال ٤٤ وەرگێڕراوی فارسی صادق نشأت ) .

لەم دەستاوێزانە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە حەلەوان زۆر لەوە کۆنترە کە ئەو نووسەرانە خەیاڵیان کردووە و،نەحولوانو، نەکاوێز هێـچ کامیان دایـان نەمەزرانـدووە ، خـود گـەلانی چیای‌زاگروس دوروستیان کردووە .

ڕیشـەی‌ناوی حەلەوان :

هەندێ لایان وایە « خالمان »ە وگویا ناوەکە ئاشوری‌یە ، هەندێ لایان وایە حولوانی عەرەبی‌یە ، واتا مزگێنی بەڵام ڕاست

ئـەودیە کـەناوەکـەکوردی‌یەکی پـەتیە و لەبنەڕەتا « هـەڵمان » بووە کە لەگەڵ « هەڵاوان » هـەریەك

واتایان هەیە ـ ولەوێیووە پەیدابووە ، کەئەم شوێنەلەچاو چیای سەربە بەفری‌زاگروس ـ کەتەنیا دووفەرسەنگ لێیەوە دوورە ـ گەرمیانـەو کانیاوە گـەڕاوەگوگردی‌یـەکانی زستانان هـەڵمو هەڵاویان لێ هەڵدەستێ ...

شوێنەواری کۆنی شارەکە نزیك‌بە «سەرپل» (سەرپرد)ی زەهـاوی ئێستـەیـە ، لەخـوار دەرتەنگـەوە ، کەنـاوەکـەی بـەلاتینـی بـووە بـە « زاگــری پــولای » وعـەرەب پێـی ئەلـێن « عقبــة حلـوان » . جا ابـن حـوقـلو یاقوتـی حەمەوی ئەم‌ڕایە پشتیوانی ئەکەن‌و نووسـیویانـە : حـەلەوان شارێکە بەلاپالی چیاوە ، بەسەرعراق‌دا ئەڕوانێ ، ولـەنەخشـەدا سەربەعراقە ( واتاپاش‌داگیرکرانی لەلایەن سپای ئیسلامەوە ) ئەوەندەی نیوەی ـ یا دووسێ‌یەکی ـ شاری دینەوەر ئـەبێ ، شــارێکی گەرمـەسیرە دار خـورمای زۆرە هـەنجیری باش‌و هەناری بەناوبانگـە ، وله چیای‌بەفراوی‌یـەوە دووفەرسـەنگ دوورە ( صورة الارض ابن حوقل ، ترجمەی فارسـی دوکتور شعار ۱۱۲ ومعجم البلدان ٥/۲۹۰ ) .

یعقوبی‌ش لەم‌بارەوەنووسیویە : « حـەلەوان شـارێکی زل‌و بـەشکوێـە خەلقەکەی تیکەڵ‌وپێکـەڵن ـ لـەسـەردەمی خەلیفەی دووەما داگیرکراوە ، خەرج‌وباجی ئەم‌شارە کەخۆی

سەربەچیایە ( الجبل ) . خراوەتەسەر رەشەخاکی ( سواد )ی (دیهستانەکانی)عراق، رێ لەم حەلەوانەوە ئەچێ بۆمێرگدز ( مرج القلعة ) ، رەوەکانی خولەفا لەمێرگەدا ئەلەوەڕێن . لەمێرگدزەوە رێ ئەچێ بۆ «زبیدیە» ولەوێوە بۆقرماسین کەشارێکی گەورەو بەشکۆیە وبەشی زۆری دانیشتوانی عەجەمن - واتافارس وکورد - ولەوێوەری ئەچێ بودینەوەر کەسێ قۆناخە ( البلدان احمد واضح یعقوبی ٣٥ ) بالەبیرمان نەچێت لەکۆنا کە ئەوترا ( الجبل ) مەبەست چیای زاگروس بوو بەهەمولق وپەلەکانیەوە هەر لەئەصفەهانەوە تاحەکاری وهەر لەدەماوەندو هەڵەبەرزەوە تا زنجیرە چیاکانی بەمۆوسەگرمە قەرەداغ پیرەمەگرون تاد ) ، مەبەست لەقرماسێن کرماشانە لەبنەرەتا کرماژن - کرمژن بووە ، پاشان بوتە کرماژان کرماجان کرماشان وفارسەکان کردوویانەبە کرمانشاه وبەرلە سالی ٥٠٠ك (کرمانشاه) لە الکامل والمنتظم دابەکارنەهاتووە ، ولەوەوەپەیدابووە ، ناوی « زبیدە » ش، کەدراوە بە «زوێری» رەنگە لەوێوەهاتبێت کەهەرێمی زوێری کرابێت بەمانگانەی « زبیدە »

**حەلەوان ومێژو :**

حەلەوان بەرلە ئیسلام ناوەندی ئوستانی شادفەیروز هەرێمی چیا ( الجبل ) بووە کەلەم ناوچانەو شارانە پێکهاتبوو : حەلەوان - فەیروزقوباد - کوهستان - تامەرا - ئاریل - خانقین . ( التنبیه والاشراف مسعودی ترجمەی فارسی ابو

القاسم پایەندە ٤١ وکرمانشاهان باستان ٨١ ) . لە دەورانی حکومەتی حسنویەو عەیاری‌دا تەنیا حەلەوان ـ کوهستان ـ خانەقین مابوو تامەڕاو ئاریل نەناسرا، سالانی ١٦ ـ ١٩ك = ٦٣٧ ـ ٦٤٠ کۆچی پاش‌ئەوەی مەدائنی پایتەختی ساسانی کەوتە ژێر دەستی ئیسلام‌و یەزدگوردی شاهەنشای ساسانی بەرامبەر بەسپای ئیسلام شکستی‌خوارد وهەلات ، حەلەوانی کردەپایتەخت . بەلاذری نووسیویە : کەسپای ئیسلام شاری « بهر سیر = بەهە ئەردەشیر » وبەشی خۆرئاوای شاری مەدائنی داگیرکرد ؛ لەمانگی صەفەری سالی شازدەی کۆچیدا بڕیاریان دا بەشی لای خۆرهەلاتیشی داگیربکەن کە « هەیوانی کەسرا »ی تیابوو ، جا لەشکری سوارەی ئیسلام لەڕوباری دجلەپەڕینەوە ؛ سپای ئێران کەئەم شالاوەیان‌دی ورەیان بەرداو لەترسا لەرزیان لێهات وبەرەوشاری « حەلەوان » هەلاتن، یەزدگورد پاش‌ئەوەی مال‌وخێزانی خۆی‌و هەمو گەنجینەی ولاتی وسوکباری بەڕێخست ، سواری تەختەرەوانێکی زەمبیل ئاسا بوو کۆشکی سپی بەجێ‌هێشت ، بەسوارەو پیاو ماقولانەوە ڕوی‌کردە حەلەوان ، یەکێ لەفەرماندەکانی کەناوی « مهران کوری بەهرام » بوو بەسپایێکی پڕچەکەوەلە ( جلولاء ) بەجێ هێشت‌و دوستوری‌دا بەهێزەکانی چیاو ئاذەربایجان وشیروان ، کەبچنە کۆمەك‌و یاریدەی مهران ، جا دەس‌کرایە سەنگەرلێدان وخەنەك هەلکەندن ، ( فتوح البلدان بلاذی ٦٣ ـ ٦٥ والکامل ٢/٥١٨٠٥١٣ )

وادیاره سپای ئیسلام زووبەرەو نەهرەوان جولان ولەوناوە، سووکەبەرانگارێی ڕوویداوە ، بۆیە پاش داگیرکردنی « نەهروان » سعد کوری ابو وقاص ولاتەکەی تالان کردووە ، تالانەکەی بەسەرسوارەی سپاکەیا بلاوکردۆتەوە هەریەکە ( ۱۲۰۰۰ هەزار دیناریان پێبڕاوە ( تاریخ الامم والملوك طبری ٤-٣ ۱۳-۱۵ ر - ۲۰ ، روضة الصفا ( ۳/٥٦٨ ) .

هەرکە هەوالی سەنگەر لێدانی سپای ساسانی گەیشتە «سعد» فەرمانی دا بە «هاشم کوری عتبە کوری ابو وقاص»کە برازایبو بەدوازەدە هەزار کەسەوە بڕوات بۆبەرانگاریان، هاشم کە گەیشتە ئەوناوە سەرنجیدا هێزێکی گەورەکۆبووەتەوە ولەسەنگەرو خەنەکان ، ماڵومنالەکانیشیان بەرەوخانەقین خستوتەرێ ... جا بەوهێزەوە هەلیکوتایە سەریان ، ودری پێدانو کومەلەکەیانی پەرتبلاو کردەوە، جگە لەوهێزە ، لەشکرێکی تریش بەفەرماندەیی « جریر کوری عبدالله بجلی » ئیرابۆ یاریدەی ودوستوری درابێ کەهێزەکەی لەگولالە ( جلولاء ) ساوبدات ولەنێوانی سپایئیسلامو سپای دوژمنا وەك شورەی پۆلا بنجوڕیشەدا کوتێ ؛ .... سعد سێهەزارکەسی تریشی لەهێزەکەی خۆی بۆناردو فەرمانی دابێ کەبە هێزەکانەوە بجمێ بەرەو « حەلەوان » ؛ هەرکە جریر گەیشتە سەرسنوری حەلەوان یەزدگورد بەرەو هەرێمی سپاهان ( ئەصفەهان ) هەلات ، جریر بێشەر هەربەئاشتی حەلەوانی گرتودەستی لەشەڕوکوشتار هەلگرت ،

وبەخەڵکەکەی ڕاگەیاند : « سەروماڵتان ئازادە » ، ئنجا سعـد جریروعزرە کوڕیقیس‌ی پێکەوە دانا بە فەرمانڕەوای حەلەوان ، ئنجاجریر بەرەو دینەوەر کەوتە ڕێ بـەڵام‌بۆی داگیرنەکـرا ، قرمیـسـینی داگیرکـرد بـەئاشتی وگـەڕایەوە بۆحـەلـەوان‌و لەوێ‌مایـەوە ( فتوح البلدان بلاذری ١١١ ) وادیارە کوردەکان کە لەستەمی ساسانی بەتەنگ هاتوون ئەوان بوون بەڕی‌نومای سپای ئیسلام‌و، شـەڕیان‌بۆ شاهەنشاهی نەکـردووە وهەمـو شارەکانیان هەربەبێ شەرو بەئاشتی داوەتەدەستەوە ...

پاشان کە « عمار کوڕی یاسر » بوبەوالی کوفە بۆجەریری نووسی : خـەلیفەی‌دووەم عومـەر کـوڕی خطاب » فـەرمانی داوەکەتۆ حەلەوان بەجێ‌بهێڵی‌و بچی بۆیاریدەی « ابو موسـا الاشـعری » ، جـریر سـالی ١٩ =٦٤٠زا بـەهێزێکـەوە جابۆیارمەتی ئەوو، رویشت‌بەرەو ئەهوازو لەوێوەرووی کردە ئەصفەهان، « عـزرە کـوری قیس »ی لـەجێی خـۆی دانـا بەفەرمانڕەوای حەلەوان ( فتوح البلدان بلاذری ١١١ ) یزدگورد بەرەوڕەی هەڵاتو لەوێ فـەرماندەیێکی بـەجێ‌هێشت نـاوی « خوسرەو شنوم »بوو ، بۆ بەرانگاریی سپای دوژمـن ، ئـەم فەرماندەیە نوخشەجار « زەینەبی » کوێخای حەلەوانی بەسپاوە نارد بۆ پێشرێ‌گرتنی ، زەینەبی لەشەڕا کوژرا «خوسرەوشنوم» ورەی‌بەردا هـەڵاتو سپـای ئیـسـلام بەرەوشـاری حەلـەوان پێشکەوت‌و داگیری کرد ، « قعقاع » لەوێ مایەوە تا سـعد کوڕی ابو وقاص گەیشت وکابرایێکی « قوباد » ناوی لـــە

جیی ئەو دانا بەسەرداری حەلەوان ونامەی موژدەی داگیرکردنی حەلەوانی نارد بۆ خەلیفەی دووەم « عمر کوڕ خطاب » (خ•خ)و داوای لێکــرد ڕێبــدات سپای ئیســلام لەســەر وڵاتگیری بڕوات بەڵام «عمر» ڕاضی نەبوو لەوەرامی نامەکەدا نووسی: حەزم ئەکرد لەنێوانی ڕەشمخاکی عراق ( ســواد )و هــەرێمی چیادا ( الجبل ) شورەێیکی ئەستوور ببوایە ( یا شورەیێکی ئاگر ) ؛ نەئەوان ڕێیان بوایە بەرەو لای ئێمە ، نەئێمەڕێمانبوایــــە بەرەولای ئەوان ، ئێمە دێهاتەکانی ڕەشمخاکی عراقمان بەسەو منسەر ســەلامەتی ســپای موســولمانم پێ باشترە لــە تاڵانو دەسکەوت • ( تاریخ الامم طەبەری ٤/٩٤ والکامل ٢/٥١٧ ـ ٥٢١ روضة الصفا ٢/٥٩١ ) •

لێرەدا دەبێ دیاردی بۆ ئــەوەبکەین : یــەکەم : ســپای ساسانی بەبێ یارمەتێ هێزی کورد هــەرگیز توانای شــەڕیان نەبــوومو، لــەهــەرکــوێ کــوردەکــان بــەئاشتــــی لەگــەڵ هێزەموسولمانەکان ڕێك کەوتوون ئەوان خۆیان ڕزگار کردووە وەکوئەبینین کە « زەینبیی کوژراوە « خوسرەوشنوم » بــــە سپاکەیەوە هەڵاتووە. وادیارە هەندێ لەکوردەکان هاوکارییان لەگەڵ سپایئیسلام داکردووە ، ئــەوەتا « ســعد » کوردێکی قوباد ناو دائەنێ بەسەرداری حەلەوان لەباتی قەعقاع •• هەروا دلێری کوردی حەلەوانی «زەینەبی » کە کوژراوە شوێنەکــەی بووەتە زیارەت گاە ، وناوەکەی گۆڕاوە بە « زەینەلی کوسە » ؛ لەدواییەدا ناوی ئەم دلێرەکوردە بووبە « زین القوس » !؟ •

دووەم : خەلیفە عمر کوڕی خطاب ئەڵێت : حەزم ئەکرد لەنێوانی ڕەشەخاکی عراق وچیادا شوورەیێکی ئەستوور ببوایە ... چونکە لەسەرەتادا خەڵکی چیانەبەردانـــــــــە بەرانگاری یان کردووە ، نەك سپای ساسانی کەهەرهەلاتـوون ، بۆیە ئالێ لەنێوانی ئێمەو فارس دا ... سالی ۲۱ کۆچی = ۶٤۱زا پاش ئەوەی کە سپای ئیسلام ئەهوازو شارەکانی ئوستانی فارسی داگیرکرد ئەو فارسانەی کەلەگەل « یزدگورد » بوون لەشاری مەرووەوە کەوتنە نامەنووسین وهەوال گۆڕینەوە بۆبەردەوام بوون لەسەر شەڕ « یزدگوردیش » لای خۆیـەوە نامەی نووسی بۆ پادشایانی ( باب ، سند ـ خوراسان ـ حەلەوان ـ کەئامادە بن وبچێن بەرەو نەهاوەندو ، شالاو ببەنەسەر دوژمن .. جا ئەوشەڕەی کەلەنەهاوەند قەوما ئەوەندە سەخت بوو ـ کەخەلیفە لەگەڵ یارانی پێغەمبەرا کۆڕێکی بەست و کەوتەڕاوێژ لەگەلیان ، دەربارەی چارەنووسی سپای ئیسلام وئەنجامی شەڕ ، جاهەندێکیان وتیان: دوستور بدرێ بەوهێزانەی کەلەشامن بەپەلە بەرەو ئێران بکەونەڕێ ، هەندێ وتیان : خەلیفە خۆی بڕوات بەهێزی کوفەوەو شەڕەکەبەڕێوەبەرێت ، علي کوڕی ابو طالب (خ.خ) هەستایە سەرپێ وتی : ئەگەر هێزەکانی شام بەرەوئێران بنێرین دوورنیە ڕۆمەکان شام داگیربکەنەوە ، ئەگەر خەلیفەش مەدینە بەجێ بێلێ وبچێت بۆکوفە ڕەنگەلەمەدینە ئاژاوەیێ بەرپابێ جا باشترین ڕا ئەوەیە سوود لەوهێزە ئیسلامانە وەبگیرێ کەلـە « بەصرە »ن ، پاش ئەوڕاوێژی یە خەلیفە : « عمر کوڕی مقرن »

ی دانا بەفەرماندەو سپاییکی بۆی پێکهێنا لە هێزەکانی مەدینە ـ شام ـ بەصرە ، بەرەو نەهاوەند بەڕێی خست ، پاشان کەموسولماتان نەهاوەندیان داگیرکرد خەلیفەی دووەم فەرمانیدا بەعتبە کوڕی فرقد ( وادیارە فرقد هەلەیە وراستەکە فرقد بێت ) وبکیرکوڕی عبدالله کەڕووبکەنە ئازربایجان هەریەکەلەقۆلی خۆیەوە ، جا « عتبە » لە حەلەوانەوە و «بکیر» لەموصلەوە کەوتنەڕێ .. ( طەبەری ٤/١٣٨ ، الکامل ٢/٥٣ وازعرب تادیالە ٢٧٠ ـ ٢٧٩ ) .

سالی ٣٤ک = ٦٥٤زا « عتبە کوڕی نهاس » ناوێ کرابوو بە ـ سەرداری حەلەوان ، سەرانی ولات هەمووکەوتبوونە ڕاوێژو تەگبیر بۆڕۆخاندنی خەلیفەی سێیەم « عثمان کوڕی عفان (خ.خ) ئەوەبو هەرئەو سالە کوژرا ( طەبەری ٤/٣٣٠ ـ ٣٣١ ) .

سالی ٣٨ک = ٦٥٨زا کەیاخیبەکان ( خوارج ) بەرامبەر بە « خەلیفەی چوارەم علي کوڕی ابو طالب » (خ.خ) کەوتبوونە شەڕەوەو شکستیان خواردبوو یەکێ لەسەرداران کەناوی « فروەکوری نوف اشجعی » بوو ، بەپێنج صەتگەمەوە « نەهرەوانی » بەجێ هێشت وبەرەو دەسکەرە « دەستکرد » کەوتەڕێ ولەوێوە ڕووی کردە « حەلەوان » وداگیری کرد ( الاخبار الطوال لاپەرەو ٢٢٤ تەرجمەی فارسی صادق نشأت ) ئەمدەسکەرەیەی ناویهات ( واتا دستگرد ) بەئاسکی بغداد

بەنابانگەو یەکێکە لەوشارە کۆنانەی کورد کەلەسەردەمی کەسرای ساسانی دا وێرانەبوبو ، بەڵام ئەوناردی لەئورفەو ئەسکەندەریەوە ئەندازیار و پیشەسازی هێنا بۆچاك کردنەوەی قەڵاوکۆنگەرەو شوورەڕۆخاوەکان . ئەم « دەستکردە » یە سەردەمی زندانبووە ، لەسەردەمی عەباسیدا لەوناوانەدا زۆر کۆشك وتەلار دوروستکرا ، بەڵام لەژێر فەرمانی بنەماڵەی حەسەنوەیهی ـعەیاری ـ جاڤان دابوو ، دێرینەو کەلاوەکانی ئەم شارە تا ئێستا لە نێوانی شارەبان ( مقدادیە ) ـ بەرازەرووذ ( بلدروز ) دا هەمارەوە ..

سالانی ٤١ ـ ٤٢ك ا = ٦٦١ ـ ٦٦٢ز ا معاویە کوڕی ابو سفیان ویستی « زیاد کوڕی ابوه » بخاتە بەراورد (محاسبە) کەگوێا هەموباج وپیتاکی ولاتی فارسی بۆخۆی لادابووە ، جا ناردی بەشوێنیا ، زیاد هاتو گەیشتەشام وچووەبارەگای معاویەو لەبەردەمی دا وەستا ، جالێی پرسی : کواباج وپیتاکی ولاتی فارس ؟! زیاد وتی : هەندێکی نێررا بۆ « علي کوڕی ابو طالب » وهەندێکیشی صەرفکرا بۆ کاروباری ولات کەزۆرپێتەویست بوو ، معاویە دەربارەی ئەوەی صەرفکرابوو باوەری پێکردو ئەوەشکە مابوە لێیوەرگرت وپێوت : تۆباوەڕپێکراوی ڕاستالی خەلافەتی ! . دیارە ئەمەی بەگاڵتەبوو چونکە علي کوڕی ابو طالب سالی ٤٠ك کوژرابو ...
( طەبەری ٥/١٧٨ ) .

سالی ٤٨ك = ٦٦٨زا ئەوانەی لە معاویـە یاخی بووبوون بڕیاریان دابوو دەس بەکاربن ، جاکابرایی ، کەناوی « معـاذ » بوو ، بـە « حیان کـوڕی ظبیان »ی وت : باشـترین جێگـەیێ کەئێمە شالآوی بکەینە سەر شاری « حەلەوانە » کەولاتێکـە ئەکـەوێتـە نێـوان پێدەشـت وچیـــاوەو لـە ناوەنـدی ولآتەو سنووردایە ... تاد .. ( طەبەری ٥/٣١٠ )

لەسەردەمی دەسەلآتی « یزید کوڕی معاویە »دا سـالی ٥٠ك = ٦٧٠زا « کثیر کوڕی شـهاب کـوڕی حصین کـوڕی ذو الغصـەی حارثی » دانرا بـەسەرداری هەرێمـەکانی ( ماهـ سەبزان ( پشتکو )و مهرگان گوچك ( مهرجان قزق )و حەلەوان ودینەوەرو نەهاوەند .. تاد ... ( فتوح البلدانی بلاذری ١٦٥ والبلـدان یـەعقوبی ٣٤ ) جـائـەوەی باشـە کـە ( بلـدان ) ناسیاری یەکی تەواوی بۆئەم جێیانە تۆمارکردووە : شاری ماهـ سـەبزان کەپێی ئەوترێ سـیروان شارێکەزلو بـەشکۆو فراوان ئەکەوێتە نێوانی چیاو هەڵەتەکانەوە زۆر لە شـاری « مـەکە » ئەچێت بـەلآم ئـەم ، ئاوو کانیاوی زۆرە ، کـە هەر لـەخۆیا هەڵئـەقوڵێ وبەنـاو شـاراچەنـدین جۆگـەئـاوێ ڕەوانـــە ، کەتا سێ قوناغـەڕێ پاشاوی ئـەڕوات ، کانیاوەکان لـەزستانا گەرماون ولەهاوینا سەرداون خەڵکی ئەم شارە هەڕەمەن .. لێرەوە ڕێ ئەڕوات بەرەو « صەیمەرە » کەناوەندی هـەرێمی میهرکان کـوچکـە . بـەم ناساندنـەی « یعقوبی » بــومان ڕوونئەبێتەوە کـەپشتکۆ دووهـەرێم بووە : ماهـ سـەبزانو

میهرگان کوچک به داخەوە ئەم سەر چاوەیەو زۆرسەر چاوەی تری لەوکاتەدا کەمن شەرەفنامەم تەرجمە کرد لەبەردەسانە بوونو هەندێکیان هەرچاپ نەبووبوون ، ئێمە بە هەڵەداچوین وامان زانی « سیروان » هەر « شیروانە »یە کەبەسەر ئاوی سیروانەوەیە ، کە هەڵەکەی‌من هەرپەیڕەوی هەڵەی خەڵک بووە •

ساڵی ٦٦ك = ٦٨٥ز « مختار کوڕی ابو عبیدەی ثقفی » شاری کوفەی داگیرکرد و سەرزەوی عراقو شارەکانی تریشی جگە لە جەزیرەوشام وقاهرە ـ هەموی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو کارگێڕو وکاربەدەست وبەڕێوەبەری بۆدانان ، جا کابرایێکی « بکراوی » ناوی کردە فەرمانڕەوای «ماه سەبزانو حەلەوانو دوستوری دایی کەلەگەڵ کوردەکان بجەنگێ وڕێکا بۆهاتنو چوون خۆش‌بکات ، هەروا « سعد » کوڕی حذیفە کوڕی یمان » یشی بەدووهەزار سوارەوە تاردو ومانگانە هەزار درهەمی بۆبڕیەوەو دوستوری دایی کەکوردەکان قڕبکا !؟ ( طەبەری ٣٤/٦ ) بەلام وادیارە کەکوردەکان سەریان بۆ ئەوانە دانەهێناوە ، بلاذری نووسیویە : هانییء کوڕی ابو حیەی علقمی تێرابۆ حەلوان بەهەزار سوارەوە بو پاراستنی ڕێگاگان بەلام تووشی کوردەکانی دینەوەر بو، شەڕو کوشتارێکی زور لە هەردوولا کرا•• (انساب الاشراف بلاذری ) ٤٥/٥ •

سالی ٧٦ك = ٦٩٥زا « شبیبی خارجی » کەلە دەولەتـی « ئەمـەوی » یاخـی بو بو ، سـەری بـۆ « حەجاجـی والیـی عـراق‌شور نـەئەکرد ، هێزەکانی خۆیی برپرموەکردبوو : جـا « ممصاد »ی برایی بەهێزێکـەوە نارد بـۆ حـەلەوان ... تاد ( طەبەری ٣٤ ( ٢٣١/٦ )

سـالی ٧٧ك = ٦٩٦زا « مطـرف کـوڕی شـعبـه » ـ کەبەنەرمانی عبدالملك کوڕی مروان دانرابوو بـەفەرمانڕەوای مەدائن شۆرشێکی بەرپاکردو کەوتە چـاوەڕاوو ئاژاوەنانـەوە دژی « عبدالملك ودژی حجـاج کـەوالیـی بوو ، رووی‌کـردە حەلەوان کـەلەوکاتەدا « سـوید کوڕی عبدالرحمن سـعدی » سەرداری ئەوێ‌بوو ، جاویـستی بەپشتیوانی کوردەکان ڕێ‌لێ بگرێ ومەیدانی نـەدا خۆی بکات بـە خاکی حەلەوانا بـەلام « مطرف » لەخشتەی بردنو فێلی لێکردن وله دەرفەتێکا خۆی کوتایـە ناو حەلەوان و خەلکێکی زۆری لە کوردەکان کوشتو لەوێوە بەرەو هەمەدان هەلات .. ( طەبەری ٣٩٠/٦ والکامل ( ٢٣٥/٤

سالی ٩٦ك = ٧١٤زا « سلیمان کوڕی عبدالملك اموی » لەسەر کورسی خەلافەت دانیشتو ( قتیبە کوڕی مسلم باهلی ) کەوالیی خوراسان بۆ ، نامەیێکی بۆی نارد لەگەل ئەسپـردەی تایبەتی خۆیا ولەنامەکەدا داوای‌لێکـرد : کەلەسـەر پایەکـەی خۆی بیهێلێتەوە ، ئەگەر نیازی ئەوەی هەبێ لەسەر پابەکەی لای‌بدا ئەوالێی دەکەوێتە چاوەڕاو بورژۆخاندلی هەول ئـەدات ،

سلیمان دوستوری‌دا کەشەو ئەسپردەکەی قتیبەو نامەکەی بۆ بەرنەبارەگا ، جا لەوێ بەخششێکی دابە ئەسپردەو پەیمان نامەی‌والێتی‌ی بەسەر خوراسانا بۆ قتیبە مۆرکرد ویەکێ لەپیاوانی تایبەتی خۆیشی لەگەڵ ئەسپردەکە نارد .. هەرکە ئەوان بەرەوخوراسان کەوتنەرێ وگەیشتنە حەلەوان هەواڵیان زانی کە سلیمان قتیبەی لەوالێتی ختووە ئەسپردەکەی سلیمان هەر لەوێوە بەرەوشام گەڕایەوە . ( الکامل ٥/١١٣ - ١٢٥ ) .

سالی ١٠٢ك=٧٢٠زا دارو دەستەی مسلمە کوڕی عبدالملك لە هەڵمەتێکدا « عثمان کوڕی محمد کوڕی اشعث » یان بریندارکرد ولەترسان هەڵاتن بەرەو حەلەوان ، نۆکەرانی عوثمان لەدوویان نەبوونەوە تاگرتیانو سەریان بڕین‌و کەللەسەرەکانیان نارد بۆ مسلمە بۆشاری حیرە ولەم‌هەرایەدا « ابن صول = کوڕی چول » پادشای کوهستان ( قهستان ) بەدیل گیرا ( طەبەری ٦/١٠١ والکامل ٥/٤٨٦ ) ئەم‌کوهستانە دەبێ هەرێمی هورامان بێت کەهەمیشە بەسەردارەکانی خۆیان وتووە سان ( سلطان ) ئەوەبو لەمەوبەریش وتمان یەکێك‌بووە لەهەرێمەکانی ئوستانی شاذقوباذ ..

سالانی ١٢٧ - ١٢٩ك = ٧٤٤ - ٧٤٦زا « عبدالله کوڕی معاویە کوڕی جعفری طیار کەلە سەردەمی مروان کوڕی محمد کوڕی مروان»دا هاتبووە کوفەو لەگەڵ هەندێ لەشیعەی‌زەیدی‌دا ڕێك کەوتبوو بە هاودەسی ئەوان شۆرشێکی بەرپاکردو خۆی

بەامام دایە قەڵەم وداوای لەخەڵك كرد بینبەپەیرەوی ، هەندێ کەس پێی خەڵەتان وكراسی سپیان لەبەركرد بەڵام «عبدالله كوڕی عمر كوڕی عبدالعزیزی اموی » بۆی چووە مەیدانو لەگەڵی كەوتەشەڕەوە وهێزەكەی تەرتەوەرتە كرد ، عبداللە ناچار كۆفەی بەجێهێشتو ڕویكردە « مدائن » وبڕێ خەڵكی كوفەش دوایكەوتن ، لەوێ دیسانەوە شۆرشی هەڵگیرساند وتوانی حەلەوان - كوهستان هەمەدان ئەصفەهان - ڕەی - قومس داگیربكات هەروا پاشان توانی فارس ( هەرێمی شیراز)یش داگیربكات ، بەڵام زۆری پێ نەچو كە « عبدالله » نوشوستی وبێبەختی گرتی بەفەرمانی ابو مسلمي خوراساني لەهرات كوژرا ( طەبەری ٣٠٣/٧ - ٣٧١ ؛ الكامل ٤٥٨/٤ )

ابو مسلم لەبنەڕەتا لەكوردەكانی نەهاوەند بوو ، بەمنداڵی لەماڵی « عقیل وعیسا » گەورەبووبوو ، كەماڵیان لە نەهاوەند بوو ، هەرلەوماڵەدا ساوەڵەوانی - شوانی - گاوانی - نۆكەری كردبوو ، كەهەڵچو لاوێكی زیتوزرنگی لێ پەیدا بوو خۆی خستەناو كۆمەڵە نهێنیيەكانی دژی ئەمەوی ، لەو ئەركانەدا كەئەنجامی دەدا ...ەرشانی زۆر نەبەردانە لەئاودەرئەهات ، كەكۆمەڵە دروشمی ئازایيو وهۆشیاريیان تیا بەدیكرد بۆچاوەڕاو ناردیان بۆخوراسان ، ساڵەهای ساڵ لەوێ مایەوە ، ئەم جولانەوەیە ، پیاوانی گەورەی وەكو امامی مالك ، ابو حنیفە، ابراهیمی طباطباو، زۆر لەمەزنانی مەدینەوكوفەو بەصرەی

تیابوو ، کەڕۆژگار کۆکوتەبا هاتە بەرهەم « ابو مسلم » لە خوراسان شۆرشی هەلگیرسانو سپای بەڕێخستو «ئەمەوی» ڕۆخاند و « عباسی » هاتە ناو بۆ بەدەستگرتنی خەلافەت ، بەم جۆرەنازناوی خوراسانی پێوەنووسا ، بەلام هەروەك وترا جگە لەوەی کە خۆی هەر خەلکی ئەهاوەند بو ئەبودولامەیش جەخت لەسەر کورد بوونی دەکا کە جنێوی دەداتێ لەم هەلبەستانەدا .

ابا مجرم ما غیر الله نعمة
على عبده حتى یغیرها العبد
« افی دولة المنصور حاولت غدرة
الا ان اهل الغدر آباؤك الكرد »

( حیاة الحیوان للدمیری ( ١/٣٠ ) باسی ( اسد ) ، لەوێ شتیزۆر سەیردەربارەی « ابو مسلم » نووسراوە ، بەلام ئەم تکنیەیەی کەلەعەرەبی وەرگرتووە ( ابو مسلم )ی والێ کردوو ، کەناوینازانزی باسیچۆن پەیدابوونی ئەمتەکنیەیە لەباسی « ئەیاریەکاتا ڕوون ئەکەمەوە کەزۆریان ( ابو )یان پێوەیە ..

سالی ١٢٩ك = ٧٤٦زا مروان کابرایێکی « ابن ضبارة » ناوی نارد بۆشەڕ لەگەل « شیبان » کەلە شاری ( سن )ی باشوری موصل لای یەکاو ( مخلط ) مەلبەندی کردبوو ، « ابن ضبارە » هەلی کوتایە سەری . وشیبان لەشەڕاشکا ، ابن ضبارە ڕاوینا تا ئەهوازو حەلوان !!؟ (طەبەری ٧/٣٥٠ )

سالی ١٣٢ك = ٧٤٩ز‌ا « قحطبه کوڕی شبیب » کەسەر بە « عباسی » بوو ، یەکێ بوولە فـەرماندەکـانی ژێر دەستی «ابو مسلم خوراسانی» شاڵاوی کرد بۆسەر وولاتانی ژێر دەستی مـەروانی ئـەمەوی ، لـەسـەرەتادا نـەهاوەندی داگیرکردو . « حسـن »ی کوڕیشـی نـارد بۆ داگیرکـردنی دژیمێـرگ (مـرج القلعـة)ـکە ئێستـە پێی ئـەوتـرێ : «سورخـە دزە»و داگیـیری‌کـرد ئنجـا بـەرەبـەرە قرمسـین - حەلـەوان - خانـەقینیشی داگیر کرد ، لەو سەردەمەدا فەرمانڕەوای حەلەوان « عبدالله کوڕی علاء کوڕی کندی » بوو هەڵات ، یوسـف کوڕی عمر کوڕی هبیره ، کـەلەعراق‌دا نوینـەری‌مروان بـوو بیستی کە « قحطبه » ئەیەوێ بەرەوعراق شاڵاوبکات ڕاپـەڕی بۆبەرانکاریـی‌و، ڕووی کـردە گوڵاڵـە ( جلـولاء ) ولـەوێ لەشکربەزی‌کردو سەنگەرو خەنەکی لێدا ... لەم کاتانەدا ابو مسلم فەرمانی‌دا بەقحطبە کەسي هەزارسوار هەڵبژێرێ وبیخاتـە ژێرفەرمانی « ابو عون کوڕی علی » و لەحەلەوانەوە بەرێـی بخات بـەرەو هـەردوزێ • ( وادیارە مـەبەستی لـەهەردوزی یەکاوبێ ( مخلط ) کەدووزێی گـەورەو بچوك لـەوێ تێکـەڵ بەیەك ئەبن ) جاسپاکەی « ابو عون »و سپـاێتێکـی « مـروان » لەشارەزوور لووتیان تەقی بەیەکاو کەوتنە شەڕەوە ، قحطبـه خۆیشی لەحەلەوانەوە بەرەوعراق شاڵاوی هێناو لە « دمما »ی نێوان « مدائن - انبار » - واتا نزیکی فەلوجەی ئێستا لەشکر بەزی کرد ( الاخبار الطوال ترجمەی فارسی صادق نشأت ٣٦٢ =

٢٣٨ ، طـەبەری ٧/٤٠٧ - ٤١٠ ، ئافـەرینش ٥/٦٧ ، ازعرب تادیالمـــە ٤٨٦ )

سالی ١٣٧ك = ٧٥٤زا پاش ئەوەی سپای « ابو مسلمی خوراســانی » دەوڵـەتی مەروانی ئـەمەویی ڕۆخانـدو شـام‌و جزیرەی داگیر کرد ، داوای ماوای لە «ابو العباس السفـاح »ی خەلیفەی عباسی‌کرد کەرێی بدات بچێت بۆحج ، ابـو العبـاس السفاح لەبەر ئـەوەی لەمەرامەکـەی کـەوتبووە گومانـەوە ، بەهێنێنـــی نامــە یێکـی بـــۆ ابـو جعفـر منصـــور ی برای نووسی : « ابو مسلم ئەیەوێ بۆ حج بچێ ، مەبەستی ئەوەیە کە بیکەم بەامیرحج جازۆرزوو خۆت ئامادەبکە بۆچوونە حج‌و وبەنامە داوای ماوای چوون بۆ ( مەکە ) بکە ، ئەگەرتـۆ لەوێ بی ناتوانێ لێت پێش بکەوێ ، ئابەم جۆرە لەیەکەم قۆناغا پاداشـی ئـەبومسلمی ئـەدایـەوە کـەدوێنێ ئـەوی هێنابووە سەرکورسی ، بەلی بەم‌جۆرە ابو مسلم وابو جعفر چوونە حج ! کاتێ لەوسەرەوە گەرانەوە لەرێ هەواڵی مردنی « ابو العباس السفاح » گەیشت ، ابو مسلم نامەیێکی سەرەخۆشی وپرسەی بۆ ابو جعفر نووسی بەلاّم پیرۆزبایی جـێگری‌و خەلیفەیتـی لێ‌نەکـرد ، ابو جعفر لـەم کـارە زۆر دلگیربوو ، لای کـەس نەیـــدر کانـــد ونامـەیێکـی پرلـەگلەیـی وگازەنـدەی بـۆ ابـو مســلم نووســـی .. پـاشـــان کـــە ابـــو جعفر لەسەر کورسی خەلافەت جێگیربو فـەرمانی دا بـە ابو مسلم

بچێت بۆ سەرکوت کردنی « عبدالله کوڕی علي » گویا مێنی یاخیتیو سەرچلی چووبووە لووتیەوەو سەری بۆ خەلافەتو دەسەلاتی « ابو جعفر منصور » شۆڕ نەدەکرد ودەستی ملکەچی وخۆفروشی (بەیعەت) بۆدرێژ نەدەکرد ، ابو مسلم بە سپایێکەوە کەوتەڕێ وچووە سەر عبدالله وسەرکوتی کردو تالانیکی زۆری هێنا ، بەلام هێشتا ابو مسلم لەجزیرە بوو کە ابو جعفر یەکێکی نارد بۆ دەفتەرگرتنی دەسکەوتو تالانەکە ( اتفال ) ، « ابو مسلم » لەم کارە زۆر تووڕەبوو ڕقی هەستا وبڕیاریدا لەوێوە بچێت بەرەو خوراسان ، هەرکە ابو جعفر دۆنگەی کردو تەواو بە باسەکەیزانی سڵەمیەوەو ، زانی ئەگەر ابو مسلم بگاتە خوراسان شۆرش بەر پائەکات ، لەبەرئەمەوە بڕیاریدا بەربڕی لەپسانی زنجیرەکەبکات ، زۆر بەپەلە نامەیێکی بۆنووسی: تۆمان داناوە بەوالیی « شام ومصر » کە هەمیشە لەخۆمانەوە نزیكبیت . بەلام ابو مسلم وەرامی نەدایەوەو جزیرەی بەجێ هێشت بەرەو خوراسان کەوتە ڕێ ، پاش چەند ڕۆژێ گەیشتە حەلەوان، ابو جعفر منصور ئاگرکەوتە کەولی ، کەسانێکی نارد بەدوایا کە بیگێڕنەوە بۆ « مەدائن » ، یارانی ابو مسلم قایل‌نەبون بەگەڕانەوەی بۆ « مەدائن »و تکایان لێکرد خواستی خەلیفە ڕەتبکاتەوەو، بەرەو خوراسان بکوتێ ونەوەستی ، بەلام خەلیفە کە هەستی بەزەنگی خەطەر کردبوو دەرفەتی‌نەدا ، لەسەر یەك دەستەدەستەی خەلکی بۆ خەلەتاندنی ودلنیاکردنی دەناردە حەلەوان ، ئەوەبو توانیان رازی بکەنو بیگێڕنەوە بۆ

مەدائن . هەرگە گەرایەوە ، یەکسەر چووە دیتنی ابو جعفر ، ولەوێ کەوتە ڕازوگلەیی و لەژێرەوە ابو جعفر زەلامی لەپشتی پەردەوە بۆکوشتنی ئامادەکردبوو ، ئەوەبوو ڕۆژی ٢٥ شعبان سالّی ١٣٧ك = ٧٥٤ز کوژرا ( طەبەری ٧/٤٨٣ – ٤٨٤ز ، الکامل ٥/٤٦٨ – ٤٧٥ ، روضة الصفا ٣/٣٩٠ ) ( وبۆ درێژەی باسەکە سەرنجی الاخبار الطوال بدەن ) ..

ئێمە گەرچی لەم سیپارەیەدا تەنیا باسی مێژوویێ تۆمار ئەکەین کە تەنیا پێوەندی بەحەلەوانە بێت بەلاّم جارجارە خود ناوی حەلەوان لە باسێکی درێژا دێت ناچاردەبین هەمووی‌بنووسین بۆئەوەی لامان گرنك بێت .. بەلاّم ئەم‌باسە کەناوی حەلەوانی تیایە تەنها بۆ زانخاوی دەماخ ئەینووسین ( وەکوماموستا سەجادیی خوالێخوشبوو فەرموویەتی ) :-

« لە تەنگەی حەلەوان دوودارخورما نزیك بەیەك چووبوون بەعاسمانا وهەر وەك دویار کەدەمیان کردبێتە ملیەك تێکەڵ بەیەك بووبوون، ڕێگەکەیان بەتەنك هێنابوو ، بەلاّم خەلّك لەبەرجوانی وپیرۆزی نەیانئەبڕییەوە ، لەسەردەمی أبو جعفر منصوردا هەستیارێکی عەرەب کەناوی « ابو مسلم کوڕی مطیع کوڕی ایاس کوڕی لیثي کنانی » بوو ، هەم دەورانی ئەمەوی دیتبوو هەم دەورانی عەباسی ولەشاری « رەی » یاریدەدەری « مسلم کوڕی قتیبەی باهلی » سەرۆکی شاری « ڕەی »بوو ،

واڕێکەوت ابو جعفر منصور ناردبووی بە شوێن « مسلم »دا بۆ هەندێ کاروبار بگاتە بەغدا ، ئەویش « مطیع »ی لەگەڵ خۆی هێنابوو بەرەو بەغدا، «مطیع» نابە دڵ هاتبوو یارە جوانە کەی لە « ڕەێ » بەجێ مابوو کەگەیشتبووە حەلەوان وئەو دوودارخورمایەی سەرەڕێی دیبو کە وەکو دوو دلدار چووبونەیەکا، خۆیو دۆستەجوانە کەیی هاتبووە بیراوکەوتبووە گریان وفرمێسك ڕژتنو هۆنینەوەی پارچە هەڵبەستێ پڕلەسۆز کەئێمە ئەم چەند بەیتەی لێ وەر ئەگرین :

« اسعداني ! یا نخلتي حلوان ! وابكياني من ریب هــذا الزمـــان »

« واعلما ان ريبه لم يزل يفرق بين الالاف والجيران »

« ولعمري لوذقتما الم الفرقة أبكاكما الذى ابكاني »

« اسعداني وايقنا ان نحسا سوف يلقاكما فتفترقان »

واتا : خۆشبەختم بکەن ! ئەی دوودارخورما کەی حەلەوان ! بۆمبگرین دەربارەی کاری نارەوای ڕوژکار . باش بزانن کەبەدکاریی ڕۆژگار هەمیشەبەر دەوامە بۆجیایی خستنە نێوانی هۆگرانو هاوسێیان .. بەڵیانم سوێنبێ ! ئەگەر ئێوەش وەکومن ئازاری جیا بوونەوە بچێژن ئەتانگرێنێ ئەوەی کە منی هێناوەتە گریان ...

خۆشبەختمبکەن ! دلنیاش بن کەشومێك ڕۆژێ لەڕۆژان ڕێی ئەکەوێتە ئێرەو لەیەك جیائەبنەوە ...

جا جارێکیان خەلیفەی عباسی المهدی بالله کوڕی منصور بەحەلەوان داراتەبورێ وئەم دووداره خورمایەئەبینێ کەڕێگەکەیان هێناوەتە تەنگ دوستور ئەدات بەبڕینەوەیان ، بەڵام ابو جعفر نەیی لێ‌ئەکات‌و پێی ئەڵێت : مەبە بەوشوومەی کەلەپارچە هەلبەستەکەی « مطیع »دا وتراوه ، پاش‌ئەوە جارێکیان « هارون الرشید » ئەچێتە « ڕەی » و لەوێ دوچاری ئەوژەی وشاری خوێن ئەبێت ، حەکیمە ناوهۆزەکان ئاموژگاری ئەکەن تێرکەی ومچە خورما (جمار) بخوات، ئەویش فەرمان ئەدات بەوالی ڕەی تێرکی بۆپەیدابکات والی ئەڵێت: لەولاتی ئێمە دارخورما نیە کەسوود لەتێرکەکەی وەربگرین،وەك ئەیزانم تەنیا لەتەنگەی حەلەوان دوودارخورما هەیە ئەگەر دوستور ئەفەرموی بنێرین بیانبڕن، هارون فەرمان ئەدات، پەیك ئەڕوات ئەیبڕیتەوەو تێرکەکەی بۆدێنی ، هارون الرشید تێرکەکە ئەخوات‌و چاك‌ئەبێتەوە .. پاشان ئەکەوێتەوە بیری کەئەم دارخورمایە ئەوەبوو کە «مطیع» وتبوی : ( باوەربکەن ڕۆژێ‌دێت شومێ لەیەك داتان ئەبڕێ) ئەوەبوو لەوەبەر مهدی لەبەر بەدناوی شومێتی وازی لەبڕینی هێنابوو ( معجم البلدان ۲/۲۹۰ ـ ۲۹۳ واغانی ۱۲/۷۹ ) ..

سالی ۱۷۹ك = ۷۹۵ز‌ا هەر لەسەردەمی خەلیفەیێتی هارون «ولید کوڕی طریف تەغلەبی» لەجزیرەی ابن عمر دژی خەلافەتی عباسی ڕاپەڕی وجاڕی شۆرشی دا وبە هێزێکی زۆرەوە ڕوی کردە « ئاذربایجان » وداگیری کرد وقەڵەمڕەوی سنووری

خۆیی تا حەلەوان وسەرزەوی ڕەشەخاکی عراق ( سواد ) پەرەتیدا . هارون الرشید دوستوریدا به « زائد شیبی » کە بەسپایی تەیارەوە بچێتبۆ سەرکوت کردنی،پاش چەند شەڕیکی سەخت « ولید » شکستی هێنا وشۆڕشەکەی دامرکایەوە ( الکامل ٦/١٤١ والتنبیه والاشراف ترجمەی فارسی ٣٣٠ )

سالی ١٩٥ك = ٨١٠زا لەسەرکورسی خەلافەت ناکوکی وناخۆشی کەوتبوە نێوانی « امین » و « مأمون » کوڕانی هارون الرشید ، امین سپایێکی پەنجا هەزارکەسی تەیار بەفەرماندەیی « علي کوڕی عیسا کوڕی ماهان » خستەڕێ بۆ دەستگیرکردنی مأمون کەئەویش لەلایخۆیەوە سپایێکی باشی بەفەرماندەیی ذو الیمینین طاهر کوڕی حسین کوڕی مصعب « بۆبەرهەم هێنانی ئامانجی خۆی تەیارکردبوو ، وگەییبوە ئاوایی ( شلاشان ) نزیكبە حەلەوان لەوێ خەنەکی لێدابوو سەنگەری بەستبوو ، وتیادامەزرابوون وتاسالی ١٩٦ هەرلە حەلەوان مانەوە ، ئنجا لەسەرفەرمانی « مأمون » هەرێمە داگیر کراوەکانی سپارد بە « هرثمە کوڕی اعین » وخۆیبەرەو « اهواز » بەسپاوە جماو چوو ئەوێشی داگیرکرد « طەبەری ٨/٤١٢ - ٤٢٨ ، والکامل ٦/٢٤٨ - ٢٥٨ )

سالی ٢١٥ك = ٨٣٠زا مأمون کەبووبەخەلیفە ئەیویست بەرەوڕوم بڕوات « ابراهیم کوڕی مصعب » ناوێکی ، لەبەغدا لەجێی خۆی داناو فەرمانڕەوایی حەلەوانو دەوروپشتی دایێ

سەرەڕای دەوروبەری دجلە ( طەبەری ٨/٦٢٣ - ٦٢٤ ، الکامل ٦/٤١٧ )

سالی ٢٢٢ك =٨٣٨زا « بابك‌خرمدین » کەوتەداوی دیلێتی ڕۆژی ١٠ مانگی شوال بردیانە « بەرزەند » بۆلای ئەفشین کەسالارسپای معتصم عباسی بوو .. جا لەوڕۆژەوە کەئەفشین لە « بەرزەند »ەوە کەوتەڕێ بەرەو سامەڕاء تاگەیشت هەمو ڕۆژێ معتصم ئەسپێکی ڕازاوەی بەخەلاّتەوە بۆی دەنارد وەهەرلەبەر ئەوەی ڕێگای نێوان حەلەوان ـ سامەراء زۆر ناهەمواربوو، بەفریش گەردەنەی حەلەوانی بەستبوو ، معتصم کەوتبووە دلەکوتێ، وەقرەی بەخۆی نەدەگرت تووشی وڕاوە کردن هاتبوو ، لەسەر هەر فەرسەنگە ڕێی تەتەرێکی داتابوو کەزوزو هەوالی «بابەك» بگەیێن‌و ، هەرلە ئازربایجانەوە تا حەلەوان هەم‌ئەسپی یەدەك بوگەیاندنی تەتەرەکان ئامادەبوو ، هەم کۆتر بۆهەلدانو گەیاندنی نامەکان ئامادە کرابو ، کە هەموڕۆژ ئەسب ئەڕەتێنرا وکۆتر هەلئەفڕێنرا ( طەبەری ٩/٥٢ ) ترجمەی فارسی ابو القاسم پایەندە ١٣/٥٨٤ ) بەلاّم ئەم ئەفشینە خزمەکارە دلسوزە ، پاش ماوەیێ بەرڕقی معتصم کەوت هەمو ئەو دیاری‌و خەلاّتانەی لێ سەنرایەوەو بەویەڕی ئازاردان وسزادان لەبەندیخانەدا گەرۆگولبوو بەوجۆرە کوژرا ڕاستەکەوتراوە « من اعان ظالما سلطه الله علیه »

سالی ٢٤١ك = ٨٥٥زا جۆرەدرمێکی کۆکەڕەشەو ، هەلامەتی سەخت لەتورکستانو سەرخەس‌و نیشابورو ڕەی

وهەمەدان وحەلەواندا داکەوتخەڵکێکی زۆری کوشت ...
( الکامل ٦/٣٧٢ )

ساڵی ٢٤٨ك = ٨٦٢زا « المستعين بالله خەلیفەی عباسی « بوغا شەرابی » ناوێکی کردە فەرمانڕەوای ماهسەبەزان ـ میهرگانبچوك ـ حەلەوان .. ( طەبەری ٩/٢٦٤ الکامل ٧/ ١٣٠ ) !

ساڵی٢٥١ك =٨٦٥زا ١٣ مانگی صەفەر دەستەێ سەربازی تورکمانی سەر بەسپای عباسی کەلەگەڵ سپای تیکەڵی عراق دا تێوانیان تێکچووبوو ئەیانەویست کاروبار وەربگرنەدەست خۆیان ؛ بەرەو بەغدا کەوتنەڕێ وخۆیان گەیاندە « نەهرەوان » هێزێ لەو سەربازانەی لەژێر فەرمانی «عبدالله کوڕی محمودی سەرخەسی دابوون لەبەغداوە بۆبەرانگاریان کەوتنەڕێ ، بەلام ترسانو بەرەودووا هەڵاتن وچارەواو ولاغەکانیان بەتالان چوو، هەندێکیان بەپەرپوتی وشری رزگاربوونو خۆیان گەیانـدە بەغدا، پاش ئەوەی پەنجا کەسێکیان لێکوژرا، هەروا ٦٠کەرو چەند هیسترێکی ئەوکاروانچی یانەی کەلە « حەلەوانـەوە » بەفریان بۆبەغدا ڕائەکێشا بەرتالان کەوتو، برانبۆ سامەراه لەگەڵ کەللەسەری ئەوسەربازانەی کوژرابوون ، بەمجۆرە رێی بەغدا ـ خوراسان کەوتە ژێردەستی سەربازە تورکـەکـان ( طەبەری ٩/٢٩٤ )

ساڵی ٢٥٣ك = ٨٦٧زا خەلیفەی عباسی المعتز باللـه پارێزگاریی‌و پاسەوانی ڕێی بەغدا ـ خوراسان ـ حەلەوانـی

سپارد به « بنداری طه‌به‌ری » ـ که‌باره‌گای فه‌رمانبه‌ری‌یه‌که‌ی شاری « ده‌سکه‌ره ( دسکرد )بوو ـ هه‌واڵیشی پێ گه‌یی که « مـاور کوڕی عبد الحمیـد »ی موصـلي یاخی هـه‌ریمی که‌رخ‌جـدانی ( قـه‌ره‌خان )ی داگیر کـردووه « مـاور » له‌بهوازیجه‌وه سه‌ری‌هه‌ڵدابوو که‌ده‌که‌وته خۆر هه‌ڵاتی تگریته‌وه که‌ده‌بێ له‌جێی ئێسته‌ی «زغه‌یتوون» بووبیت (که‌لای خوارووی حه‌ویجه ئاوه‌کانی خاصه ـ ڕۆخانـه تێکه‌ڵ به‌یه‌كئـه‌بن ) جـا « بندار » بۆ سه‌ر کوت‌کردنی به‌سێ صه‌ت‌سواره‌وه ڕووی‌کرده « که‌رخ جدان » : هێزه‌کـه‌ی مساور ۷۰۰ کـه‌س‌بوون پاش شه‌ڕێکی سه‌خت بندار شـکستی خواردو هـه‌ڵاتو سـوارانی مساور دووی که‌وتن‌و به‌دیل گرتیان وکوشتیان ، ئنجا «مساور» شالآوی‌کرده « حه‌لوان » به‌ڵام خه‌ڵکی حه‌لوان زۆرپیاوانـه به‌ر هـه‌ڵستی بـوون وچوار صـه‌ت کـه‌سێکیان دابه‌کوشـت بۆبه‌رگری ، له‌هێزه‌که‌ی مساوریش چـه‌ند ده‌ستـه‌یێ کوژرا ؛ له‌م‌کاتمدا هه‌ندێ له‌ڕیبوارانی خوراسان که‌به‌ره‌وشاری «مه‌که» ئه‌چوون بۆحه‌ج لـه‌م شـه‌ڕه‌دا سـه‌ریان تیاچوو ، « مساور » ده‌رباره‌ی ئه‌م شالآوه پڕکاره‌ساته ئه‌م هه‌ڵبه‌سته شانازی‌یانه‌ی وتووه :

« فجعت العـــراق ببندارهـــا
وحزت البلاد باقطارهـــا »
« وحلوان صــبحتها غـارة
فقتلت اغـرار غرارهـــا »

« طەبەری ۹/۳۷٤ ۳۷٦ والکامل ۷/۱۸۰ )

وادییارە کەرخجدان دووجێگەیە : یەکەم ناوەکە گۆڕاوەبە « قـەرەحسن » دووەم گۆڕاوە بـە ( قـەرەخان ) ئـەموشـەی « کرخ »ەکوردیەکی‌کۆنـە ، واتـا کناری‌ڕووبار ، هەرلـەوێوە هاتووە « کـەرخینی = کەرکوك ، کەرخجدان = قـەرەحسن ، کەرخجدان = قەرەغـان ، کەرخ = بـەری‌خورئاوای بـەغـدا کەرخە = ڕوباری کەرخەی لورستان ـ خوزستان .

بەڵێ ! وادییارە « مساور » لەشەڕی یەکەمدا نەیتوانیوە حەلەوان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە . بـەڵام لەشەڕی دووەمدا داگیری کردووە وکوشتارێکی خراپی لەوناوەدا کردووە ، ابن الاثیر نووسیویە :

ساڵی ۲٥٥ك = ۸٦۸زا « مساور کوڕی عبدالحمید »ی موصلی یاخی کابرایێکی « موسا » ناوی دانابوو بەفەرمانبەر لە « دەسکەرە » وشارەکانی سەربەوێ‌و سـێصەت کەسیشـی خستبووە ژێر فەرمانی وکردبووی بەفەرمانڕەوای هـەرێمەکانی « حەلەوان ـ تا ـ سوس »و « بطن جوخی » « واتا بەرازەروز ـ میهروز » ( طەبەری ۹/٤۰٥ والکامل ۷/۲۰۳ )

ساڵی ۲٦٤ك = ۸۷۷زا کابرایێکی «ابن الدیرانی» ناوخۆی کرد بەهەرێمی « دینەوەردا بەڵام « ابن عیاض‌و دلف کـوڕی عبدالعزیز» ماوایان نەداولێی ڕاپەڕین ومال‌وسامانیان داگیرکردو ڕاویان ئاتاگیرایانەوە تاوحەلەوان ( طەبەری ۹/٥۳۳ )

سالی ٢٦٨ك = ٨٨١ز کابرایێکی « عمرسیما »ناو کرابو بەسەرۆکی حەلەوان ، بەڵام « ابن شبث کوڕی حسین » ناوێ لێی یاخی بوو حەلەوانی لێی داگیرکرد ، ئنجا حەلەوان سپێررابە « کیغلغ خلیل کوڕی ڕمال » لەمەڕێمەکەدا زەبرو زەنگێکی سەختی خستەکار دەربارەی خەڵکی ئەو ناوە ، ومرۆڤی ئەو ناوەی بەتاوانی یاخی بوونی « ابن شبث » سزاداو تاسالی ٢٥٨ك = ٨٧١ز بەسەرداریی حەلەوان مایەوە (طەبەری ٦٠٦٩ - ٦٠٧ والکامل ٣٧١/٧ - ٣٩١ )

سالی ٢٦٩ك = ٨٨٢ز ١٩ مانگی شوال « جعفر کوڕی معتمد »ی عباسی « کە مافیێ سپێرراو ( مفوض ) بوو ، بۆسەرکاریی کاروباری وڵات ، ئەم هەرێمانەی خستە ژێردەسی « صاعد کوڕی مخلد » ناوێ : ( شارەزور - دراباد - صامغان - حەلەوان - ماه سەبەزان - مهرگانکوچك وزۆر جێی تری ( طەبەری ٨٢٨/٩ ) .

ماوەیێکی دوور ودرێژە کەدارابادو صامغان ناویان لەناوانا نەماوە لەگەڵ ئەوەشدا کە « مسعودی » لەکتێبی « التنبیه والاشراف » دا لاپەڕە ٥٢ - ٨٤ ترجمەی فارسی ابو القاسم پاینده ) بە « وڵایت » ناویبردووە وگوتیا کەوتووتە نێوان ( شارزور ئاذربایجان - ارمینیه )وە کەدەبێ بەپێی ئەم ناساندنە شارێ بووبی لەشارەکانی کوردستانی ئەردەڵانی کۆن لەدەورو بەری سنەی ئەمڕۆ ، بلاذری‌ش لەفتوح البلدان لاپەرە ٣٢٥ دا نووسیویە ( شارەزور - صامغان - دراباد ) لەلایەن

عتبـەوە داگیرکراون • زۆرسـەیرە « دوکتور ئاذەرنووشـی ئاذەرتاش » لە ترجمەی فتوح البلدان دا بـۆ فارسـی ئاوەکـەی گۆڕیوە بە ( دامغان ) وبیری لەوە نەکردۆتەوە کە ( دامغان ) لە هەرێمی طـەبەرستان = مازەندەران دایـە ، نـەك کوردستانا ، دوکتور حسام الدینی نـەقشبەندیش لـەڕەخنەیا نووسیویـە : صامغان دەبێ نزیکی چەمیزمکان بوو بێت ، بەلام من ئەوەبەدوور ئـەزانم چونکەنووسـەرانی ایرانی ئیستـەش ناوی « زمکان » ئەکەن بە « ضەیمەکان » وبەچەماوێکی دائەنین کـە لەکرندەوە سەرەوخوار ئەبێتەوە ( فەرهـەنگی جوغـرافیایی ڕەزمئـارا ـ تحقیقات سرحدیە ١٠٨ وترجمەی سیاحەت نامەی مسیوچریکوف)

سالی ٢٨٠ = ٨٩٣ز ا خەلیفەی عباسی « المعتضد باللـە » فەرمانی دا : گیروگرفتی ڕێی ئاو تەنگەی حەلەوان ( عقبـە حلوان ) لابـرێ ، جابۆخۆش کردنی ڕێگـە ٢٠ هـەزار دینار صەرف کرا ( المنتظم ١٤٣/٥ )

سالی ٣١٥ك = ٩٢٧ز ا هەوال گەێنرا کـە (ئەبو طاهری قرمطی » لە « هجر » ەوە بەرەو کوفە شالاوی هێناوە ، « المقتدر بالله عباسی فەرمانیدا بە یوسف کوڕی ابو ساجی سەردار سپای خۆی کەزۆر بەپەلە بەرەو کوفە بجمێ وسپا بەرێ بۆسەرکوت کردنی : ئەوەبوو لەپاومانی مانگی ڕۆژووی ئەوسالەدا لـــە « واسط »ەوە بەرەوکـوفەکەوتـە ڕێ وشـەڕێکـی زۆرقورس لەنێوانیانا قەوما ، سپاکەی یوسف شکستی خوارد وهێزەکانی هـەلاتن وخود یوسف بـەدیل گیـرا ، بـەلام چونکـە بریندار

بووخرایه ژێردەستی بۆیشــك ، هەر کەئــەم هەواڵــە گەیشتـــە بەغدا خەڵکی پایتەخت لەترسانا هەڵاتن‌و پەنایان بردە هەرێمەکانی حەلەوان‌و هەمەدان و واسط . ( الكامل ٨/٢٦١ )

ساڵی ٣١٧ك = ٩٢٩زا خەلیفەی عباسی « القاهر باللـه » پاس‌وپاراستنی شارێتی خوراسان ـ بەغدا ـ حەلەوانی سپـارد بەکابرایێکی « ابـن حمدان » نـاو وکردیشـی بـەفەرمانڕەوای حەلەوان‌و هەندێ هەرێمی تری ( الكامل ٨/٢٦١ )

ساڵی ٣١٩ك = ٩٣١زا « مەردئاوێژ ( مرداویج ) هەرێمی چیاو ڕەبی داگیرکردو کەوتە پەرەپێدانی دەسەڵات‌و تەنینەوەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی جا « المقتدر بالله عباسی » یـەکێ لەفەرماندەکانی سپاکەی خۆیی ـ کەناوی هارون کوڕی غريب الخال » بوو ـ وادیارە کوڕەخاڵی خەلیفەبووە ـ بەسپاوە نارد بۆ بەرانگاریی مەرداوێژ ، جا هەردوولەشـکر لـەدەروبـەری هەمەدان تەقین‌بەیەکا ولەپاش کوشتارێکی سەخت لەهەردوولا هارون شکستی خوارد وسپای خەلیفە هەڵات ، مەرداوێژ هەمو هەریمـەکانی چیاودەوربـەری هـەمەدانی داگیرکردو یـەکێك لەفەرماندەکانی خۆیی کەناوی « ابـن علان » قـەزوینی بـوو خستەڕێ بەرەو دینەوەر ، ئەم « ابن علان »ە بەزۆری شیروتیر شـاری‌دینـەوەری داگیرکـردو خـەڵقێکی زۆری لـەمرۆڤی ئەوناوەکوشت ، وسپاکەی مەرداوێژ تا حەلەوان پێشکەوت‌و کەوتەتاڵان وبڕۆی ئەوناوە وگـەلێك ماڵ‌و ئافرەتیشی بـەدیل گرت ( الكامل ٨/٢٢٧ )

سالی ۳۲۷ك = ۹۳۸ هادە « ڕائقی سپاسالاری عەباسی »
داوای یارمەتی لە نەصیری‌یەکانی حەلەوان‌کرد ( مەبەستی
گۆڕانەکاکەیی‌یەکانە ) دژی ترجومانی هەوالی بوجگوم ( العیون
والحدائق ۲۷۲ ) بەلاّم دوورنیە کەبە هەلّەداچووبێ چونکە
« الکامل » دەلّێ : لەگەلّ قەرامطەکان دژی خەلیفە نامەی
ئەگۆڕی‌یەوە کە قرمەطی‌یەکان هاتنە ناوبەغداوە ڕائق‌بەغدای
داگیرکرد لەخەلیفە ( ۸/۳۵۳ )

هەروا کەبوجگوم وبەریدی‌خەزوری بڕیاریاندا دژی
بوەیهی‌یەکان شۆرش‌بکەن ، بەریدی بوجگومی نارد بۆ
سەرکوت‌کردنی کوردەکان بوحەلەوان ، بەلاّم کەبیستی بەریدی
خەریکە ملی بەشکاندن‌بدات گەڕایەوە ( ابن مسکویە ۱/۴۱۱
- ۴۱٤ )

سالّی ۳۲۸ك - ۹۳۹ ڕاضی خەلیفەی عباسی بوجگومی
ناردەوە بۆحەلەوان بۆسەرکوت‌کردنی شۆرشگێڕەکان ( الکامل
۸/۳٦۱ )

سالّی ۳۲۹ - ۳۳۰ك = ۹٤۰ - ۹٤۱ هاد ( ابو علی کوڕی
محمد کوڕی مظفر کوڕی محتاج ) کە سەردار سپای دەولّەتی
سامانی‌و فەرمانڕەوای خوراسان‌بوو لەگەلّ دەولّەتی بوەیهی
نێوانیان تێکچو بەسپایێکی گەورەوە بەرەوخۆرئاوای ولاّتو
هەرێمەچیاکان شالاّوی هێناو شارەکانی ( زەنگان - ئەبهەر -
قەزوین - قوم - کەرەج - هەمەدان - نەهاوەند - دینەوەر -

تاسنوری حەلەوانی داگیرکرد ولەهەر شـاریٚو لەهەرهەریٚمـیٚ سەداریٚـی داناو کەوتەباج وپیتاك کۆکردنەوە ( الکامل ٨/٣٣٨ – ٣٨٩ )

بەلام سالی ٣٣٣ك = ٩٤٤ز « رکـن الدولـەی بوەی » هەلی کوتایە سەرشاری « رەی » کوردەکانی ئـەو ناوە پشتی « ابو علی محتاجیان » بەردا وخۆیان دایەپال « رکن الدولە » جا « ئەبوعەلی » شکستی خواردو هـەلات ( الکامل ٨/٤٤٣ ) وەلیٚ هەرلەمانگی جمادی الثانیەدا هەلی کوتایەوە سـەر رەیو « رکن الدولەی »را رفاندو خۆی لە « رەی » سپـا بەزیکرد وابو العباس فضل کوری محمد »ی برای خویی نارد بۆ ولاتە چیاکان ودایناً بە سەرداری هەمەدان و سپاسالاریی شی پیٚسپارد فضل چوو نـەهاوەندو دینـەوەرو شـارانی تـری ئـەوناوەی داگیرکردو دەستی دۆستایەتی بۆسەردارەکوردەکان دریٚژکرد، ئـەوانیش بارمتـەکانیان بـۆناردەوە ( الکامـل ٨/٤٤٤ ) ئـەم سەردارەکوردانـە ناویان‌نیە لـەم‌سـەرچاوانـەدا ( تاریـخ الامم والملوك طەبەری ، تجارب الامم ابن سکویە ، الکامل ابن الاثیر ) بیگومان سەردارەکانی ایرانی – عەیشانی – بەرزینی شازەنگانی بـوون وەکو حسـین بـەرزیکانی و « ابـن ابـو الشـەوك » ، کەلەمەودووا باسیان دیٚتو سەردەمیٚکیش پشتیوانی « رکـن الدولە »بوون

سالی ٣٣٥ك = ٩٤٦ز دیسانەوە ابو علی محتاج بەرامبەر بەسپای بوەیهی کەوتە شەرەوەوشکستی خوارد رکن الدولـە

ئەو ولاّتانەی داگییرکرد (ڕەی ـ چیا ـ فارس ـ ئەهواز وعراق..
تاد ( الكامل ٨/٤٦٧ )

ـ سالّی ٣٣٩ك = ٩٥٥ز دیسانەوە دەولّەتی سامانی بەفەرماندەیی « منصو قراتكین » توانی ڕەی ـ هەمەدان ـ چیا قرمیسین « داگییربكاتەوە ، ڕكن الدولە لەمكاتەدا لەفارس‌بوو ، هاواری نارد بو « معز الدولە »ی برای كەبگاتە ئەوێ .. معز الدولە ، نامەی‌نووسی بۆ « ابن ابو الشوكی كورد وسەردارانی تری ئەوناوە كەبەرانگاریی سپای سامانی بوەستن ( الكامل ٨/٤٨٦ ـ ٤٨٨ ) .

بۆیەكەمجار لەمێژوی سالّی ٣٣٩ ك = ٩٥٧ز ناوی « ابن ابو الشوك » دێ ، بەلاّم ناوی ڕاستی ئەوچ‌بوو ؟ خەلّكی كوێ‌بووە ؟ بۆزانیاریی تەواو چاو ئەگێڕین بە « تجارب الامم »دا كەسەرچاوەی الكاملە بزانین چی نووسیوە ؟ : « كەباسی توركەكانی سەربە « توزون » گەیشتە « معز الدولە » نامەی نووسی بو « ابن ابو الشوكی كورد وپیاوماقولاّنی تری سەربەحەلەوان داوای‌لێكردن كەبە هێزەوە بگەنو بەرهەلّستی توزونیەكان‌بكەن ، جاهاتن‌و وتوزونیەكانیان ڕاڕفاندو كەوتنەدوویان ، هەم لییان بەدیل گرتن‌و هەم‌لێیان كوشتن ... پاشان دیلەكانیان نارد بۆ بەغدا ( تجارب الامم ٢/١٣٩ ) بەلاّم خود توزون هەروەك لە الكامل دا نووسراوە سالّی ٣٣٤ك لەبەغدا مردبوو .

سالی ٣٤٢ك=٩٥٣زا جارێکی تری ناوی «ابن ابو الشوك»
بەرچاو ئەکەوێ ، خەلیفەی عباسی المطیع لله ویستبووی ئاشتی
بخاتەنێوان دوودەولەتەی « سامانی »و « بویهی » وئەسپردەی
ناردبوو بۆخوراسان کەئەسپردەکە گەراوە وگەیشتە حەلەوان
« ابن ابو الشوك » بەهێزەکوردەکەیەوە رێی لێگرتن وتالانی
کردن وئەو کاروانەشی هەر تالان کرد کەلەگەلیان هاتبوون
وتێرراوەکانیشیان بەدیل گرتو پاشان بەرەلای کردن لەسەر
ئەمکارە معز الدولە سپایێکی بەرێ خست بۆ حەلەوان بۆشەر
لەگەل کوردەکان ( الکامل ٨/٥٠٥ ) ابن الاثیر ئەمباسەی
بە گەلالەیی لە «تجارب الامم» وەرگرتووە، بەلام ئێمە ئەچینەوە
سەر « تجارب » کەنوسیویە : « ... کە ابو مخلد لەخوراسان
گەرایەوە وابو بکر عبدالواحد کوری عمروی شەرابیشی
لەگەل بوو ، ابن ابو الشوکی کورد ـ کەلەعێلی شازەنگانی بوو
ـ ولە حەلەواندا کاروباری یاریدەدەریی ( معاونە )
خرابووەئەستو سەرەرای پاراستنی هێمنیو ئاسایشی
وپارێزگاریی رێگاکە ؛ ئەو لەسەرەتادا پێشوازی لێکردن
وخولکیکردن وپاسەوانی لەگەل ناردن ، بەلام پاشان خۆی
ستەمی لێکردنو تالانی کردن ، هەروا ئەوکاروانەشی تالانکرد
کەلەگەلیان هاتبوون ، وخود مخلدیشی بەدیل گرت بەلام ابو
بکر عبدالواحد کوری ابو عمرو شەرابی خۆی دەربازکردو
رز گاربوو ، پاشان « ابن ابو الشوك » هەوالی بۆ معز الدولە
نارد کەبەومەرجە زەلامەکان وابو مخلد بەرئەدات کە ئەویش

پارمتەکانی لای بەربدات ، معز الدولە بەڵێن ومتمانەی دایێ ؛ ئنجا ابو الشوك ابو مخلدی بەردا ، پاش ئەم گرووفرە سوبوکتوکین حاجب لەبەغداوە کەوتەرێ بەرمو حەلەوان بۆسەرکوت‌کردنی هەرێمەکە ، جا توانی هەم حەلەوان داگیربکات و هەم چارەسەری کوردەکانو هی ابو الشوك بکات وبگەرێتەوە .. ( تجارب الامم ۲/۱۵۵ ) جا بەم هەوالەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە « ابن ابو الشەوك » ئەوەندە بەدەسەلات بووە وخاوەن هێز،کە «سلطان معز الدولە ی بویهی» دەستی بەسەریانە رۆیبوە .. پاش ئەم هەرایە ئیتر تاپەیدا بوونی « عیار » لە سالی ۳۸۰ك = ۹۹۰زا چۆنێتی ئەمیرانی حەلەوان نازانرێ .. بابێتە سەرناوەکەی منلاموایە ئەبوشۆك واتا ئەبوهەنگوین یائەبوشەوق بووە ، هیچ کوردێ ناوی خۆی‌نانێ ئەبودرك ...

سالی ۳٤۷ك = ۹٥۸زا بوومە لەرزەیێکی سەخت ولاتی چیای هەژاند تەنانەت حەلەوان ( المنتظم ٥/۳۸۷ )

بەپێی وتەی ابن الاثیر لەسالی ۳۰۰ك = ۹۱۲زا بەدواوە گەورەترین دەسەلات لەهەرێمی چیادا هی بنەماڵەی « عیشانی » بووە کە حسینی بەرزینی بووە بەزاوای احمد عیشانی » کەدووکوڕی هەبوو بەناوانی « ونداد وغانم » وهەریەکەیان سەرداری چەند هەزاکەسی بوون ، ونداد سالی ۳٤۹ك ۹٦۰زا مردووە و، غانم سالی ۳٥۰ك = ۹٦۱زا مەرگ یەخەگیری بووە، پاش مردنی ئەم کوڕانە حەسەنویهی کوڕی حسین ی بەرز یکانی

خوارزایان ولاتەکانی ژێر دەستیانی داگیر کردووە ، ئـەوش ئاشکرایە کە خود تیرەی عەیشانی لقێ بووە لەعێلی « بەرزینی = بەرزەکانی » ( الکامل ٨/٧٠٥ - ٧٠٦ ) ئێمە لێرەدا باســی فـەرمانڕەوایی « عـەیشانی » و « حـەســەنوەیهی » ومێژووی هەرێمی‌دینەوەر دووبـارەناکەینـەوە ، ئەوەمـان تێروتــەسەل لەسیارەی دینـەوەردا ڕوون کردۆتەوە ، تـەنیا لـەبەرئـەوەی جارجارە ناوی ئەمیر وفەرمانڕەوا کانیان دێتە، وەکو بەرکولێـك ناومان هێنان ...

**فەرمانڕەوایی عەییاری ( عنازی ) :**

لەبەرا باسی « ابن ابو الشوك » ناوێ ڕابورد کە لە هەرێمی حـەلەواندا پیاوێکی بـەدەسەڵات بـووە . بـەدووری نازانم ئەم‌بنەماڵەیە پێوەندی‌یان لەگەڵ ئەوهەبێت، بەڵکو هەربەدووری نازانم کـەئـەم « عیار »ەی نـاوی دێت هـەرکوڕی ئـەوبێت یاکورەزای‌بێت گەرچی لەم‌بارەوە هیچ‌کەسی ڕای دەرنەبڕیوە ، تـەنیا دوکتور حســامالدین نەقشبـەندی نـەبێت کـەئـەویش هەرقسەکانی منی دووبارە کردۆتەوە :

لەمەوبەر دیاردیم بۆ ئەوەکردبوو کەمن ساڵانـە بــــۆ کونگەرەی زانکۆیی تاران بەفارسی باسی کورتەو کـەلاڵەم ئەنووسی ، بەڵام باسەکانم تایبەتی کوردبوو ، ئەو باسەکورتەی دربارەی فەرمانڕەوایی عەیاری ( عنازی ) نووسیوم لەلایــەن نووسەری خامەزێرین کاکە حەمەی مەلاکەریمەوە ترجمە کرابووە

عەرەبی وئەنوڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە (٥) دابڵاو کرابووەوە بەھەندێ پەراوێزو ڕەخنەوە ، دوکتور حسام‌الدین نەقشبەندی مالی ئاوابێ دەربارەی ناتەواوی وھەڵەی ناوی ڕەخنەی گرتبوو، ئەوەبوو لەم ساڵانەی‌دواییەدا ڕەخنەکان لەگوڤاری «نەوروز »دا لەژمارەکانی ( ٧ ـ ٨ ـ ٩ ) بڵاو کرابـــووە ( کەلـە کـاتی خۆیایەک‌یەك دیاردی بۆئەکەم )

**ناوەکە عیارە ـ یا عنازە ؟**

ئێمـە بەپەیـڕەوی « مستوفـی قەزوینــی » و « قاضـی غفاری » و « ئەمیر شەرەفـخانی بتلیسی » وباوی ناو کوردواری « عیاری » مان بەباشترو ڕاست‌تر زانی لە « عنازی » کەلـــە « الکامل »دا ھاتووە ولە « عنان » یش کەلەزۆر سەرچاوەی‌ترا ھاتووە چون لەناو کوردواری‌دا باسی « عمرەی عەییار » زۆر بەناوبانگە کەپیاوێکی بلیمەت وزرنگو ھوشیاربووە ، ھەرگیز باوەڕمان بەوەنەھاتووە کابرایێکی کورد ناوی کوڕەکەی بنێ « عناز » بە عەرەبی وناوی‌ئـەنێ « بزنـەوان ، شـوان » کاك حسام‌الدین مالی ئاوابێ ناوی ھەندێ سەرچاوەی نیشاندابوو کەلەوانەدا « عناز »ە نەك « عیار » تەنانەت ھەلبەستی کابرایێکی عەرەبی کردۆتە بەلگە کەبو داشۆرینو سووك کردن بـەکاری ھێناوە :

« ومشتق عناز من العنز في الوغى
وجدك ما اشتق الحراب من الحرب »

بەلاّم منلاّموایە لە هەلبەستی کابرای عەردبیش داهەر « عیار » بووە نەك « عناز » چونکە بزن بەشاخ لەگەلّ گورگیش شەرئەکات تاگورگ بەسەریازالّ ئەبێت ، ولەگەلّ بەردیشا شەرە قۆچ ئەکات : « .... کناطح صخر أعیی قرنه الوعل » بەلاّم عیر ( کەرەکێوی ) کە لە وشەی عەیارەوە نزیکترە بێ دمەلاّتەو شەڕانی نیە جگە لەوەش من لام وایە هەندێ لە مێژو نووسان لەبەر ئەوە لە ناوی عەیار دوور کەوتوونەوە چونکە لەو حەلانەدا وشەی عەیار ناو بووە بۆ چەقۆ کێشەکانی ناو شارەکان هەروا ئەوانە کە قاضی ابن گەچی دینەوەریان کوشت دەستەیێ عەیار بوون (تاریخ گوزیدە لاپەڕە ٥٥١ باسی لورستان ،جهانآرای قاضی غفاری لاپەڕە ١٦٨ شەرەفنامەی فارسیلاپەڕە ٤١ عەرەبیەکەی تەرجومەی من لاپەڕە ٢٩ )

با ئەوەش بلێم کاك حسام‌الدین لەناو ئەوسەرچاوانەدا کەریزی کردبوون ئەم‌ناوانەی تیابوو : «مجمل التواریخ وتجارب الامم ومعجم الالقاب والمنتظم ) من کاك حسام‌الدین دلنیا دەکەم کەباسی بنەمالەی عەیاری ( عنازی ) نە لە مجمل التواریخ و نەلە تجارب الامم ونەلە معجم الالقاب‌دا نە هاتووە ، لە « المنتظم » یشدا یەکجار ناوی « عەیار » هاتووە بەهۆی سەرگوزشتی « ابو العباس واصل »ەوە .. لە « الکامل » یشدا ـ کەلەباسی شالاّویبەدر بۆ سەرهلالی کوریدا، ناوی ابو بکر رافع، ابو عیسا شادی ، ابو الفتح عیار ، هاتووەـلە مجمل التواریخدا دیسانەوە

ناوی « ابو الفتح عیار »یان لەگەڵ نە هاتووە • سەرنجی مجمل التواریخ لاپەڕە ۳۹۲ ـ ۳۹۳ والکامل ۹/۲۱٤ ) بدەنەوە

**١ ـ ابو الفتح محمد کوڕی عیاری شازەنگانی ( شاذنجانی ) :**

بەپێی هەواڵێ کە ابن الاثیر نووسیویە ( الکامل ۹/۲۲٥ ) ـ کەئێمە لەکاتی خۆیا دەقەکەی ئەنووسین ـ ساڵی ۳۸۱ك = ۹۹۱زا « ابو الفتح » لەشاری حەلوان بناغەی فەرمانڕەوایی دامەزراندووە ، ئەگەر ئێمە بۆمان ڕوون بێتەوە کە « عەیار » کوڕی یانەوەی « ابن ابو الشوك »ی یەکەمە ئەتوانین بڵێین فەرمانڕەوایەکە بەرلەم سەردەمانە هەبووە وبۆ ابو الفتح بەمیرات ماوەتەوە ، بەڵام دیسانەوە ڕوون نیەئایا لەپاڵ عەیشانی و « حەسەنوەیهی » دابوون یان سەر بەخۆبوون ؟ کە لەپاش دەورانی بنەماڵەی حەسەنوەیهی پتر بەهێزبوون ولە«نەهاوەند»ەوە تا «دەسکەرە» و لە « ئەهواز »ەوە تا « داقوق » دەسەڵاتیان تەنیوەتەوە •• ( واتا ئوستانەکانی کرماشان ـ سلیمانیە ـ دیالێ کەرکوك ( التأمیم ىئێستە ) یان ، لەژێر فەرمانا بووە ئەم ڕازەمان ڕەنگە بەپێی هەواڵەکان تا ئەندازەیێ بۆ ڕۆشن‌بێتەوە ، تەنانەت دەبێ لەبیرمان نەچێ کە شازەنگانی‌یەکان خەزوری بەدرو خاڵوانی هلال بوون، کەئەویش دیسان نادیارە ئایادایکی هلال لە بنەماڵەی « عیار »ە یالە بنەماڵەی سەر خێڵێکی ترە ؟؟

لێرەدا بەپێویستی ئەزانم سەرنجی خوێنەران دەربارەی ئەم « تکنیە »یە ڕاکێشم ، مەبەست لە تکنیە ئەوەیە کەبەپیاوێ یائافرەتێ بوترێ : « باوکی فلان ! دایکی فیسار ! » بێ‌گومان ئەمە لە هاوسێتی عەرەبەوە داکەوتووە ، هەرگیزکورد ـ جگەلەژن کەبە مێردەکەی خۆیی وتووە : باوکی فلان ـ بەدەمیا نەهاتووە بەیەکێک بلێ باوکی‌فیسار ! هۆی ئەوەی کەژن وتویە : ئەوەبووە : دلنیابە کەئەو زاڕووە توخمی تۆیە ، نەوەك توخمی خیانەتی ژنومێردی ! جا ئەم پەیڕەوی‌یە وای کردووە زۆرجار نەوەك هەر هەڕەمەی خەلك بەلكو زۆربەی ڕۆشنبیرانیش نەزانن کە « ابو بکر ، ابو حنیفە ، ابو مسلم » ناوی خۆیان چ بووە ؟ ئەم نەخۆشی‌یە لاسایی‌یە لەسەردەمی ئەمەوی بەدواوە کەوتۆتە ناومیرو مەلاو بەگلەرانی کوردەوە .
بەلاّم سەیر ئەوەیە کە شیخانی « العبید »ی عەرەب چونکە زۆرتر هاوسێی کورد بوون لەم‌تکنیەیە تووڕە ئەبوون ، جارێکیان یەکێك بە « حسین العلي » ئەلێت « ابو فلان ! لەوەراما ئەلێت بفەرموو « یا ابن العلي » ئێمە بەباوکەوە ئەنازین‌و کوڕانمان بەئێمەوە ، هێشتا وامان لێ نەهاتووە بەکوڕانمانەوە شانازی بکەین ، زۆر کەس بەمنالی قنك‌گواوی خۆیەوە ناو ئەبرێت !! بەلی ! ئەمە یەکێکە لەوشتە قۆڕانەی کورد پەیڕەوی ئێکردووە هی ئەوەیە ئێمە هەم ناوی « ابو شەوك » مان نەزانیوە هەم هی « ابن ابو شەوك » .. بەلاّم بنەماڵەی بەرزیکانی نە « حوسین ، نەحسنویە ، نەبدر هیچ کامیان بە « تکنیە » خۆیان نەناساندووە

خود ، مێژو ناسان بۆ بدر « ابو النجم » یانبـه کارهێناوه ، ڕەنگە خۆی ئاگای لێ نەبوبێت بەڵام برا کانی هەمو ( ابو ) یان پێوەبو وەکو : ابو علاء ـ ابو عدنان تاد )

ئەمەوەها بەهەشتی « حسـین حوزنی » عیاری کـردووه بـەکوڕی « حسین » ئـەمەیلـەکوێ هێناوه ؟ کـام حسـین ؟ باوەڕناکەم مەبەستی حسینی بەرزیکانی بێ وعیاری کردبێ بەبرای حەسەنوەیهی ! ...

سالی ٣٨٧ك = ٩٩٧ز « مقلد عقیلي » شالاوی کرده داقوق بۆ داگیرکردني بەڵام جبرائیل ڕێی نەدا (بۆتێرو تەسەلی ئەمباسە سەرنجی لاپەڕه ٣٨٥ ـ ٣٨٧ گوڤاری کوڕی زانیاری ب ١٠ بدە کەسیپارەی داقوقی تێدایـــه ) .

سالی ٣٨٩ك = ٩٩٨ز دەسو پێوەندانی « ابو الفتح محمد کوڕی عیار ( عناز ) » زەمان کوڕی هندی وکوڕەکانیان کوشت کەناویان : دولەف ، مقداد ، هندی بوو ( تحفه الوزراء صابئي ٣/٣٣٨ ذیل الذیلي طەبەری )

سـالی ٣٩٠ك = ٩٩٩ز جارێکی تـری « مقلـد عقیلي » شالاوی کردەوه داقوق وداگیری کردو خـود « جبرائیل »ی کرد بەسەرکاری ولەجێی خۆی دایناوه .. پاش ئەوه ابو الفتح محمد کوڕی عیار ( عناز ) داگـیـریکـرد ( داقـوق ٣٥/٣٨/ ٣٨٧ الکامـل ٣٠٣/٩ ) بەڵام ئاشکرانیـه کـەئـەوحـەلـه ابـو الفتح سەربەخۆ ئەوەی کردووه یابەفەرمانی بەدر؟!یابەدوستوری دەولەتی بوەیهی ؟؟

سالی ۳۹۲ك ( ۱۰۰۱زا سەردار سپای دەولەتی بوەیھی « ابو جعفر کوڕی استاذ ھرمز » کەوتە ھێزکۆ کردنەوە بۆئەوەی شالاّو بکاتە سەر « ابو الحسن علي کوڕی مزید اسدي » جا نامەی نووسی بۆ خانەدان زادە « ابو الفتح محمد کوڕی عیار » وداوای لێکرد بکەوێتەتەکی بۆشەڕ ، ئەوجەلە « ابو الفتح » دووصەت سواری شازەنگانی ودووصەت سواری جاقانی ( جاوان ) لەگەل خۆی بردو لەگەل « ابو الحسن علي کوڕی مزید » کەوتە شەڕەوە « ابو الحسن » شکاو ھەمو ماڵو سامانی بەتالاّن چوو ، شاذەنگانی و جاقانەکان ئەوەندەیان تالاّن برد بە دەسکەوتی تالاّن دەولەمەندبوون .. (تحفه الوزرای صابئي - ذیل الذیل طەبەری ۳/٤۲٤ )

ئەم کارەساتەی بەسەر « ابو الحسن » یان ھینا ھەرلەبەر ئەوەبوو کەدۆستی بەدربوو وابو الفتحیش لەلایەن بەدرەوە لەحەلەوان دەرکرابوو خۆی دابووە پاڵ دەولەتی بوەیھی ..

سالی ۳۹۷ك = ۱۰۰٦زا « ابو الفتح محمد کوڕی عیار ( عناز ) پەنای بردە لای « رافع کوڕی محمد کوڕی مقن » ، ولەوێ مەلبەندی کرد : ( بێ گومان ئەمەکاتی بووە کە بەدر حەلەوانی لەدەس وەرگرتووە ) جا بەدر ھەوالی بۆ « رافع » نارد وباسی دۆستایێتی وخۆشەویستی باوکی ومافی نێوانی ئەوو خۆیی بۆکرد ، ئنجا گلەیی لێکرد کەد دوژمنی ئەوی پەناداوەو حەواندووەتەوە ، داوای لێکرد کەلەخۆی دووری بخاتەوە

بۆئەوەی دۆستایەتیی کۆنیان بەردەوام بێ وپەیمانی بەینیان نەشکێ ، بەڵام رافع گوێی نەدا ، جا بەدر هێزێکی نارد بۆ هەرێمەکانی ژێردەستی کەلای خۆر هەڵاتی دجلەوەبوو تاڵانیان کرد وڕوویان کردە ماڵەکەی کەلە « مطیرە » بو ئەویشیان تاڵان‌کرد وئاگریان تێبەردا وچوون بەرەو « بردان » کە ئەمیش هەرهی رافع‌بوو ئەویشیان بەزۆر داگیرکرد وخەلەو خەرمانو دەغڵو دانیان هەموو سووتاند و چاڵاوەکانیان هەمووپڕکردەوە. ئنجا ابو الفتح چووەلای سەردار سپا ( عمید الجیوش ) بۆ بەغدا ، ئەو خەڵاتی کردو ورێزی لێناو بەڵێنی کۆمەکو یارمەتی دایێ ( الکامل ۹/۱۹٤ ) .

دوکتور حسام الدین نەقشبەندی لەو ڕیزە و تارەدا کەلەژمارەکانی ۷ – ۸ – ۹ – نەوروزا بلاوی‌کردەوە ، هەوڵی دابوو زۆرشت ڕوون‌بکاتەوە بەڵام بەداخەوە وتارەکانی لەگەڵ ئەوپەراوێزانەی من‌نووسیبووم تێکەڵوپێکەڵ بووبوون بەجورێ کەنەمن لەگووارەکە مەمنون‌بووم ونەخۆی ونەخوێنەران سوودیانلێیی وەرگرت ، جا لە باسی « مطیرە »دا نووسیبوی : گوندێ بووە سەر بەسامەراء .. تاد ، دەربارەی « بردان » یش نووسیبوی : گوندێ بووەلای باشووری ڕاشدیەوە .. تاد ، هەروانووسیبوی : وادیارە ناوی « بردان » لە « بردە »ی فارسی‌یەوە هاتووە کە دەکات بەندە وکویلە ، وجمعەکەی « بردان » .. ڕاستی یەکەی « بردان » فارسی نیە ، ئەگەر جمعي « بردە » بوایە وەکودوکتور حسام وتوویە بەفارسی

دەبوو بە « بردەها ، بردەیان » ، بەعەرەبیش دەبووە « بردات ..
سەیرم لەوەدێت کە دوکتور زانیویە ناوەکە کـوردی‌یە « بـردان
= الحصوة = الحزن بەلام خۆی لێ‌لاداوە خۆزۆر ئاشکرایـــە
گەلێ لەناوی گوندو شارۆلکەکانی ئوستانی دیـالی ودەوروپشتـی
بەغدا وسامەراء کوردی‌بوون وەکوو : دەولەت‌ئاوا = دلتاوا =
خالص ، خرنابات = خرم‌ئاباد ، شـاربان ، بـەرازەرو ، مهرود
دستکرد ، نارەوەن = نهروان تاد ..

هەرلەم سالی ٣٩٧ك = ١٠٠٦ز ا سـەردار سـپاه ( عمید
الجیوش ) ابـو الفتـح محمد کـوڕی عیاری دانا بـەپارێزەری
ڕێگای خوراسان ، بەدر لـەم‌کارە تووڕەبوو ناردی بـەشوێن
« ابو جعفر حجاج »دا کەلەوەبەر سەردار سپابووبوو ، هێزێکی
زۆرگەورەی بۆی پێکهێنا بەسەرداریی ئەم ئەمیرانـە : هندی
کوڕی سعد ، ابـو عیـسا شـادی کـوڕی محمـد ( زاوای )و
وەرامکوڕی محمد جاقانی ( جاوانی ) وەی تری‌و بەرێیی خستن
بەرەوبەغدا ، لەم حەلەدا « ابو الحسن علي مزید اسـدی »ش
کەبەتووڕەیی لە لای بهاء الدولەی بوەیهی لەخوزستان گەڕابووەوە
ئەویش کەوتەکیان بەهێزی خۆیەوە ، ئەمانە پترلـــــــەدە
هەزارسواریان پێ‌بوو ، ڕوویان‌کردە بەغدا ویـەك فەرسـەنگ
دووری بەغدا لەشکر بەزیان کرد وبەغدایان یەك مانگی ڕەبەق
گەمارۆدا ، بەلام هێزی تورکی دەولـەتی بوەیهی وابو الفتـح
عیار ( عناز ) بەغدایان لەشـالاو پاراسـت الکـامل ( ٩/١٩٣ ـ
١٩٤ ) لەم هەوالەی ابن الاثیر بۆمان دەرئەکەوێ کەجاقانەکان

بەتێکیان سەربە بەدر بوون ، ودۆستانی ابو الفتح بوون بـــە لاگری میری ..

هەرلەم سالەدا ( ٣٩٧ك ) کە ابو الفتح هێشتا سەربـــە دەولەتی بوەیهی بوو لـەترسی بـەدر نەیئـەتوانی بگـەرێتەوە حەلەوان‌و پاسەوانی رێگای خوراسان خانەقینی بـەدەس‌بوو ، ابو العباس کوری واصل خیوی بەصـرە کـەشالاوی کردبوە بطیحە ( اهوار ــ ناصریە ــ عمارە ــ کوت ) وبەرامبەربەسپای بوەیهی شکستی خواردبوو ، هەلاتبو ورووی کردبووە کوردستان بۆپەنای بەدرو گەیبووە خانەقین ، کەلەو حەلەدا لە ژێر دەستـــی «جعفر کوری عوام»ی فەرمانبەری بەدر دابوو، ویستبووی چەند رۆژێ لەخانقین بحەسێتەوە ، جعفر داوای لێکردبو ، بەپەلەبروات خۆی بگەیێنێتە لای بەدر ، ئەوپەلەی نەکردبوو ، سیخورەکانی بوەیهی خەبەریان دابووە « ابو الفتح » کەلەوحەلەدا لەوناوەبوو، لەپرخۆی کردبووبە خانەقین‌دا وگەمارۆی مالەکەی دابوو ابو العباسی گرتبوو بردبووی بەرەوغدا بۆسەرداراسپاهـ ، ئەویش ناردبوی بۆبهاء الدولە لە خوزستان ، بـەلام رۆژی ١٠ مانگی صەفەر لەرێ پەیکی پیاگەییبو هەرلەوێ ســەری بری‌بوو،کەللە سەرەکەی بەدیاری بردبو بۆ بهاء الدولە ، جا دوستوری‌دابوو بەشارانی خۆزستان وفارسا کەللەکەیان گێرابوو . ( الکامـــل ٩/١٩٥ ــ ١٩٦ ) ، لەوەی کە جعفری سەرداری خانەقین هیچ جۆرە بەرهەلستکی نیشان نەداوە ئاشکرایە کەئەو هـەرخۆی هەوالی گەیاندۆتە ابو الفتح ..

سالی ٣٩٩ك = ١٠٠٨زا خەلیفەی فاطمی « الحاکم بأمر الله کوڕی نزارکوڕی معز » لەمصرەوە نامەی نووسی بۆ ابن ابو الشەوك » و بهاء الدولەی دیلەمی وقرواش‌کوڕی مقلد عقیلي خێوی موصل وهي تری داوای لێکردن کەببن‌بە پەیڕەوی بانگەوازی باطني ( تأریخ گوزیده ٣٠٥ ) واتا ببن بەپەیڕەوی خولەفای اسماعیلیەی مصر کەئەوان لەوحەلەدا لەخولەفای عباسی بەدەسەڵات تربوون وحکومەتی بوەیهی بەغداش شیعەبوو وخەلافەت هەرناوبوو وسوننی‌یەکان بێدەسەڵات‌بوون ٠٠٠ ئەوەش ئاشکرایە کەمەبەستی خەلیفەی فاطمی لە « ابن ابو الشەوك هەر « ابو الفەتح »ە چونکە پێشۆکە مردبو ابو الشوکی کوڕی ئەمیش پێ نەگەییبو ٠

وادیارە لەدەوروبەری ٤٠٠ك ١٠٠٩زا ابو الفتح کوڕی عیار خۆی لەگەل بەدر ئاشت کردۆتەوە ، ابن الاثیر نووسیویە : هلال کوڕی بەدر کوڕی حسنویهی ( مجمل التواریخ ناوی‌ناوە هلیل ) لەباوکی یاخی‌بوو ولەگەلی کەوتە شەڕەوە وبەدیل‌گرتی ، بەلام لەبەر خاتری باوکێتی نەیکوشتو قەلاێیکی بۆ تەرخان کرد کەتیا گۆشەگیربێت بەلام بەدر هەرکە گەییشتە قەلاکە دەستی کرد بەقایم کردنی ونامەی نووسی بۆ « ابو الفتح محمد کوڕی عیارو ابو عیسا شادی کوڕی محمد کە بگەنە فریای ٠٠٠٠ تاد جا ئەمانە هەلیان کوتایە سەر هلال وابو الفتح شاری قرمیسیني ( کرماشاني ) داگیرکرد وابو عیسا شادی‌ش چوو سابور

خوێـندنی ( فلك الافلاك )ی داگیرکـرد ( الکامل ٣١٤/٩ ـ ٢١٥ ) بۆدرێژەی ئەمباسە سەرنجی سیارەی دینەوەر بدەن کە تێروتەسەلّ باس‌کراوە ) .. جا بەم هەوالّەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە ابو الفتح پاش‌ئەوە ی لەگەلّ بدر ئاشت بۆتەوە لەمشەڕەدا قرمیـسـین ( کـرماشان )ی لـەچنگ هـلال دەرهیناوە ، بـەدر سەرداریتی قرمیسین‌و حەلەوانی داوەتێ ولەوەبەر ئەم هەرێمەی لەژێر دەستانەبوو کەسەربە « حسنویە » بووە ، ئەمەش ڕوونـە کە « بنەمالّەی عیار » سەربە حسنویەبوون ، وەسەرەتا تـــەنیا دەسەلآتیان تا قەســشەی مایدەشت بووە ، وەك لە شەرەفنامەدا باس‌کراوە ..

سـالی ٤٠١ك = ١٠١٠ز ا ابـو الفتح محمد کـوڕی عیار ( عناز ) مرد بەمهۆیەوە ابن الاثیر نووسیویە : « ابو الفتح محمد کوڕی عناز لەحەلەوان مرد پاش‌ئەوەی کە ٢٠ سـالی ڕەبـەق فەرمانڕەوایی کرد وپاش‌خۆی ابـو الشوکي کـــــــــوڕی جێیی‌گرتەوە ... تاد ( الکامل ٢٢٥/٩ )

دوکتور حسام الدین نووسیویە : ڕۆژبیانی بەهەلە سالّی دامەزراندنی فەرمانڕەوایی عەیاری بە ٣٨٠ ومردنی ابو الفتحی بە ٤٠٠ك داناوە ، کە سەرنجی گوڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە (٥) لاپەڕەکـانی ٤٨٤ ـ ٤٨٦ دا لەباسـی « امـارە تی عیـار » دا کەکاکە حەمەی بەڕێز وەری‌گێڕاوە بەعەرەبی هەلّەی‌وەهام نەدی ئەمیر شەرەف‌خانی بتلیسی نووسیویە : « ابو الفتح محمد کوڕی عیار » ماوەی بیست سالّ لەحەلەوانا فەرمانڕەوایی کرد ولــە

مانگەکانی سالی ٤٢١ کۆچی = ١٠٣٠ز لەجیهانی نابوودەوە کۆچیکرد بۆ جهانی جاویدان ، ئەولە بەرە کوردەکانی ترەو، لە نەژمو رەچەی « حەسنەویە » نیە بەلام مێژونووسان دیسانەوە ئەویان لە تۆمەڵەی فەرمانڕەوایانی دینەوەرو شەهرەزول داوەتە قەلەم . پایتەختی ئەو قومش ( قوماش ) وشەهرەزول بووە . (شەرەفنامەی فارسی ٤٢ چاپی مصر ، دەسنوسی خود ئەمیر شەرەف) کە مەبەستی لە «شهرزول» شارە زورە ، بەلام «قومش» یەکێکە لە شارۆلکەکانی هەرێمی مایدەشت . کاك حسام‌الدین نقشبندی نووسیویە: قومش هەلەیەو ڕاستی یەکەی « قرمسین۔ قرماسین »ە ( واتا کرماشان )ە» بەلام من ئەوەم پێ‌ڕاست نیە چونکە ئەوحەلە « بەدر » هەبوو ، هەرلە هەمەدانەوە تا خوزستانو هەر لەشارەزورەوە تا دەوروبەری بەغدا قەلەمڕەوی دەسەلاتی ئەڕۆیشت ، جا تاگونجێ پایتەختی « ابو الفتح » « قرمیسین » بوویێت بەلکو ئەو لەسەرەتادا لەسای بەدرا لەناو تیرەی « شازەنجان »دا ( کەهەر زنگەنەکانی سنجاوی ئێستەن ) هەلچووە . وپاشان دەسەلاتی لە حەلەوانا گرتۆتە دەست ، کە خۆیو جاقانەکان تۆزێ سەرپێچی فەرمانی ئەویان کردووەو لایەنگری فەرمانبەرانی ئال‌بویەیان کردووە « بەدر » دووری خستونەوە، پاشان کە « ابو الفتح » گەڕاوەتەوە لای بەدر لەحەلەوان دانراوەو بەفەرمانی بەدر شەڕی لەگەل هلال کردووەو کرماشانی

که‌چنك‌هلال دمرهێناوه‌ته‌وه ، ئـه‌وحه‌لـه بووه‌ته فـه‌رمانڕه‌وای قرمیسین = کرماشان ـ حه‌له‌وان ..

**٢ ـ ابو الشوك حسام الدوله فارس کوڕی ابو الفتح :**

سالی ٤٠١ك = ١٠١٠ز‌ا ابو الشوك جێی باوکی گرته‌وه دیاره بوونی به‌فه‌رمانڕه‌وا به دوستوری به‌در وخواستی کوردی ولاته‌که‌ی‌بووه ، هه‌رله‌به‌ر ئه‌وه ده‌وله‌تی بوه‌یهی به‌غدا له‌شکری ناردۆته سه‌ری بۆ ئه‌وه‌ی سه‌ری بێ شۆربکات ، بـه‌لام ابـو الشوك له‌گه‌ل سپاکه که‌وتوتـه شه‌ڕه‌وه ، وه‌ل شکـستی خواردووه‌و هه‌لاتووه‌و چوه له‌حه‌له‌وان خۆی‌قایم کردۆتـه‌وه ، تا « ابو غالب خلف وه‌زیری بوه‌یهی هاتۆته به‌غدا ئه‌و حه‌لـه خۆی له‌گه‌ل سازداوه وڕێك که‌وتوون ( الکامل ٩/٢٢٥ )

سالی ٤٠٤ك = ١٠١٣ز‌ا « ابو الحسن علي کوڕی مزیدی اسدی » شالاوی کردۆته سه‌ر « ابو الشوك » به‌لام مـه‌یدان نه‌داروه که بێته‌شه‌ڕ له‌تێوانیانا وه‌هراکه به‌ئاشتی ڕێك‌خراوه ، ئنجا ابو الشوك خوشکی خۆیی داوه به « دبیس کـوڕی ابـو الحسن » ( الکامـل ٩/٢٤٦ )

ســالی ٤٠٥ك = ١٠١٤ز‌ا کاره‌ساتی دلتـه‌زینی کوژرانی به‌در کوڕی حه‌سه‌نوه‌یهی ڕووی‌دا ، که‌تێروته‌سه‌لی باسه‌کـه له‌سپیاره‌ی « دینه‌وه‌ر »دا نووسراوه . هه‌روا له‌م‌ساله‌دا قاضی ابن گه‌چی دینه‌وه‌ری له‌لایه‌ن عه‌یاریه‌کانه‌وه کوژرا ..

سالی ٤٠٦ك = ١٠١٥ «شمس الدوله کوڕی فخر الدوله»ی بوەیهی « طاهر کوڕی هلال کوڕی بەدر »ی لە زندان دەرهێناو سوێنیدا ـ کە سەرکێشی نـەکاو ملکج وفەرمانبـە ربێ ، جـا هەندێ کوڕانی تییرەو هۆزەکان لێی کۆ بوونـەودو هێزێکی پێکەوەنا وکەوتەشەڕەوە لـەگەڵ « ابـو الشـوك » وڕایفڕاندو « سـعدی » برایشـی کوشـت ، جـارێکی‌تری شـەڕیان هەلگیرسانەوە « ابو الشەوك » شکاو بەرەو حەلەوان هەڵات ، « ابو الحسن مزید » هێزی بویاریدەو کۆمەکی نارد ، بـەڵام ئەوتواناى شەڕی نەمابوو .. پاشان بـەجۆرێکی نهێن‌ڕانـەو ئاشتی طاهری لەخوێنی « سەعدی » برایا کوشـت ( الکامـل ٢٦١ )

سالی ٤١٤ك = ١٠٢٣زا « علاء الدوله ابو جعفر کـوڕی کاکویه » شاری هەمەدانی داگییرکرد ، ئنجا هەلیکوتایە شاری دینەوەر وساپورخواست ئەوانیشی داگییرکرد وشالاوی کردە سەر « حسام الدوله ابو الشوك » خۆی ، بەڵام ئـەم لـەلای خۆیەوە مشرف الدولەی بوەیهی نارد بۆتکای ڕێکەوتن ... جا علاء الدوله گەڕایەوە ( الکامل ١٣٣/٩ )

سالی ٤٢٠ك = ١٠٢٨زا ملك ابوکالیجاری بوەیهی داوای لە « قرواش »ی خێوی موصل کرد بەرەو خوارەوەبێ بۆعراق ( واتا بەغدا ) بۆ گـەمارۆودانی « جلال الدولـە بویهی » .. قەرەواش لەو حەلەدا « اثیر عنبر »ی لەلامیوان بوو ، جاپێکەوە

کەوتنەڕێ تاگەیشتە « کحیل » لەوێ اثیر عنبر مرد ئیتر قرواش نەهات ، جلال الدولە بنەوبارگەی پێچایەوە وپەنای بردە بەر « ابو الشوك » سەرئەنجام شەڕ لە نێوانی ابو کالیجار وجلال الدولەدا ڕووی نەدا ، بەڵام بارانێکی تۆف هەڵی کرد زۆریانی لەناوبرد ( الکامل )٩/٣٧٧ )

هەرلەم ساڵەدا « مقلد کوڕی ابو الاغر کوڕی مزید اسدی » کە لەگەڵ دبیس کوڕی مزیدی اسدی دا کەوتبووە شەڕەوە شکستی خوارد ولەداخا « مطیرئاباد - نیل - سورای تالان کردو لەدەجلە پەڕییەوەو پەنای بردە لای « ابو الشوك » ( الکامل ٩/٣٧٩ )

ساڵی ٤٢١ك = ١٠٣٠زا « ابو الشوك » شاری دقوقی ( دقوقا - داقوق )ی گەمارۆدا کەلەوحەلەدا لەژێرفەرمانی « مالك کوڕی بدران کوڕی مقلدی عقیلی »دابوو ماوەی گەمارۆکە درێژەی کێشا جا « ابو الشوك » پەیامی بۆنارد کەئەم شارە هی باوکم بووە ، پێویستە وەری بگرمەوە ، چاك وایە بە خۆشی بەجێی بهێڵی ، مالك گوێی نەداو دەستی لەشارەکە هەڵنەگرت ، « ابو الشوك » گەمارۆکەی سەختکردو بەزۆر شارەکەی داگیرکرد ، مالك داوای ئەمانی کرد بۆخوی وکەس وکاری وپیاوانی، « ابو الشوك » تەنیا ئەمانی بەخۆیدا ئنجا کە « مالك » شارەکەی دایە دەستەوە « ابو الشەوك » پێی وت : تکاملێکردی بێ شەڕ شارەکە چوڵ بکەی کەخوێنی موسوڵمانان بەخۆڕۆ نەڕێژرێ گویت نەدا ، مالك لە وەراما وتی : ئەگەر

ئەوکارەم بکردایە عەرەب هەتا هەتایە سەرکوێنەیان ئەکردم بەڵام ئێستە کەس ناتوانێ توانجم تێگرێ وسەرزەنشم بکات چونکە هیچ نەنگ‌و ناگزووری‌یەکم ڕێ نەداوە . ابو الشوك وتی : کەوابێ چاکەی تەواو ئەوەیە کەسامانو بنەباری خۆت وکەسانو پیاوانو دەس‌وپێوەندانت هەمو بدرێتەوە .. ( الکامل ٣٩٧/٩ ) ئەم‌باسە بەدرێژە لەسیارەی داقوق‌دا باس‌کراوە ، ئەوەی ڕاستی‌بێت ئەم قسانەی ابو الشەوك ئەوپەڕی جوامێری وپیاوەتی‌یە ..

سالی ٤٢٦ك = ١٠٣٤زا « ابو سعد کوڕی عبدالرحیم »ی وەزیری « جلال الدولەی بوەیهی » وازی لەوزارەت هێنا وخۆی دایەپاڵ ابو الشوك ولە جێی ئەو « ابو القاسم » بووبەوەزیر ، بەڵام بەرامبەربە ویستی سپا نەیتوانی خۆی ڕابگرێت هەڵات ئنجا ابو سعد پاش دوومانگ گەرایەوە ومزارەت ( الکامل ٨/ ٤٤٣ )

سالی ٤٢٨ك = ١٠٣٦زا جلال الدولەی بوەیهی وسلطان الدولەی کوڕی ابو کالیجاری برای نیوانیان تێکچو ، « باراسطوغان » ی سەردارسپای کالیجار داوای لەخەلیفەی عباسی « القائم بأمر الله » کرد کەناوی « ابو کالیجار » بخرێتە خوطبەی هەینی‌یەوەو خەلیفە بەڵێنی نەدا وتی ئێمە : لەگەڵ « جلال الدولە »ی مامی‌دا پەیمانو پێوەندی مانهەیە وئەومان بەسلطان ناسیوە ، « باراسطوغان » قسەکانی خەلیفەی گرنك نەگرت خۆی زۆری لەمەلاکان کرد کەناوی « ابو کالیجار »

بخەنە خوطبەوە ، لەسەرئەوە بووبە شەڕ لەتێوانی سپای جەلال الدولەو سپای کالیجاردا ، جا « حسام الدولـه ابو الشوك » و « ابـو الفـوارس منصـور » چوونە یـاریـدەدان وکۆمەکـی « باراسطوغان » بۆ سەرخستنی فەرمانڕەوایی کالیجار ( الکامل ٩/٤٥٣ – ٤٥٤

سالّی ٤٣٠ك وادیارە کـەقرمیسین ( کرماشان ) مـاوەیی لەدەس حسام‌الدین ابو الشوك دەرهێنراوەو سپێردراوە بەیەکێ لەسەردارانی قوهستان ( کوهستان ) ( کەلە سەرەتادا وتمـان بەرلەوەی سپای موسـولمان ولاّتی کوردسـتان داگیربکات ناوچـەیێ‌بووە سـەربـە حـەلـەوان دەبێ مەبـەسـت هـورامـان بێ ) بـەلاّم ابـو الشـوك لـەشـکری کـردە سەری ولێی وەرگرتەوە وخۆیشی بەدیل گرت ، بەلاّم براکەی هەلاّتو خۆی گەیاندە دژی « ئەرنەبە »و لەوێ خۆی قایم‌کردو دەسو پیوەندانی نارد شاری « خولنجان » بپارێزن ، « ابـو الشـوك » لـەشکری ناردە سـەرخولنجان وگـەمارۆیدا . لەشکرەکـەی سەرنەکـەوت ، جارێکـی تـری بـە دزەری دا لەشکرێکی تری‌نارد کـەبێ‌دەشتەکەو قەلاّکەی « ئـەرنەبە » تالاّن‌بکەن‌و هـەرکەسێك بـەرهەلّستی‌و بـەرانگاری نیشـان‌دا بیکوژن ولەوێوەبچن بۆ داگیرکردنی « خولنجان »، جاسپاکەی « ابو الشوك » ئەم‌کارەی بەجۆرێ بە دزی‌و لەناکاوا ئەنجام دا خەلّکی شارەکە حەپەسان ، گەرچی سووکە شەڕێکیان کرد بەلاّم نەیانتوانی بەرگری بکەن ، خۆیان‌و شارەکەیان دایەدەستەوە ..

بەلاّم هێزی ناوشار خۆیان لەقەلاّکەدا قایمکـردو ، هێـزەکانی « ابو الشوك » لەقەلاّکەدا دەوریان‌دان وازیان لێـیـان‌نە هێنـا تا خۆیان دایەدەسـەوە، لەمانگی ذی القعدەدا بەتەواوی داگیریان کرد ( الکامل ٩/٤٦٤ – ٤٦٥ ) • بێ‌گومان وشەی «خولنجان» هـەر « خوێلین »ە کـوردێ‌کـەیـە ، ئێمـە دووجێ گـومان ئەبەین‌بەم ناوە : یەکـەم « طوزخورماتو » دووەم « مملحـە » ئەگەر خولینەکـە مـەبەسـت طوزخورماتو بێت‌ئـەوا قـەلاّی « ئەرنەبە » دەوروبەری گەڕی‌بـووە ، ئەگـەر «خوێلێنە کە » مملحەکەی قەیتوول بوبێت ئەوا « ئەرنەبە »ش « گوگتەپـــە » یا جێگـەیێکی یاخی بـووە لـەوناوەدا • ناشـکوری نـەبێت سەرچاوە لەم بارەوە زۆرکەمە وئەم‌کوردستانەش ئەوەندە جارە وێران کراوە ، بەگومانیش پیاو ناتوانـێ هیچ جێـێ بناسێتـەوە نەك هەربەدلنیایی •• دوکتور حسام‌الدین جارێ خولنجانی بە « طوز خورماتوو » داناوەو وجارێ « خانیجار » ؛ لـەڕاستیدا خانیجار « هەزارکانی » یەکەی لای قەرە هەنجیرە ؛ بۆیـە گۆڕاوە بەم‌ناوەو هەروەك لەسپارەی داقوق دا دیاردیم بۆکرد بوو « ئەدی‌شیر » لەکتیبی « کلدو – ئاشـور » بـڕلامج داێـی دەڵێن : « کانیکار – یاخانیجار » ••

### ٣ – ابو ماجد مهلهل کوڕی ابو الفتح محمد کوڕی عیار :

وادیارە لەسەردەمی « بدر » دا ئەم‌کوڕانەی « ابو الفتح محمد » هەریەکەیان کراون بەسەرداری هەرێمێ ؛ پاشان کـە کوڕانی « بدر » ونەوەکانی بەرامبەر بە دەسەلاّتی بوەیهیەکان

توزی کەم هێز بوون ، بنەماڵەی عیاری دەسەڵاتیان پەرەپێداوە وهەرێمەکانی ژێردەسیان فرەوان کردووە ، گەرچی هەتا ئەومانی شەڕ لەێوانی « ابو الفتح کوڕی ابو الشوك » « وابو ماجد مهلهل »دا ابن الاثیر باسی سەر گوزەشتی مهلهلی نەکردووە، بەڵام « حسین حوزنی » - خوالێ خوشبو - هەروا « محمد امین زەکی بەگی نەمریش ، بەپەیڕەوی لەئەو ، نووسیویانە : « مهلهل » لەسەرەتاوە لەقەڵای « بکورا » دابوو ، ( ئاوڕێکی پاشەوە ٢٠ وتأریخ الدول والامارات الکردیە ١٢٧ ) ئێمە نە لە ( الکامل )و نەلە کتێبەکانی ترا ئەمهەواڵەمان بۆنەچەسپا ، ڕوام وایە : « حوسین حوزنی » مێژوی فارسی دەسنووسی کۆنی زۆر لابووە کەئەم هەواڵانەی تۆمارکردووە ، جا ئەم « بکورایە » دوور نیە هەر ئەوجێگە بەبوویێت کەئەمڕۆ پێی ئەوترێ « بکرئاوا » ، لەگەڵ ئەوەشا کەئەو دەسەڵاتی بەسەر « سندە وصامغان » دابووە ، جا هەر چۆن بێت چونکە لە « الکامل »دا ناوی « مهلهل » لەساڵی ٤٣٠ك = ١٠٢٨ز دا بەهۆی ڕەوشتی جوامێرانەیەوە دەس‌پێ ئەکات کەئەویش بەرهەڵستی وبەرانگاریی «ابو الفتح»ی برازاێتی کەدەیەوێ شاڵاوبکات بۆداگیر کردنی قەڵای «خانم» سەرداریکی کوردی مێرد مردوو کەفریادی بۆبردووە ، ئێمەباسی سەرگوزەشتی ئەو لەوێوە دەس‌پێ‌ئەکەین وناچارین لەگەڵ سەرگوزەشتی « ابو الفتح »دا تێهەڵکێشی بکەین ...

## ٤ ـ ابو الفتح کوڕی ابو الشوك کوڕی ابو الفتح محمدی عیاری :

وادیارە «أبو الشوك» کوڕەکەی خۆیی بەناوی باوکی یەوە ناوناوە ، بەڵام لەبەر شکۆو ڕێزی باوکیتی ئەمی هەر بە «کنیە» کەیەوە ناساندووە ، بۆیـەناوە بنەڕەتـی یەکـەی نـەزانراوەو تاسالی، ٤٣٠ بـاسی نەهاتـووە، جا ئەمباسـە « ابن الاثـیر » لەدەنگ وباسی سالی ٤٢٠ دا نووسیویە بـەڵام خۆی دیاردی بۆئەوە کردووە کە قەوماوەکان سالی ٤٣٠ ڕوویداوە ، « زەکی وحوزنی » هەردویان لایان لەوەنەکردۆتەوە،کـە نووسیویـە : سالی ٤٣٠دا ك غوزە تورکمانەکان هەڵیـان کوتایـە سەرشـاری « هەمەدان » بەپێشداریی وسەرکایی « گوکتـاش ـ بوقـا ـ قزڵ و ـ فـەتنا خوسـرەو کوڕی مجـد الدولـەی بوەیهی » ، کەئەم هێزێکی زۆری دەیلەمی لەگەڵبوو شارەکەیان داگیرکردو ئەوەی ستەمو خراپەو ناشایەستـە بوو لەتـاڵانو ناموس بـردن هەمویان کرد ، ئنجا ڕوویان کردە « اسد ئاباد » ودێهاتەکانی دەوروبەری « دینەوەر » ئەوناوەشیان هەموڕامالی، «ابو الفتح» کەخێوی دینەوەر بوو لێیان ڕاپەڕیو کەوتـە کـوشتاریـانو بەسەریانازاڵ بوو ، کۆمەڵێیکی زۆری لێ بەدیل گرتن ، فەرماندە وسەرەکانی غوز کەوتنە نامەنووسین بۆ « ابو الفتح » وداوای بەردانی دیلەکانیان کرد ، « ابو الفتح » بەری نەدانو قایل نەبو کە بێ پەیمان ومەرج بەریانبدات ، ئەوان ناچاربوون پەیمانیان مۆرکرد ، ئنجا بەناوی ڕێك کەوتنەوە دیلەکانی بەرەلاکرد ٠ پاش

ئەم هەرایە غوزەکان نامەیان نووسی بۆ « ابو کالیجاری کوڕی علاء الدولە کاکویە » کە ئاشتبنەوەو داوایان لێکرد بێتەناویانو سەرکاریی وفەرمانڕەواییان بگرێتەدەست ، ئەو بەڕاستی زانی چووەناویان ، وئەوانیش هەڵیان کوتایە سەری ، بەڵام باشبوو توانی هەڵبێو خۆی ڕزگابکات بەلام هەموماڵو سامانی بەجێما وبەرتالآن کەوت • ( الکامل ٩/٣٧٤ )

سالی ٤٣١ك سپای سلطان جلال الدولە لەسەر مووچەو بەرات کردیانە ئاژاوە ، سولطان بۆڕاوێژوچارە ناردی بەشوێن ئەم ئەمیرانەدا : دبیس کوڕی علي کوڕی مزیدی اسدی ، ابو الفتح کوڕی ومرامی جاقانی ، وابو الفوارس کوڕی سعدی عیاری ( المنتظم ٧/١٠٤ ) •

هەرلەم ساڵەدا لەنێوان « ابو الفتح کوڕی ابو الشوك »و « ابو ماجد مهلهل »ی مامی دا شەڕێکی سەخت قەوما ، هۆی ئەم شەڕە ئەوەبوو کە « ابو الفتح » بووبوو بەجێ نشینی باوکی ولەدینەوەر دانیشتبوو ، شکوێ پەیدا کردبوو ، کەوتبووە پەرەپێدانی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیو،زۆر قەڵاو دژی داگیرکردبوو هەرێمەکانی ژێردەستی خوێشی لەشالآوی غوز پاراستبوو ، کوشتارێکی زۆریشی لێکردبوون و، ناچاری ئاشتبوونەوەیانی کردبو ، جا تۆزی لەخۆی بایی بووبوو گوێی بەفەرمانی باوکیشیەنەئەدا ، جا لەمانگی شەعبانی ئەم ساڵەدا ( ٤٣١ك ) هەڵی کوتایە سەر قەڵای بلوار ( بیلواری مایدەشت )

که هی‌خانم سەرداریکی میرد مردووبوو،خانم سەردار کەدۆنگەی شالاوەکەی کرد وتواناى بەرگرى لەخۆیا گومان نەئەبرد زوهاواری بردەبەر « مهلهل کوڕی محمد کوڕی عیار » ( عناز ) کەمالەکەی لە دەوروبەری « صامغان » بوو ، بەنامە داوای لێکرد بێت قەلاکە بخاتە ژێرڕکێفی خۆیەوە بۆئەوەی لەشەڕی « ابو الفتح » رزگاری بێت ، مهلهل لە کابرای نامە هەلگری پرسی : « ابو الفتح » خۆی هاتووە بۆگەمارۆدانی قەلاکە یاهێزی‌ناردووە ؟ ئەسپردەکە وتی : ابو الفتح خۆی گەمارووی‌دابوو ، بەلام ئێستەخۆی چووەتەوە وهێزەکەی ماوەتەوە ، مهلهل ڕووی کردە قەلاکە، کەگەیشتە ئەوێ تەماشای کرد « ابو الفتح » خۆی هاتوتەوە بۆگەمارۆی ، جا لەوڕێیەوە لایدا بۆجێگەیێکی تری بۆ ڕێ گومکی ، بەلام ابو الفتح دوای کەوت وبەجۆرێ لەیەك نزیك‌بوونەوە یەکتریان ئەدی « مهلهل » کەئەمەی بینی بای‌دایەوە بۆسەری‌و کەوتەشەڕەوە ، « ابو الفتح» سەرنجی دا هێزەکەی لێی هەلئەگەڕێتەوە لەترسا هەلات‌و هێزەکەشی بە دوایا هەلات،لەشکرەکەی مهلهل کەوتنە کوشتاری هێزی پیادەوراونانی هەلاتووەکان‌و بەدیل گرتنیان ، خود « ابو الفتح » کەئەسەکەی زۆر شەکەت‌بوو لەغاراکەوت ، وهێزە کەی‌مهلهل گرتیان‌و هێنایانە بەردەست مهلهل جا مامی بەرقەوە چەند کوتەکێکی لێی‌داو زنجیری کردو ناردی خستیانە زیندان ، وگەرایەوە، کە ئەم هەواله گەیشتە «ابو الشوك» خۆی سپای کوکردەوە ، وشالاوی کردە شارەزوورو گەمارووی‌دا ولەوێوە

چووەسەروڵاتەکەی ژێردەستی مهلهل ، بەهیوای ئەوەی بتوانێ « ابو الفتح » ڕزگار بکات ، گەمارۆکەدرێژەی کێشاو کوڕەکەی بۆڕزگارنەکرا ، سەرەڕەڤی مهلهل واپالی پێوەنا کە داوای کرد لە « علاء الدوله کوڕی کاکویه » بێت شارەکانی ژێردەستی « ابو الفتح » داگیربکات « علاء الدوله » لە خوای ئەویست هاتو دینەورو قرمیسینی ( کرماشان )ی داگیرکرد ، وئەوەی‌خراپەو ستەم‌بو دەربارەی خەلکەکە ڕەوای دی ، جائەم هەراوشەڕانە ساڵانی ٣١ - ٤٣٢ك بوو ( الکامل ٩/٤٧٠ - ٤٧١ ) بەم جۆرە ئەمیرانی کورد وڵاتەکەیان وێران ئەکرد ، براله‌کەڵ برانەئەسازا ، وبێگانەی پێ چاتربوولەبرا ... هەرلەم سالەدا ابو الشوك « سعدی »ی کوڕی بەسپاوە نارد بۆداگیر کردنەوەی دێ‌کۆك ( داقوق ) کەلەدەسی دەرکرابوو ، سعدی چووگەمارۆی‌دا وشەڕێکی قورسی‌کرد ، بەڵام خەلکی شارەکە بەرانگارییان کرد ، ئنجا خود « ابو الشوك » چوو شارەکەی گەمارۆ داو شورەکەی کونکون کرد وبەهێزەوە بەزۆر خۆی پیاکرد ، دەسو پیوەندی کەوتنە تالاّن وڕوت‌کردنەوەی هەندێ بەشی شارەکە وچەك‌وتفاق وشتومەکی کوردەکانیان هەمو تالاّن‌کرد ، خۆی تەنها یەك‌شەوی تیا مایەوە ، لەترسی ئەوەی نەوەك بەتەنیجین ( مەندەلی ) وحەلەوان داگیربکەن زۆوگەڕایەوە ، لەم وەختەدا « سورخاب ( زوراب )ی برای هەلی کوتابووە سەر هەندێ هەرێمی ژێردەسی، ئەوش بەهاوکاری وهاوسوێنی « ابو الفتح کوڕی ورامی جاڤانی » وهەوزە

جاڤانەکانبو ، جا «ابو الشوك» نامەی نووسی بۆ جلال الدولەی بوەچی وداوای هێزیلێکرد بۆکۆمەك ( الکامل ٩/١٩١٤ )

هەر لەم سالەدا «ابو ماجد مهلهل» چووە لای «علاء الدولە کاکویە » وکەوتە گلەو گازەندە لەدەس ابـو الشوك وداوای کۆمەکی لێکرد علاء الدولە کەلەوەبەر ، دەمیشیرین بووبوو بەسپاوە کەوتە تەکی، کەگەیشتە قرمیسین ( کرماشان ) ابـو الشوك گەرایەوە بەرەو حەلەوان کە علاء الدولە بـەوەی زانی بەدوایا رۆیی تا «میرگەدز = مرج القلعە » (سورخە دزیئەمڕۆ) لێی نزیكبووەوە لەم کاتەدا « ابو الشوك » رێی خۆی گـۆری بەونیازدی بچێت بەردو « سیروان » ولەوێ لـەقەڵاکەیا خۆی قایم بکات ، بـەڵام هەرچۆنبوو زانی نـایە بـەرخۆیو ددانی گرتبەخۆیا ونامەیێکی بەم رِشتەیە بۆ علاء الدولە نووسـی : « ... باشبزانە من لەترسا هەڵنەهاتووم ورایی نەبووم ، مـن نەمویست رێزوشکۆت بشکێنم ئـەگەر ناچارم بکەی بۆشـەر ئەوا یامن بەسەر تازاڵ دەبەو بەوهۆیەوە دوژمنانت هەمو سەرت تێئەکەن ! یاتۆ بەسەرمنازاڵ ئەبێت ئەوحەلە ناچار ئەبم خۆم بەممـە پاڵ « جلال الدولـە »و هـەموقـەڵاودزەکانم وهـەرێم وشارەکانم بخەمەژێر دەستی !!» . بەم جۆرە علاء الدولە لەگەڵی رێككەوت وپێکهات کەدینەوەر لەژێردەستی دابمێنێتەوە جـا علاء الدولە گەڕایەوە ، وهەرلەرێ نەخۆش کەوتومرد ( الکامل ٩/٣٩٤ ) . ئەم هەرِەشەیەی « ابو الشوك » هەرلە هەرِەشەکەی « بدر » ئەچێت ، بەڵام ئەو ، نەوازی لە هەرێمێکی وڵاتەکەی

هێنا نه وتی ولاتەکەم ئەخەمە ژێر دەستی لایێکی ترەوە ، ئەوزۆر پیاوانە تروتی : ئەگەرتۆ بەسەرمازاڵ بووی ئەوا ئـەکشێمەوە بۆچیاکانو دەشتو دەرتلێ ئەکەمبەئاگر ...

سالی ٤٣٤ك = ١٠٤٢ز « ابـو الشـوك » ڕووی کردە شارەزورو گەمارۆیدا وتالانی کـردو سوتانـدی !! گونـدو ئاوایەکانی هەمو ویران کردو دژی ( تیرانشا )ی گەمـارۆدا ، بەلام « ابو القاسم کوڕی عیاضی کورد » لەوێ دووری‌خستەوەو بەلێنی دایێ کە « ابو الفتح »ی کوڕی بۆبەربدات‌و لەزندانی مهلهل ڕزگاری‌بکاتو ئاشتیان بکاتـەوە ( الکامـل ٩/٥١٢ .

حوسین حوزنی » بەهەشتی ناوی قەلاکەی ناوە « بیزارشاه » منلاموایە ناوەکە « میرانشاه » بووە ، بەلام ئاشکرانیە لەچیاکانی هۆرامان دابووە یالە چیاکانی قەرەداغدا ، دوکتور حسام‌الدین کردوویە بە « تیران شاه » ! = « ملك النبال » !! کە «مهلهـل» بیستی ابـو الشوکی برای شالاو ئـەکاتەسـەری شـارەزوری بەجێ‌هێشت وڕووی کردە دەورو ـ بەری «سندە»و هەریمەکانی تری ژێردەستی « ابو الشوك » ، هەموی تالان کردو ئاگری تێبەردا ئابەمجۆرە گەلی‌کورد لە هەردوولاوە تووشی بەدبەختی‌و ئابودی ئەکرا ، ئنجا ابو الشوك نامەی نووسی بۆ « ابو القاسم کوڕی عیاضی کورد» داوای ئەنجامی بە لێنەکەی کرد : کەوتبوی « من ابو الفتحی کوڕت بۆڕزگار ئەکەم » ابو القاسم لەوەرامـا نووسی « مهلهل » بەقسەمی نەکردو تکاکەمی ڕەتکردەوە » .
ئنجا « ابو الشوك » لە حەلەوانەوە ڕووی کردە « صامغان »و

تالانی‌کرد وهەموئەوناوەشی تالآن کرد کەسەر بەمهلهل بو بەلاّم مهلهـل خۆی رژکـارکـردو ئـەسپردەی نـارد بـۆ نـاوبـژیو پەیمانێکی ئاشتیی دروکانەیان بەستو ابو الشوك گەرایـەوە ( الکامل ٩/٥١٢ )

ایرەدا با ئەومروون بکەینەوە : ( سـنده ) کـەناوی هات لـەچیاکانی نیـوان دینـەوەر ـ هەمەدان ـ شـارەزورابـووە لەسەردەمێکا لەگەڵ‌دینەومرا هەریەك قاضی یانەهەبووە ، جامن بەدووری نازانم هەر لەدەوروبەری سنەی ئێستـەدا بوویت . یاخود « سنه » ناوی ئەوی وەرگرتبێت ، بابێتەسـەر صـامغان لەسەرەتای ئیسلامەوە تاصەدەی‌چوارەم هـەرێمێکی گـەورەو ناسراوبوو ، مسعوودی لە ( التنبیە والاشراف )دا ـ لاپەرەکانی ٥٢ ـ ٨٤ ( تەرجمەی فارسی ) بەناوی ولایـەت ناوی بـردووە ، وادیارە لەنێوانی شـارەزور وئاذربایجانا بووە ، بـەم‌پێیـــە یەکێك‌بووە لەشارەکانی ئەردەلآنی کـۆن ، « دوکتور حسـام الدین » گومانی وایـە ئـاوی « زمکان » یادگاری ئـەوبێت ، بەلاّم « زمکان » لەکتیبە جغرافیایی وسنوری یەکانا ناتێستە بە « ضمکان »و «ضیمکان» ناوئەبرێت کە شیوێکە سەرچاوەکەی لە « گەعوارەوە » دێت کەسەربەکرندە ورو ئەکاتە کەرخـــە ( تحقیقات سـرحدیـه ١٠٨ سیاحتنامـەی مـسیوچریکوف ١٥٥ وفەرهەنگی جوغرافیای رزم‌آرا )

سالی ٤٣٥ = ١٠٤٣ز‌ا جلال الدولەی بوەیی مردو ابـــو کالیجاری کوری سـلطان الدولـه کەوتـه داگیر کردنی ولاتی

عراق ، لەم حەلەدا «ملك عزيز ابو منصور کوڕی جلال الدولە»،
لەواسط بوو بەتەمای شوێن گرتنەوەی باوکی هاتەوە بۆبەغدا ،
بەڵام سپاو فەرماندە کانی باوکی پاریدەیان نەدا کەخەلیفە ناوی
سلطانی پێوەبنێ ؛ لەبەر ئەوە چووەلای « نور الدولە دبیس
کوڕی مزید اسدی » ولەوێوە چووبولای قرواش
کوڕی مقلد عقیلی بەڵام کەسیان ڕوویان نەداینێ ، ئنجا
ڕوی‌کردە لای‌ابو الشوك ؛ کەخەزوری‌بوو ، ئەم ئەوەك
هەرپاریدەی‌نەدا بەڵکوزۆر ناپیاوانە پای‌نایەرپسی‌ملی‌و کچەکەی
خۆیی پێی طەلاق‌دا ( الکامل ۵۱۷/۹ )

سالی ٤٣٦ك = ١٠٤٤زا « ابو کالیجار » ڕووی‌کردە
بەغدا خەلیفە نازناوی «محیی الدین»ی پێوەناو ودوستوریشی‌دا
ناوی لە وتاری ئاینی هەینی ( خطبەی جمعە )دا لەگەل ناوی
خەلیفە بخوێنرێتەوە ، ابو الشوك یش‌لەولاتەکانی ژێردەستی
خۆیا خوطبەی بەناویەوە خۆیندەوە .. ( الکامل ۵۲۵/۹ )

تێبینی : لەم ڕۆژگارەبە دواوە ئیتر ناوی « بوەیهی » نایێت
مەگەربەدەگمەن ، باس ئەبێتە باسی ولات داگیرکارانی تازە
« ـ غوز ـ سەلجوقی » ..

سالی ٤٣٧ك = ١٠٤٥زا طغرل بەگی سەلجوقی فەرمانی
دا بە « ابراهیم اینال »ی برای کەشالاو بکاتە هەرێمی چیاو
داگیری بکات جا « ینال » شالاوی کردە « هەمەدان » کە
« کرشاسف کوڕی علاء الدولە کاکویەی تیدابوو ، ولەترسی

اینال حەڵاتبوو خۆی دابووە پاڵ کوردە جوزقانەکان ، لەوحەلەدا ابو الشوك لە دینەوەربوو لەترسی ینال چووە قرمسین ( کرما شان ) . اینال ددانی لەوڵاتەکان تیژکرد ؛ سەرەتا دینەوەری داگیرکرد . ئنجا رووی‌کرد کرماشان ؛ ابو الشوك ئەویش بەجێی هێشت‌و چووە حەلەوان ، هێزەدەیلەم وکوردە شازەنگانی‌یەکانی هەرلە کرماشان بەجێ هێشت بۆبەرگری . اینال نەیاکار دای بەسەریاناو کەوتنە شەڕەوە ؛ هێزی‌کورد ڕێیان بەغوزو سەلجوقیەکان نەدا کەپێش‌بکەون ، ناچار اینال بەسەر خەرگاوە کشایەوە وهێزەکان درێژەیان‌بەشەڕدا ‌تاماندووبوون ؛ سەرئەنجام اینال مانگی رەجەب شارەکەی داگیرکرد وکوشتارێکی سەختی لەهێزەکان کرد ومال وچەك‌وتفاقی ئەودوایانی تالآن‌کرد، هێزەکان بەشری وشکستەیی گەرانەوە بولای ، ابو الشوك ؛ کە بەتەواوی هەوالی شکاویی ئەمانی بیست ماڵ‌ومندال وسامان وچەك‌وتفاقی لە حەلەوانەوە گوێزایەوە بۆ « سیروان » وخۆی لە بنکەی حەلەوان دا سپابەزی‌کرد .. ینال مانگی کولەمانگ ( شعبان ) رووی کردە « صەیمەرە » وداگیری کرد وکوشتارێکی زۆری تیاکردو تالآنی‌کردو، قڕیشی خستە کوردە جوزقانەکانی دەوروبەری « صەیمەرە » ـ کە «گرشاسفی کوڕی علاء الدولە » پەنای‌برد بوە لایان ؛ گرشاسف‌و جۆزقانەکان چوونە ئەوشارەی کە « شهاب الدولەی ابو الفوارس منصور کوڕی حسین »ی تیدابوو ئنجا ینال ڕووی‌کردە حەلەوان کە ابو الشوك بەجێی

هێنشتبوو ، وخەلقەکەشی لەترسی غوزو سەلجوقی بەولاتەکانی کوردستانا بلاوبووبوونەوە ، جا اینال تالانی‌کرد وئاگری تێبەردا وکۆشکەکەی « ابو الشوکی » سووتاند ، پاش تەواو وێران کردن ئنجا بەجێی هیشت ( الکامل ۹/۵۲۹ )

( کاکە حەمەی مەلاکەریم هەروەك یاسای هەمیشەیی ، لەسەر ناوی « اینال » پەراوێزێکی نووسیبو کە ناوەکە اینال-یا-ینالە « دوکتور نەقشبەندی وەرامی دابووە لەگوڤاری نەوروزژمارە (۹) دا کە ڕاستەکەی «ینال»ە نەك « اینال » خوارزمی وتویە : هەموسەردارێکی تورکو هەمو پاشایێك جێ‌گرەوەی هەیەو پێی ئەوترێ « ینال »

باشەمالی ئاوایێت ، ئێمە ڕاپەڕ مو بوین بەم سەرچاوانەدا : « قاموس الاعلامی شمس‌الدین سامی » نووسیویە « اینال » ودائرە المعارفی فارسی نووسیویە : اینال :

واتا سەرداری عێل .. )

ئەمەوەها ، وەرەنگە « شهاب الدولە » « ابو الفوارس منصور » کوڕی « حسین مسعود » بێ کە تەرمەکەی « بدری حەسەنوەیهی » دوژمنی خوێی نارد بۆ مشهدی نجف بۆ شاردنەوەلەگۆڕا ..

هەرلەم سالەدا ( ٤٣٧ك ) ابو الشوك وابو ماجدی برای ئاشت‌بوونەوە ، مهلهل سوێن ـ نامەی دلنیایی بۆنارد کە « ابو الفتحی کوڕی لەزندانا بەمەرگی خوامردوە ، نەوەك بەکوشتن

ابو الغنائمی کوڕیشی لەگەڵ نامەکەنارد بۆ « ابـو الشوك »
کەلەباتی « ابو الفتحی کـوڕی » بیکوژێ ، « ابـو الشوك »
باوەڕی بە سوێن نامەکەی کردو « ابو الغنائمی » خـەڵات کردو
ناردی یەوە بۆ باوکی ( الکامل ٩/٥٣٠ )

هـەرلەم سـالـەدا « ابـو الشـوك » لـە « سـیروان »
نەخۆش کەوت و بەونەخۆشی یە مردوهەر لەوێ نێژرا ( الکامل ٩/
٥٣١ )

**٥ ـ سرخاب ( زوراب ) کوڕی ابو الفتح محمد کوڕی عیار :**

ئـەمیش هـەروەکو بـراکانی تاسـالآنـی ٤٣٠ك بـەدواوە
سـەرگوزەشـتی ئازانرێ لەمانگی شـەعبانی سـالی ٤٣٧ك =
١٠٤٥زا دا ئەم « سورخابـە » هەڵی کوتایە سەر بەندەنیجیـن
( مەندەلی ) کە سەعدی کوڕی « ابو الشوك » سەرداری بور ،
بەناوی باوکی یەوە . « سەعدی » هەرێمەکەی بـەجێ هێشت و
چووە « سیروان » کەباوکی تیابور ، سورخاب هەندێ هەرێمی
ولاتەکەی تالآن کرد ، ئەم کارەی بەرامبەر کاری ابـو الشوکی
برای بوو کەهەڵی کوتابووە سەرۆلاتەکانی ژێر دەستی ، جگەلە
« دزدیلویە » هەموی داگیر کردبوو لەسەرئـەوە تێوانیـان
تێکچووبووە .. کە « ابو الشوك » مانگی ڕۆژوی ئـــەم
سالە مرد کوردەکان لەدەوروبەری سەعدی کـوڕی تەکینـەوە
هەموخۆیان دایـەپاڵ « ابـو ماجد مهلهل » جـا « سـەعدی »
ناچاربو پەنای بردەبەر « ابراهیم اینال » وسپای غوزی هێنایە

سەرولات ( وەكلەمەودوا درێژەی بێ ئەدەین ) .. ( الكامل ٥٣١/٩ ـ ٥٣٣ )

سالی ٤٣٨ك = ١٠٤٦زا « مهلهل » شارەكانی « قرمیسین ودینەوەری » داگیركرد ، هۆی ئەم شالاوە ئەوەبوو كە « ابراهیم ینال » « بدر كوڕی طاهر كوڕی بەدری كوڕی حەسەنوەیهی » كردبوو بەمیری « كرماشان » ، هەركە ابو الشوك « بووبەسەرۆكی ولات ، یەكەم جار رووی‌كردە » مایدەشت ولەوێ لەشكربەزی‌كرد ، ئنجا رووی‌كردە قرمیسین ( كرمانشاه ) بەدر ئەوێی چۆل كرد مهلهل « قرمیسینی » « گرت » و « محمد »ی كوڕی ناردبو داگیركردنی « دینەوەر » كە سپاكەی « ینال »ی تیابوو ، جالێیان بووبەشەرو خەلكێكی زۆر لە هەردوولاكوژرا ، سەر ئەنجام هێزەكانی « ینال » هەلاتن‌و « محمد »شارەكەی داگیركرد ( الكامل /٥٣٥ )

### ٦ ـ سعدی كوڕی ابو الشوك حسام‌الدین فارس :

هەرلەم سالی ٤٣٨ك دا وەكو لەپێشا دیاردیمان بۆكرد ، « سەعدی » لەرقی « مهلهل »ی مامی ولاتەكەی خۆیی بەجێ هێشت‌و خۆی دایە پال « ابراهیم اینال »،هۆی تۆرانی ئەوەبوو كە مهلهل پاش مەرگی باوكی ، دایكی خواستبو بێ ئەوەی رێزبۆ سەعدی وعێلی شازەنگانی دابنێ ، لەبەرئەوە سەعدی بەكۆمەلێ شازەنگانی‌یەوە خۆی دایەپال « ابراهیم اینال » ـ كە بەلێنی دابووێ هەمو ولاتەكەی ژێردەستی باوكی ،

کەداگیرکرابوو ، بۆی وەربگرێتەوە ، جا کەچووە لای هـەم
ڕێزیلێناو هەم هێزێکی « غوز »ی خستەکی وناردی بـۆ
وەرگرتنەوەی « حەلەوان » ، لەمانگی ربیع الاول‌دا حەلەوانـی
وەرگرتەوەو ، خوطبەی هەینی بەناوی « ابراهیـم ینـال »ەوە
خوێندەوەو، چەنـد ڕۆژێ تیامایـەوە ، ئنجا خـۆی گەڕایـەوە
بۆمایدەشت ؛ کە مهلهل ئەم هەواڵەی بیست ، شاڵاوی کردەوە
حـەلەوان وداگیری کردەوە وناوی « اینال »ی لـەخوطبەدا
سڕی‌یـەوە ، دیسانـەوە « سـعدی » هـەڵی کوتایـەوە سـەر
« حەلەوان » ، «مهلهل» لەترسا بەجێی هێشت‌و چووە ناوچـەی
« بلوطه » و، « سعدی » هاتەوە ناو « حەلەوان » ولەوێوە هەڵی
کوتایە سەر « سورخابی » مامی ولەپڕ هەڵی فڕاندو هەموماڵ
وساماڵی تاڵانکرد وکۆمەڵێك سەربازی‌نارد بـۆ بـەندەنیجین
( مەندەلی ) وئەوێشی گرت‌و جێگرەکانی ( نواب ) سورخابی
هەمو دەسگیرکردو هەندێ لەشارەکەشیان تاڵانکرد ، سورخاب
هەڵات‌و سەرکەوتە سەردژی « دزدیلویە » وسعدی گـەڕایەوە
بۆکرماشان لەم‌هەلەدا « مهلهل »ی مامی ، « بەدر »ی کـوڕی
ناردبۆ داگیرکردنەوەی حەلەوان ، دیسانەوە سـعدی هێزێکی
زۆری کۆکردەوەو گەڕایەوەبۆ حەلەوان ، دیسان هێزەکانی مامی
شارەکەیان بەجێ هێشت،تەنها قەڵاوانەکان لەدژ ، کەدا مانەوە ،
سعدی داگیری کردەوەو، ڕوی‌کردە مهلهل ، کەمامی بەشاڵاوی
هێزدکەی زانی خۆی ڕزگارکردو پەنای‌بردە قەڵای « تیرانشاه
= بیزارشاه = میرانشاه »ی نزیك شارەزور وخۆی تیاقایم‌کرد،

غوزدکانی لەگەڵ سعدی‌دا هاتبوون زۆرناوچەیان تالآن کرد.
ەمێگەل وسامان وچوارپاو ولآغیان نەهێشت هەمویان پێچایەوە،
سعدی ـ کەمامی ـ لە سەنگەری سەختا دی کەوتەترسەوە
کەلە دژی حەلەوان دا بۆپاراستنی مانەوە ، جاگەڕایەوە سەریان
ودژەکەی گەمارۆدا وئەوانەی تیابوون دەسیان کرد بەشەڕ
لەگەڵ‌هێزە غوزەکەی ، بەلآم ئەمان سەرکەوتن‌و وقەلآکەی
حەلەوانیان داگیرکردەوە وکەوتنە کوشتارومال سووتاندن‌و
تالآن‌کاری‌و،چەپەلی بێ‌ناموسانە ، کەئەم هەوالآنە گەیشتە
« مالك ابو کالیجار » بەپەلەداوای کرد لەسپا بچن بۆیاریدەی
« مهلهل »و سەرکوت‌کردنی « سعدی » بەلآم لەشکرەکانی ابو
کالیجار زاتیان نەکرد ونەچوون ، پاشان « سعدی » هەرێمی
بەندەنیجینی خستەژێرڕکێفی « ابو الفتح کوڕی ورامی جاقانی »
( جاوانی ) وڕێك‌کەوتن کە هاوکارانە شالآوبك بکەن‌ودژی
« دزدیلویە » گەمارۆ بدەن ، کەسورخابی تیابو ، جا هەردوکیان
بەلەشکرەوە هەلیان کوتایە سەری ، کەنزیکی دزەکە بوونەوە
کەوتنە دەربەندێکەوە بێ‌ئەوەی هێزێکی پێشەنگیان ناردبێ
بۆتاقی کردنەوەی ڕێگەکە ، سورخاب لەسەر کەلی‌ئەم دەربەندە
هێزێکی کوردی داناوو ، هەرکەئەوان گەیشتە ناو دەربەندەکە
« سورخاب » بەرانگاریان بوو ، کەوتنە شەڕەوە ، کەسعدی
وابو الفتح هەستیان بە هەلەی خۆیان کرد ویستیان پشتاوپشت
بگەڕێنەوە سوودی‌نەبوو ، ئەسپەکانیان شاخی کردو هێزەکانیان
ڕەوی‌یەوەو، هێزی کوردی سورخاب لە سەرکەلەکەوە دایانتە

بەرتیرو بەرد ، بەم جۆرە لەجوولەیان خستن ، سعدیو ابو الفتح وسەردارەکانی تری هەموبەدیل گیرران ( الکامل ٩٠/ ٥٢٠ - ٥٣٤ )

سورخاب کە « ابو الفتح ورام » وهەردووکوڕەکەی وبراکەی وخالد کوڕی عومەر وسعدیی بەدیل گرت هەردووکورەکەی ابو الفتح وخود ابو الفتحی هەلواسی ( المنتظم ٨/ ١٣٠ ) ( لامهوایە نووسەری المنتظم هەلەی فەرمووە « ابو الفتح ورام » بەپێی الکامل ١٠/٢٢٧ تاسالی ٤٥٥ك ژیاوە پاشان لەبەغدا مردووە وتەرمەکەیان بردۆتەوە بۆگەرگەرایا ) (کوت) .. جا ئوغوزەکان وئەو کوردانەی کەلەناوچەکەدابوونو سەر بە « سعدی » و « ابو الفتح » بوون بلاوەیان لێکرد ( المنتظم ٨/١٣٠ )

سالی ٤٣٩ك = ١٠٤٧زا کوردە لوڕەکانو کۆمەلەکانی سەربە سورخاب لەناو نالەباری و بەدڕەوشتی و، زۆرو زەبری « سورخاب » بەتەنگ هاتبوون ، دەسگیریان کردو وبردیان بۆ « ابراهیم ینال ئەوچاوێکی هەلکولی‌و، داوای‌لێکرد کە «سعدی کوڕی ابو الشوك » لەبەندیخانە دەرکاوبەری دات « سورخاب » گوێی‌نەداو بەقسەی‌نەکرد بەلام « ابو العسکر »ی کوڕی - کەهەر لەبەرایی یەوە ڕازی بەوە نەبوو کەباوکی « سعدی » زندان کردبووو ، لەسەرئەوە لەباوکی تۆرابوو دوور کەوتبووەوە - لەم هەلە سودی وەرگرت وچووبەرەو تەلاکەی

باوکی ودەرگای زندانی شکاندو « سعدی » ئاموزایی لەبەنـد ڕزگارکردو ڕنجیروپالە هەنگەکەی شکاند ، وبەچاکەوپیا وەتی ملکـەچی کردو داوای لێکرد باسی ڕابوردوو لـەبیر بباتـەوەو لاپەڕێکی دوستایەتی تازە بدەنەلاو، ئەودەس پێشکەری بکات بۆتکای بەردانی مامی ـ واتا سورخاب ـ گەرچی ئەمەموجۆرە خراپەیێکی دەربارەی « سعدی » ڕەوادیبوو ، سعدی بەقسەی « ابـو العسکر » هـەستا چوو بەرەولای « ابراهیـم ینال »و کوردێکی زۆریشی لەگەڵ خۆی برد، بەلآم ابراهیم ینال هیواکانی بەجێ نەهێناو تکاکانی پەسەند نەکرد ، بەدل شکـاوی بەجێـی هێشت وچوو بۆ « دەسکەرە = دەستکرد » ولەوێوە نامـەی بۆخەلیفەو جێگرانی « ملك ابو کالیجار » نووسـیو ملکـەچی وفەرمانبەری خۆیی نیشاندا ( الکامل ٩/٥٣٦ ـ ٥٣٧ )

هـەرلـەم سالـەدا (٤٣٩ك) ابراهیـم ینال شـالآوی کـردە « کەنگەوەر »ی سەربە « اسد اباد » وداگیری کرد ، سەرداری ئەوێ کەناوی «عکبر کوڕی فارس» بوو ویەکێبوو لەسەردارانی سەربە « گرشاسف کوڕی علاء الدولە کاکویە » خۆیو دەسو پێوەندی کشانەوە بۆ «قەلآی سەرماژ» وسـەرکەوتە سـەرقەلآکە، بەلآم « ابراهیم ینال » بەوەوازی نەهێنا لەشکری بـەڕێخست بۆداگیرکردنی قەلآکانی سورخاب بە فەرمانیەیی «احمد کوڕی طاهر »ی زاوایو وەزیری ، سورخابیشی لەگـەلی نـارد کــە مۆرەکـەی بنێرێ بـۆ باوەڕ ، کە قەلآوانەکـان، دزەکـە بـدەنە بەدەستەوە ، احمـد طـاهر « لەسەرەتـادا ڕووی کـردە » دزی

« کەلەکان » ئەم بزمخۆیبە دەستەوەنەدا ئنجا احمد ڕوویکردە قەلای « دزدیلویە » وگەمارۆیدا ، بڕێ لە هێزمغوزەکـانیش ڕوویان کردە بەندەنیجین ( مەندلی ) ولەمانگی جمادی الاخریدا کەوتنە تالاَنو کاری خراب تارادەیی بۆ دەرخستنی مالی شاراوە زۆرکەسیان لەژێر دارا کوشت ٠٠ ( الکامل ٥٣٦/٩ دواوە )

( دوکتور حسام‌الدین نەقشبەندی گوێا لەسەرداوای کاکە حەمەی مەلاکەریم جێوڕێی هەندێ لە شاروقەلاَ ناوهاتووەکانی ڕوونکردوتەوە ، جالەگوڤاری نەوروزی ژمار (٩)دا نووسیویە : « مسعر کوڕی مهلهل » وتویە : ناوی اسد اباد «لەوێوە هاتووە» کە اسد کوڕی ذیسرو حمیری لەگەل تبع دا بەوێدا ڕابوردووە ئەمشارەی دوروستکردووە ، واتا شارەکە عرب تیادانیشتوون بەرلـەاسلام » ٠٠ زۆر بـەداخـەوە کـە « حسـام‌الدین » هەروابەسادەیی قسەکانی شاعرێکی درۆزنی ڕیاکاری لابۆتـە دەقی مێژویی بێئەوەی لێی بکۆلیتەوە ، ئایا ڕاستـە « تبع » بەکوردستانا تێپـەڕیوە ؟ چۆن تەنهـا بـەڕابوردنی « اسـد » بەوناوەدا ئەمشارە دوروستبوو ؟ ئەگەرعرب دوروستی کـرد بۆچ ناوینەنا « اسدیە » ؟ خۆش بەختانە کتێبی « حدود العالم من المشرق الی المغرب » کـە سالی ٣٧٢ك = ٩٨٣زا نووسـراوە ( واتا بەرلە « ابو دلف » بە (٣٠) سال ) وتویە : « ٠٠ اساباد ـ کرمانشاهان ـ مێرگ سێشاری ئاوەدانن لە ڕێی حاجیانا ٠٠» لەم دەقە وادیارە کە ناوەکە « اسد » نەبووە ، ( ئاساباد )بووە، کەدەبێ لەبەرزۆریی « ئاشی ئاوی » بەم ناوەناسرابێت ، هـەم

کاك حسام‌الدین نووسیبوی رەنگە دزدیلویە «دزی دەلو» بێت ، ئەمەدوورە چونکە ناوی دەلو لەمێژووی کۆنا نەبیستراوە تەنها بەھۆی ناوی دووزانای «دلوی» یە وەنەبێ (المنتظم ٥/٣٧و٦٩ـ ٧٠ ) بەڵام لەناوی « کەڵەکان » کەدەکەوێتە ئێوانی چیاکانی ئاتەشکەدە ـ ماکوان ـ کناری‌روباری « دودان » کەجێگەیێکی ئەوەندە سەخت‌بوو «احمد طاهر» نەیتوانی داگیری‌بکات بۆمان دەرئەکەوێ « دزدیلویە » هەر « بزلی »یە ، وەك‌بۆی چووین )

هەروا هەندێ لەغوزەکانیش چوونە سەر «ابو الفتح ورام» ئەو خۆی لێیان‌لادا ،ماڵو سامانەکەی بەجێ هێشت کــــە بەتاڵانی‌یەوە خەریك‌بن ، بەڵام‌غوزەکان ولزیان لـەخۆی نەهێنا دوای‌کەوتن . « ابو الفتح » لەترسی ئەوەی نەوەك پەسەریا زاڵ بن‌لێیان هـەڵگەڕایـەوە کەوتـەکوشتاریان وبـەدیل گرتنیان ، بەم‌جۆرە بـەتەواوی بـەسەریاڵا زاڵ‌بوو وهـەمو ئەوسامانـەی داگیرکرد کـە بەتاڵان هێنابوویان وهاواریشی نارد بـۆ بـەغدا بگەنـە فریای ، بـەڵام دەوڵەتی خەلیفـەی بـەغدا کـەم‌دەس‌و کەم‌هێزبوو ، لەبەرئەوە بنەماڵەی « ورام » پەڕینەوە بۆبـەری خۆرئاوای دجلە . ئنجـا « غوزەکـان » لەمانگـی ڕەجـەبدا شەبەیخونیان کردەسەر « ابو الشوك » ـ کەلەو حەلەدا تەنها دو فەرسەنك لە « باجسری » وە دووربوو ، جا لەترسی پەلاماری « غـوز » خـۆی‌و کـەس‌وکاری بـەجۆرێ هـەڵاتن براناگای لەبرانەمابو وکورلەباوك، وخەلکێکی زۆریان لێ‌کوژرا، غوزەکان دارایی وسامانی هەمو یا نیان ڕووتاندەوە وتاڵان‌کرد ، خــود

سەعدی‌ش کە دارایی‌وسامانی خۆیی لەقەڵای سیروانەوە گواستبووەوە ئەویش هەموی بەرتاڵان کەوت ، خۆی تەنیا بەموی ڕیشی‌یەوە ڕزگاربوو ، ئابەم جۆرە غوزی سەلجوقی تورکمان دەسکەرە ـ باجسری ـ قصر سابورو هەمو ناوچەکەیان تاڵان‌کردو هەوالیش گەیشتە بەغدا کە « ابراهیم ینال » ڕووئەکاتە بەغدا ، لەتاوان خەڵق کەوتنەلەرزو سەردارانو فەرماندەیان لەدەوری « ابو منصور کوڕی ابو کالیجار »ی سلطانی بەغدا کۆبوونەوە بۆتەگبیر وڕاویژو وباسی : چۆن بەرانگاری کردن .. بەڵام سەرئەنجام هێچیان پێ‌نەکرا کارەساتەکە سەخت‌تربووە ... سەعدی خۆی گەیاندە دیالی ولەوێوە ڕوی‌کردە لای « ابو الاغر دبیس کوڕی مزید » ولەپاڵ ئەوا جێی خۆی خۆش‌کرد . « ابراهیم ینال » چووە سیروان وقەڵاکەی گەمارۆدا وخەڵکەکەی بەتەنگ هێناو هێزێکی نارد بۆتاڵان‌کردنی ئەودوای کوردستان تادە فەرسەنگ ماوەی مابوو کەبگاتە « تکریت » جاپارێزەری وڵاتەهات کلیلی هەرێمەکەی تەسلیم بە «اینال» کرد ، ئنجا ینال فەرمانی‌دا بە تاڵانی پاشماوەی سامانی سەعدی‌و، خۆی هەرێمەکەی بەجێ هێشتو یەکێ لە ئەفسەرەکانی خۆیی ـ کەناوی «سەخت‌کەمان» بوو ـ لەوێ هێشت وگەڕایەوە بەرموحەڵەوان ولەوێوە بۆ هەمەدانو دووکوڕەکەی «ابو ماجد مهلهل» لەگەڵ خۆی برد ، کەناویان « بدر ومالك » بو ، ڕێزو شکوێ لێنان .. لەم سەردەمەدا خاوەنی « قەڵای سەرماژ » کەیەکی بوو لەکوڕانی بەدری کوڕی

حەسەنوەیهی ـ مرد ، پاش ئەوە قەلاکە تەسلیم بوو بە « ابراهیم اینال » ، پاشان ابراهیم اینال وەزیرەکەی خۆیی نارد بۆ داگیرکردنی شارەزور ، « ابو ماجد مهلهل » لەترسا ولاتەکەی بەجێهێشت و دوورکەوتەوە ، احمد کوری طاهر کەهەم وەزیروهەم زاوای اینال بوو لەقەلای « تیرانشاه = بێزارشاه ـ یا ـ میرانشاه سپابەزیکرد وگەمارۆیداو شورەکانی کونکون کرد . مهلهل نامەی نووسی بۆخەلکی شارەزور کەبەرانگاری بکەن . تا بەهێزێکی گەورەوە ئەگەمەفریاتان ، خەلکی شارەزور کوشتارێکی سەختیان لەغوزکرد . احمد کوری طاهر دووبارەگەرایەوە سەرشارەزور وداگیری کردەوە وکوشتارێکی زۆری لەخەلقەکەکرد ، غوزەکانی لای مەندەلیش لەگەلهێزی ترا رویانکردە بەرازەرود (بلدروز) وتاجۆگەی سەلیل پێشکەوتن و، لەگەل « ابو دلف قاسم کوری محمدی جاقانی (جاوانی) کەوتنە شەرەوە ، پاش شەرێکی زۆر سەخت «ابو دلف» بەسەریانا زال بوو بنەو بارکەو کرانباریانی هەمو لێ گل دانەوە ...

هەر لەمانگی ذی الحجەی ٤٣٩ك = ١٠٤٧زا غوزەکان هەلیان کوتایە سەر شارەکەی « علي کوری قاسمی کورد » وکەوتنە تالان وخراپە کاریی ناپیاوانە وبێناموسانە بەلام « ابودلف » رێی دەربەندە کەی لێگرتن و کوشتارێکی زۆری لێکردن وهەمو تالانو گرانبارەکانی خەلکی لێیان گلدایەوە ( الکامل ٥٣٦/٩ ـ ٥٤٠ ) وادیارە مەبەست لەشاری علي کوری قاسم « سوماری » ئێستە بێت .

ئەم جێگەیە لەپشتی دەربەندەکەی گەلاڵی حەڕانەوەیە ، بـــۆ تێروتەسەل زانینی ئەمباسە سەرنجـی سیپـارەی بەندەنیجـــین ( مەندەلی ) بدەن لەنووسراوەکانی من .

سالی ٤٤٠ك = ١٠٤٨ز گـەمارۆدانی قـەلاَی تیرانشاد ( بیزارشاھ ـ میرانشاه ) لەلایەن احمد کوڕی طاھرەوە ھەر درێژەی کێشابوو بەلاَم سپاکـەی دووچاری درم وپـەتابوونو زۆریانمرد ، احمد پـەیامی بۆ اینالی خـەزوری نارد وباســی کوشەندەیی درمەکەی کرد وەداوای کومـەکو یارمەتیکـرد ، ابراھیم فەرمانیدا کەشارەکە بەجێ بھێلێو بکشێتەوە ، احمد بەسپاوە کشایەوە بۆ « مایدەشت » ھەرکە مھلھل ئەم ھەواڵەی بیست بەپەلە یـەکێ لـەکوڕەکانی نارد بـۆ داگیرکردنـەوەی شارەزور ، جا غوزەکانی بنکسەی سیروان کـە وەڕز بوبـــون کەوتنـە ترســـەوە ، ئنجا ھێزێکی غوز ڕوی کـردە حەلـەوان ودزەکەی گەمارۆدا بەلاَم نەیتوانـی حەلـەوان داگیـربکـات کەوتەتالاَنی ھەرێمەکە وئەوەی لەوەبەر لێیان مابووەجێ ئەوەشیان ھەموبرد ، ئنجا مھلھل بەماڵو منداڵـەوە ڕووی کردەبـەغداو لەگەڕەکی « باب المراتب » نیشتـەجێبوو ، کـەماڵ ومنداڵـی دامەزراند خۆی گەڕایەوە بۆبنکەکەی کـەشەش فـەرسەنگ لەبەغداوە دووربو ( الکامل ٩/٥٤٥ )

ھەرلەمسالی ٤٤٠ ەدا سعدی کوڕی ابو الشوك لەگەل ابراھیم ینال دا کەوتەنامە گۆڕینـــەوە ، کەلە مـەترسی دلنیابوو

شاری حلەی بەجێهێشت ـ کەلەوحەلەدا دبیس کوڕی مزیدی، اسدی « سەرداری بوو ـ چوو بۆلای ابراهیم ینال وبڕیاریان دا : کەسعدی هەر ولاتێکی بەدەس هێنایەوە ـ جگەلەوانەی ڕاستە وخۆلە ژێردەستی ابراهیم اینال خوێنداهەن ـ هەموی لەژێر ڕکێفی خۆیا بینیتەوە ، جا « سعدی » بەرەو دەسکەرە کەوتەڕێ ولەوێ لەگەڵ سپای سەربەبەغدادا کەوتەشەڕەوەو ڕاوی‌نان وشاری دەسکەرەی داگیرکرد، زۆری نەبرد سپاێکی زۆر نێررا بۆ سەرکوت کردنی بەلام سعدی ئەوسپایەشی شکستپێ دا وسەردارەکانی کوشتو کەوتەپەرەپێ دانی ولاتەکەی ( الکامل ٥٥١/٩ ) .

سالی ٤٤٢ك = ١٠٥٠زا « ابو ماجد مهلهل کوڕی عیار » چووە لای سلطان طغرل‌بگ ، سلطان ڕێزی لێنا ومیرێتی کەی بەرەسمی ناسی ولەسەر کورسێکەی خۆی‌هێشتیەوە ، کەئەمجێیانەی لەژێر ڕکێفابوو : سیروان ـ دقوقاء ـ شارەزور ـ صامغان .. وتکاکەیشی ( بۆبەردانی « سورخاب »ی برای. کەئەوحەلە لەزندانەکانی « سلطان طغرل » دابوو ) قەبول کرد . سورخاب کەلەزندان ڕزگاربو چووە قەلای « ماهکین » ، «سعدی»ش نێررایە قەلای «ڕادەندەبین» (الکامل٥٧٠) (وادیارە ئەمقەلای ماهکینە کەسەردەمێ ناوچەی فەرمانڕەوایی خێلەکانی « ماهکین » بووە ، هەروا قەلای « ڕادەندەبین » ، ئەکەوتنە نێوان ( مەندلی ـ پشتکۆ ـ کرماشانەوە ) ..

سالی ٤٤٤ك =١٠٥٢زا مانگی ذی القعده «سعدی» کوڕی « ابو الشوك » بەسپاییکی طوغرول بەگەوە ڕووی‌کردە عراق، لەسەرەتادا لە « مایدەشت » لەشکر بەزی کردو لەوێوە بەغوزەکانەوە هەڵی کوتایە سەر ابو دلف جاقانی ( جاوانی ) کەتوانی خۆی لەدەستی رزگاربکات ، بەلاّم « سعدی » تالاّنی کردو ئەو ناوەشی - تانعمانیە - هەموتالاّن‌کرد وکەوتنە کوشتاروکاری خراب ، ئنجا چوو بەرەو « بەندەنیجین » ( مەندەلی ) ، « خالد کوڕی عومەری خالۆی » کەلە « زریر » بوو ، کوڕەکانی ناردەلای بۆحەلەوانو سکالاّی لە ستەمی مهلهل کرد ، سعدی بەلێنی دایێ کەتۆلەی‌لێ‌بکاتەوە ، جا بوئەوە بەهێزێکی زورەوە شالاّوی کردەسەر « مهلهل » وبەسەریازال بووبەدیل‌گرتی « ومالکی » کوریشی هەرگرتو هەرتالاّن وڕاوڕووتێکی خەلکی کردبوو وهەموساماتێکی هەبوو داگیر کردو وهی تالاّن کراوەکانی دایەوە دەستیان ، وخۆی گەرایەوە بۆحەلەوان ... کەئەم هەواله گەیشتە بەغدا خەلکی لەترسا هاتنەلەرزین ، سپای « ملك رەحیمی کوڕی ابو کالیجار » ئامادە بووکە ڕووبکاتە حەلەوان بۆ شەڕ لەگەڵ سعدی، « ابو الاغر دبیس کوڕی مزیدی اسدی »ش لەگەلی ئامادە بوو بەلاّم هیچیان پێ‌نەکرا ( الکامل ٩/٥٨٩ - ٥٩٠ ) ئێمە ئەم‌باسەمان دووردرێژ لە سیارەی مەندەلی دا بلاّوکردۆتەوە ..

هەرلەم‌سالی ٤٤٤ك کە « سعدی » مهلهلی مامی بەدیل‌گرت ، بدری کوڕی ابو ماجد مهلهل هاواری برد بۆسلطان

طغرل‌بەك »و، داوای لێکردکە دوستور بە « سعدی » بدات
کەمهلهلی باوکی لەزندان بەرەڵابکات ؛ طوغرول بەك کوڕێکی
« سعدی » کەلای‌دیل‌بوو خستەتەکی‌و ئەسپردەکەی لەگەڵ
نارد کەبە سعدی ڕابگەیێنێ : ئەواکوڕەکەت نێررایەوە
لەتوانای‌ئەوا زوو « مهلهل » بەردە ، ئەگەر سەرپێچی بکەی‌لە
بەردانی‌دا ئەوا بەرپەرچی کردەکەی خۆت ئەبینی . کە بەدرو
ئەسپردەی سلطان گەیشتنە هەمەدان بەدر دوواکەوت‌و
ئەسپردە کەنامەکەی بۆبرد ؛ سعدی کەنامەکەی وەرگرت
چارەی تورش‌کرد وتووڕەبوو ، وسەرپێچی لەبەگوێ کردنی
فەرمانەکەی طوغرول‌بەك کردو، ڕووی‌کردە حەلەوان ، بەڵام
نەیتوانی داگیری بکات ، کەوتە هات‌وچوون لەنێوانی « ڕوشن
قبادو وبردان »دا ونامەیێکی « بۆملك رحیم » نووسی تیا
ملکەچی وفەرمانبەری خۆیی نیشاندا ، لەسەرئەمە « ابراهیم
اسحاق‌و سەختکەمان » کەلە پیاو ماقوڵان وفەرماندەیانی سپای
طوغورل‌بەگ بوون بەلەشکردوە هەلیان‌کوتایە سەر « سعدی »
بەزیبەری « بدر کوڕی مهلهل » ، جا « سعدی » هەڵات‌و
غوزەکان گەڕانەوە بەرەو حەلەوان وبدریش بەهێزێ غوزەوە
شاڵاوی بردەسەر « شارەوزور » ، ئنجا سەعدی بۆی دەرچوو
بەرەوقەڵای « ڕوشن قوباد » ( الکامل ٩/٥٩٤ ـ ٥٩٥ )
وادیارە ئەم ( روشن قباد وبردان )ە لەناوچیاکانی حیمرین‌دا
بوون وەکو منصوریە الجبل‌و ئەوناوە ، وباوەڕناکەم ئەم‌بردانە
وبەردانەکەی باکوری بەغدا ـ کەبە شەرابی چاك بەناوبانگ‌بووە

وشاعرانی عەرەب پیا هەلیانداوە وکاك حسام‌الدین لەگوڤاری نوروزدا کردبوویە « فارسی » - یەکێن »

سانی ٤٤٦ك = ١٠٥٤زا مانگی شوال « ابراهیم کوڕی اسحاق » کەلە حەلەوان بوو گەیشتە « دەسکەرە = دستگرد » خەلکی شارەکە لێی ڕاپەڕین وبەرانگاریان کرد ، بەلام عێزیان کەمبوو توانای بەرگری ودرێژەدان بەشەڕیان نەبوو ، ناچار بلاوەیان لێکرد وهەلاتن وغوزەکان خۆیان کرد بە شارەکەداو کەوتنە تالان وراوورووت و دارکاری کردنی ژنومندال بۆ پێ درکاندنی سامانی شاراوە ، پاشان ڕوویانکردە ڕوشن قوباد کەلەژێر دەستی « سعدی » دابوو مال‌و سامانەکەی‌هەم لەوێ‌و هەم‌لەبردان دابوو ، ئەو خۆی لەدۆستایێتی طوغرول‌بەگ دوور خستبووەوە، خۆی بۆشەڕ ئامادەکرد بوو قەلابەندی کردبوو ، سپای طوغرول خەلقی ئەم‌شارانەی یەکسەر تالان کردو گوندەکانی وێرانکرد ومال وسامانی خەلکی ولاتەکە هەمو بەتالان چوو ( الکامل ٩/٦٠٢ - ٦٠٣ )

سانی ٤٤٧ك = ١٠٥٥زا سلطان طغرل‌بەگ کەوتە بیری چوونە حج‌و نامەی نووسی بۆ فەرماندەکانی لە دینەوەرو کرماشان‌و حەلەوان‌و شارانی تر کەئازوقەوئالف بۆسپاو چارەواکانیان ئامادە بکرێ کە گەیشتە حەلەوان دەس‌وپیوەندانی بەرێی خوراساندا بلاوبوونەو ، خەلکی ولات کەوتنە ترسەوە... بەلام طوغرول بەك ئەسپردەی نارد بۆلای خەلیفە ، دلنیایی‌و بچووکی خۆی‌و بەندەیی وفەرمانبەری ڕاگەیاند ... خەلیفە

فەرمانیدا کەناوی سلطان طغرل بخرێتە خوطبەوە وڕێی بۆچون کرا کە بێتە ناوبەغداوە .. پاش گەیشتنی بەچەند ڕۆژێ سپاییەغوزەکان ـ کە لەڕکێفی دا هاتبون ـ لەبازاری بەغـدادا ئاژاوەیێکیان خستەوەو کوشتار دەستی پێکـردو، غوزەکـان کەوتنەتالان وڕاووڕووت وملك رحیمی ئاخـرین « سـلطانی بێدەسەلاتی بوەیهی » دسگیرکراو نێررا بوقەلای «سیروان»و « قریش کوڕی بدران عقیلی » فەرمانڕەوای موصلیش بەخۆیو عەرەبی ئەوناوەوە لەترسان بەڕووتیوقووتی هەلاتنو خۆیان کوتایە پەنای « بدر کوڕی مهلهلی عیاری »و لەترسی غوزەکان لەخێوەتەکانا بەمجاجمو لێفەشاردرانەوە ( الکامل ٩/٦٠٩ ـ ٦١٣ )

وادیارە قریش لەم سەردەمەدا لەبەغدابووبێت وەگەرنـــە هێشتا غوز موصلیان داگیرنەکردبوو ..

سالی ٤٤٨ك = ١٠٥٦زا خەلیفەی عباسی « القائم بالله » خەدیجە خاتوونی کچی داوودی برای سولطان طوغرولی خواستو لەکاتی مارەبڕیندا ئەم فەرماندە وپیاوە گەورانـــە بانگکرابوون : « عمید الملك کندری وەزیری طوغرولبەگ ، ابو علي کوڕی ملك کالیجار ، هەزاراسپ کوڕی بنگیير کوڕی عیاضی کورد وکوڕی ابو الشوكو هەندێ فەرماندەیانی تری .. ( الکامل ٩/٦١٧ ) دەبێ مەبەست لە کوڕی ابو الشوك « سعدی کوڕی ابو الفتح فارس » بێت ..

سالی ٤٥٠ك = ١٠٥٨ز‌ا خەلیفەی عباسی القائم باللە-بەغدادی بەجێ هێشت لەناو زاڵبوونی « بەساسیری »و ئاژاوەی شیعیتیو سوننیتی « سولطان طوغرولیش دوچاری یاخی بوونی « ابراهیم ینال »ی برای‌دایکی بوو ، کە طوغرول توانی « ابراهیم » ڕازی‌بکاو لەشۆڕشی ئەو دلنیابێت ، ئنجا کەوتە کۆشش وهەوڵ بۆگێڕانەوەی خەلیفە بۆبەغدا ئالەم بگرەوبەردەیەدا خەلیفە ١١ مانگی ذی القعدە سالی ٤٥١ك لەگەڵ مهارش‌دا گەڕایەوە بەرەو عراق بەڕێی شارەکەی بدر کوڕی ابو ماجد مهلهل عیاری‌دا بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوەوە دڵنیابێ لەو کەسانەی ڕووی تێ‌ئەکەن ، لەمحەلەدا « ابن فورك » گەیشتە-کۆشکەکەی بدر وداوای لێکرد کەبینێرێ بۆلای مهارش .. هەروا کابرائیکی دەشتەکیش هەوالی هێنا کە « مهارش »و «خەلیفە»ی لە «تل عکبرا» دیوە، بدر بەم هەوالە زۆر دڵشادبوو، بە خۆی‌وابن فورك ودوونۆکەری کەوتنە ڕێ‌ودیاریەکی باشیشی بۆبرد ، « ابن فورك » نامەکەی طوغرول‌بەگی دایە « خەلیفە » لەگەڵ دیاری ودەهەنەو خەلاتێکی زۆرا کە هێنابووی . هەرکەپەیام گەیشت‌بە طوغرول بەگ کە خەلیفە لەشارەکەی بدرە، کوندەری‌وەزیری وفەرماندەکان وپەردەدارانی نارد بۆپیشوازی خەلیفە وخەیمەوخەرگا ودیاری زۆریشی‌بۆ نارد ... تاد .. ( الكامل ٩/ ٦٤٦ - ٦٤٧ )

سالی ٤٥٥ك = ١٠٦٣ز‌ا « سولطان طوغرول بەگ لەئەرمەنستانەوە گەڕایەوە بەغدا خەلیفە ویستی پێشوازی

بکات ، بەڵام طوغرول مەیدانی نەداو خۆیلەوە بچوکتر دانا کەڕای بکەوێ خەلیفەبچێ بەپیریەوە ، ئنجا خەلیفە « ابن جهیری » وەزیری نارد بۆپێشوازی ، لەم‌ساتە دا ئەم‌سەردارانە لەگەڵ سولطانابوون : « ابو علي کوڕی ملك کالیجار، سورخاب کوڕی بدر ، هەزاراسبو هی تری ... ( الکامل ١٠/٢٥ ) جا هەرلەم سەفەرەدا کچی خەلیفە گوێزرایەوە بۆسلطان طوغرولبەگ،جا ئەو مانگی ربیع الاول لەبەغداوە گەرایەوە بەرەو چیاو کە گەیشتە ڕەی لەوێ نەخۆش کەوتو هەرلەوێ‌مرد پاش مەرگی طوغرول لەدیوانی خەلافەتەوەنامە نووسرا بۆئەم سەردارانە : « شرف الدولە مسلم کوڕی قریشی خێوی موصڵ، نور الدولە دبیس‌کوڕی مزیدی اسدی ، هزاراسب بنیوەرام ، وبدری کوڕی مهلهل ، کەبگەنە بەغدا .. ( الکامل ١٠/٢٧ )

سالی ٤٨٧ك = ١٠٩٤ز مانگی شوال « بەرکیارق کوڕی مەلەکشاەی سەلجوقی » لە نصیبین بوو ، کەبیستی » توتوشی « مامی ڕووئەکاتە ئاذەربایجان ، گورج نصیبینی بەجێ هێشتو لە موصلەوە لەروباری دجلەپەڕیەوە بەرەو هەولیر ( اربل ) ولەوێوەدرووی کردە شارەکەی « سورخاب » کوڕی بدر ... ( الکامل ١٠/٢٣٤ )

سالی ٤٩٢ك = ١٠٩٨ز کە بەهێزیی وزالێتی سلطان محمد کوڕی ملکشاه سەلجوقی بۆ خەلك دەرکەوت « سعد اللە گوهرئایین » ـ کەلە « سلطان برکیارق » زۆر دەترسا کۆوبوونەوەیێکی سازدا لەگەڵ ئەم‌سەردارو فەرماندەیانە دا .

« کربوقا خێوی موصل ، جگەرمش خێوی جەزیرە ، سورخاب کوڕی بەدر خێوی کەنگەوەر وهەندێ سەرداری تری ولەپاشا بەگەڵ دەستی چوون بۆ دیدەنی سلطان محمد لەقومو گەیشتنە لای . پاش گەرانەوەی ئەم سەردارانە بەرێبەری گەوهەرئایین ؛ خەلیفە دوستووری‌دا ناوی سلطان محمد بخرێتە خوطبەی هەینی‌یەوە .. ( الکامل ١٠/٢٨٩ )

سالی ٤٩٣ك نێوانی سلطان محمد وسلطان برکیارقی برای تێکچو .. بەرکیارق لە بەغداوە ڕوی‌کردەشارەزوور وهێزێکی لەتورکمانە غوزەکان پێك‌هێناو کەوتەڕێ بۆشەڕ لەگەڵ سلطان محمدی برای ، سپاکانیان لە « سپیدرودی » هەرێمی هەمەدان تەقین‌بەیەکاو بەرکیارق شکستی خوارد کەئەم ئەمیرانەی لەگەڵ‌بوو : ابو المحاسنی وەزیر ، گەوهەر ئایین ، عز الدولە صدقە کوڕی مزید ، سورخاب کوڕی بدر .. وهی تری .. لەوێ‌بیستی کە هەردوبراکەی ( محمدو سەنجەر ) نیازی گەلەکۆمەیان هەیە ، لەترسا گەڕایەوە بەرەوعراق ، ولەحەلەوان‌دا سپا بەزی‌کردو خەریکی هێزکۆ کردنەبوو ( الکامل ١٠/٢٩٤ - ٣٠٦ ) مەلەکشاە کوڕی‌تری زۆربوو بەناوبانك تریان سلطان محمود بو کە دایکی تەرکان خاتونی « شاژنەجوان »ی « ملکە الجمال »ی جهان بو

سالی ٤٩٥ك ( ١١٠١زا ) قەلای « خفتیذگان » کەلەدەست سورخاب دەرکرابوو ؛ دیسانەوە کەوتەوە ژێر ڕکێفی . هۆی لەدەست چوونی بەمجۆرە بووبوو : « قەرابولی کەیەکێ

بوونەتیردی سەلغوری تورکمان هاتبووە ناو ولاتەکەی
سورخاب » دوە ؛ بۆمێگەل ورموە لەوەڕاندن ، لەلایەن هێزی
سورخابەوە بەرهەلستی کرابوون ، ومەیدان نەدرابوون کەبێنە
ولاتەکەوە وکەوتبوونە شەڕەوەو هەندێ لەدارو دەستەی
قەڕابولی کوژرابوو ، لەسەرئەوە هاواری بردبووە بەر
تورکمانەکان وهێزێکی زۆری سپایی هێنایە سەر سورخاب
وکەوتبوونە شەرەوە ، تاخمی قەڕابولی نزیکەی دووهەزار
کەسێکیان لەکوردەکانی سەربە سورخاب کوشتبوو وخود
سورخاب بەبیستکەسێکەوە هەلاتبوو بۆچیا کانی ژێردەستی ..
هەرکە دووپارێزەرەکەی قەلای « خفتینکان » ئەم هەوالەیان
بیست خەوتنە سەرقەلاکەدا وهەرچی تیاهەبوو لەئازوقەو سامانو
گەنجینە هەمویان داگییرکرد کەبایی دوهەزارهەزار
( واتەدوملیون )ی تیابوو ، لەوحەلە دا سولطان بەرکیارق بە
هەرێمەکەدا تێئەپەڕێ دووصەت هەزار دینارێکی بۆ ئەنێرن
کەدەخلیان نەکات - جاسپای تورکمان جگەلە دێکوك (دقوقاء)
« وشارەزور » هەمویان داگییرکردبو ، لەمحەلەدا دوپارێزەرەکە
لە سەر سامان ومالّ لێیان بووبوو بەشەڕ ، یەکێکیان ئەوی تری
کوشتبوو، جاداوای ئەمانی لەسورخاب کردبوو کە بچێت قەلاکەی
بخاتەوەژێر دەستی ، تابەمجۆرە « سورخاب » ئەمانی بۆی نارد
بوو قەلاکەی دابوەدەستەوە ( الکامل ١٠/٣٤٦ - ٣٤٧ )

سالی ٤٩٨ك = ١١٠٤زا تورکمانەکان ڕێگەی خوراسان
( بەغدا - بەعقوبە - خانەقین ) یان پڕکردبوو لەئاژاوەو خراپەو

دزی‌ و درۆزنی لەم کاتەدا « ایلغازی کـوڕی نورتوق » والیی عیراق بوو « بلەك کوڕی بەهرام کـوڕی ئورتوقی برازایـی » کرد بە پارێزەری هەرێمەکە بۆنەهێشتنی خراپەوئاژاوە ، بلـەك زور جوامیرانـە ئەرکی سـەرشانی خۆیی ئەنجامدا ، پاشـان ڕوی‌کـردە قـەڵای « خانیجار » کـەلەوڵاتـەکانی ژێردەسـی « سورخاب کوری بدر » بوو ، گـەمارۆی‌دا وداگییری کـرد ( الکامل ۱۰/۳۵۹ )

سالی ۵۰۰ك = ۱۱۰٦ز‌ا مانگی شوال « سەردار ابو فوارس سورخاب بدر » کـەبەنازناوی « ابن ابـو الشـوك » ( دوەم ) بەناوبانك‌بوو کۆچی دوایی‌کرد ساماتێکی زۆروگەنجینە وڕەوە چارەڕای بێ‌شماری لێ بەجێما ، پاش‌مەرگی‌ئەو « ابو منصـوری کوڕی بدری برای » جێی گرتـەوە وبووبەسـەرداری وڵات وەك‌باسی دێ ( الکامل ۱۰/٤۳۸ ) مێژوونووسان باوەڕیان وایە کەئەم بنەمالەیە ( بنی عیار = عناز ) صەت وسی سال (۱۳۰)ی ڕەبەق بەناوی فەرمانڕەوایی « عەیاری » خێوی دەسەڵات بوون لە بە شێکی کوردستانا کەهەر لەکەنگەوەرە تادەسکەرە ولەدزی ،اهگینی لای خۆرهـەڵاتی باکووریی مـەندەلیـەوە تـا داقوق وخانیجار یان لەژێر دەستابووە پـارچە پارچە ، بـەڵام لـەبەر بەدبەختی وکلولی نەتەوەی‌کـورد ، ئـەم ئـەمیرانە لـەنێوانی خۆیانا ، ولەگەل بنەمالەی حەسەنوەیهیشا ، کەئەمانیان هێنابووە پێشەوە هەمیشـە لەشەڕوشـوڕا بوون ، وتێوانیان ناخـۆش‌و ناکۆك‌بووە ، ئەمانە ئەگەر پشتیان بدایە یەکەوەو خۆیان نەبوایەن

به ده‌سکه‌لای ده‌ستی بیگانـه‌ی داگییرکار هه‌رگیزاو هـه‌رگیز نه‌بوه‌یی - نه‌غوزو سه‌لجوقی - نه‌تاتار - نه‌خوارزمی - نـه مغول نـه‌ایلخانی - نـه‌یانه‌توانی بـه‌م ناوانـه‌دا پاپۆڕیکـه‌ن ، هه‌رخۆیان خێوی ده‌سه‌ڵاتو فه‌رمان ئه‌بوون .. به‌ڵام ئاخ !!

له‌باسی فه‌رمانڕه‌وایانی لوڕی بچو کدا ناوی « سورخاب کوڕی عیار » هاتووه ، بێ گومان ئه‌م سورخابه کوڕی مهلهـل نیه‌که‌لـه ٥٠٠ك دامردووه ، ئه‌م له ٥٠٠ك بـه‌دواوه ناوبانگـی به‌رزه‌وه ئه‌بێت ، ئه‌شێ‌له نه‌وه‌کانی ئه‌وان بێت‌و لـه‌سه‌رده‌می « حسام الدین شوهلی »دا خۆی دابێته پاڵ ئه‌و له‌گه‌ڵ « شجاع الدین خورشید »دا هه‌رای بووبێت ( تأریخی گوزیده لاپـه‌ڕه ٥٥١ شه‌ره‌فنامه ته‌رجمه‌ی عـه‌ره‌بی من ٥٧ جوغرافیای تاریخی لوڕستان ٢٤٣ - ٢٤٦ )

سـاڵی ٥١٢ك = ١١١٨زا « مجاهـد الدین بهـروز » - که له‌وه‌به‌ر له شارولکـه‌ی دویـن له‌لـه‌ی کوڕه‌کـانی شـادی ( نجم الدین ایـوب وشێرکۆ )بوو ، پاشـان خـۆی دایـه‌پاڵ سـه‌لجوقی یه‌کان سه‌رئه‌نجام « سلطان محمد کـوڕی ملکشاى سلجوقی » کردی‌یه والی بـه‌غدا ، وئه‌وه‌بوو سـه‌لجوقی‌یه‌کانی ئاذربایجان ولاته‌که‌ی « شادی »یان داگییرکرد ، « شـادی » هاته‌به‌غدا « ومجاهد الدین » ناردی‌یه تکریت پاش‌مردنی ئه‌و، « نجم‌الدین وشیرکۆی کوڕی‌له تکریت ، یه‌کم بوبه‌سـه‌ردار ودووه‌م به‌ئـه‌فسـه‌ری دژه‌وان (قه‌ڵاوان) ، وپاش چه‌ند سالـی

کەلەویێ بوون ، سەرۆکی پاسەوانانی شار کابرایێکی « گـاور »
بوو ؛ رۆژێك خانمێك سـکالاّ دێنێتە لای شێرکۆ لەدەس کابرای
گاور کەپەلاماری داوە ، شێرکۆ ئەم ڕسوایییەی پێ قوت نادرێ ،
ئەچێ سەرزەنشی کابرادەکا دەیێ بە هەرایان ، شێرکو بەشییـر
ئەملی ئەدا ، کەس وکاری سەرداری پاسەوانان کەخۆی هـەر
خەلکی تگریت ئـەبێ ئـەچن بۆلای « مجاهد الدین بهروز »
بۆسکالاّ لەدەس شیرکۆ ، ئەوان خۆشیان هەردۆستی «بهروز »
ئەبن ؛ لەسەر ئەوکارە بهرۆز ئەلێت « تگریت » بەجێ بهێلن ؛
ئەوشەوەی کەبنەوبارگە ئەپێچنەوە « یوسف کوڕی نجم الدین
ایوب » لەدایك ئەبێت « نجم الدین » کەموژدەی بوونی منالی
ئەدەنێ زۆر بەساردی هەواڵەکـە وەرئەگرێت ، ڕازنووسێکی
مەسیحی لەلای ئەبێت پێی ئەلێت : ڕاستە کەتۆ ئەمڕۆ لەحالێکی
شـەپرزەدای ، بـەلاّم ئەم منداڵـە گوناهی چیـە ؟ کـەئـەمـڕۆ
لەدایك بووە! کێ دەلێت نابێ بەپیاوێك کەتۆ شانازی پێوەبکەی!!
«نجم الدین» ئەگەشێتـەوەو هەر ئـەو شـەوە لـە زێ ئەچنـە
ئەوبەر بەرەو موصل لەوێ « سلطان عماد الدین زنگی » ڕێزیان
لێ ئەنێ وکاروباریان پێ ئەسپێرێ ... تاد .

ئـــەم« بهــرۆزە » زۆر بـــەدەســـــەلاّت بـــوو ،
کـە « سلطـان محمـــد مـرد » « ئـــاق سنقـــر برسقـــی »
لەلایەن سلطان محمودەوە ـ ئە چێت بۆبارەگـای « سلطان » ،
بـەلاّم مجاهد الدین ڕێی نادا ، « ئاق سـنقر » ئـەگـەڕێتـەوە
بۆ هەمەدان بۆبارەگای « سـولطان محمود » ، کـەگەیشتـــە

« حەلموان » فەرمانی « سلطان محمود »ی بۆهات کـــه « مجاهد الدين » لەوالێتی بەغدا دەرکراو ئەو بووبەجێ گری ( القديم والحديث للمرحوم محمد كرد علي ، شرفنامه ترجمەی عربي ٥٧ )

ســالی ٥٢٩ك = ١١٣٤زا کـەسـلطان طوغرول بــەگی سەلجوقی ( دوەم ) مـرد ؛ مسترشـد بالله خەلیفـەی عباسـی ؛ کەلەوەبەر یاریدەی «مسعود»ی ئەدا دژی « طوغرول » کاتـێ تەماشای کرد هــەندێ لــەسەرداران وفـەرماندەیان لـەمسعود ئەتەکێنەوە بڕیاری‌دا نەهێلێ ناوی لە خطبەدا بخوێنرێتەوە،هەروا کەزانی « مســعود » دەســتی گرتووە بـەسەرچیادا بڕیاری‌دا هەلکوتێتە سەری •

پـــاش دەورانـی معتصـــم ئەمـەیـەکـەم خەلیفەبـــو ئەیەویست خۆی زێت‌بکاتەوە وبلێ من خاوەن دەسەلاتـم ، جـا دوروپشتی هانیان‌دا وله بەغداوە کەوتەڕێ وپێشەنگی سپای‌نارد کە ئەوناوەیان تا حەلموان تالان کردو کەوتنە خراپەکردن ودڕندەیی وزۆرو زەنگ ؛ خۆیشی مانگی شەعبانی هەمان سال گەیشتە « حەلموان » وئاحەزانی « سلطان مسعود » لەم لاولەولاوە لێی کۆبوونەوە ، کەهەوالی ئەم لەشکرکێشی یەگەیشتە « مسعود » ڕۆژی ١٠ مانگی ڕۆژو لــە « دایمرج = دی‌میرگ » شــالاوی کردە سەرهێزەکەی وپەرت وبلاوی کردەوەو، خەلیفـە خۆشی بەدیل گیررا ، «سولطان مسعود» ڕێزی لێ‌نا و خەیمەو خەرگای بۆ دامەزراند وبڕیاری‌دا ئاوبەئاگرەگەدا بکاو لەگـەل خەلیفـە

بەئاشتی ڕێك بكەوێ ، بەومەرجەی خەلیفە جارێكی تری بیر لە كۆكردنەوەی سپاوهێز نەكاتەوە ، ولە سەركورسی خەلافەتی خۆیدانیشی وباج وپیتاكی ساڵانەش بدات ، لەمدەرفەتەدا خۆبەختكارانی دەروونی (باطنی) سەربە «حەسەن صباح» خۆیان كرد بە خێوەتەكەی خەلیفەدا خۆی وچەند كەسێكیان لەنزیكانی بەسیاسەت كوشت ( الكامل ١١/٢٤ - ٥٢٧ گوزیدە ٤٦٠ )

ساڵی ٥٤٣ك = ١١٤٨ز « سلطان مسعود » لەگەڵ هەندێ لەفەرماندەكان - كەخێوی سەربەخۆیی بوون - تێكچو . فەرماندەكان لێی‌تەكینەوەو تووڕەبوون وڕوویان‌كردە بەغدا . كەگەیشتنە حەلوان خەڵكی شاری بەغداو دەوروبەری لەترسا كەوتنە لەرز ، گرانی دەستی پێ‌كرد ، نرخی هەموشت بووبەدە ئەوەندە ، خەلیفەی عباسی « المقتفی بالله » لەترسا كەوتە بیری دووبارەكردنەوەی شورەی بەغداو قایم كردنی ( الكامل ١١/ ١٣٢ )

ساڵی ٥٤٤ك = ١١٤٩ز بوومە لەرزەیێكی سەخت لە هەرێمی حەلەوان ڕوویدا بەرادەیێ سەختبووە گوێا چیایێ خزاودو لەگەڵ زەوی‌یەكەدا یەكسان بووە ( الكامل ١١/١٤٦ ، المنتظم ١٠/١٣٨ )

ساڵی ٥٥١ك = ١١٥٦ز « سلیمان شای كوڕی سلطان محمد » ئەسپردەی نارد بۆ لای خەلیفەی عباسی «المقتفی بالله» كەئەیەوێ بەرەوبەغدا بێتو لەسەرەتادا ماڵو منداڵی نارد كە

دروشمی ئاشتیو دۆستیو دڵپاکی بن، خەلیفەڕێیدا هاتوسوێنی دڵپاکی وملکەچی خوارد ، خەلیفە نازناوی « الملك المستجير »ی پێبەخشی ودوستوری‌دا ناوی‌لەخوطبەدا بخوێندرێتەوە ، بەلام ئەولەخوێا شایەستەیی نەدی پـەناى‌بردە لای‌ایلدکز وسـپایان کۆکردەو بۆسـەر « سلطان محمد »ی برازای کە « هەمەدان »ی داگیر کردبوو خۆی ناونابو سلطان ، وداوای لەخەلیفە کردبوو ناوی بخاتە خوطبەوە نەیکردبوو ، جا سلیمان لەشەڕا شکستی خواردو هەلات بەرەوموصل ولەوێ مایەوە تاسالی ٥٥٥ك پاش مردنی سلطان محمود هێنرایەوە کرابـە سلطان ، بـەلام تەنیا هەشت‌مانك بەسلطانی مایەوە لەپادشایی دەرکراو خرایەزندان ( تاریخی گوزیدە ٤٦١ والكامل ٢٠٦/١١ ) . لێرەدا ئـــەبێ ئەوەڕوون‌بکەمەوە ، ئەوانەی کەمێژو بۆ کورد ئەنووســـن هەمویان ـ هەتا « منذر موصلي »ش کەلەم دواییەدا دووکتێبی دەربارەی کورد بلاوکراوەتە ـ زۆر سادەیانەو ناشارمزایانـــە . وایان داوەتە بەر داس گویا ئەمو« سـەنجـەری » مامی ولاتـی کوردستان وئێرانیان بەش‌کردووە بەچەندین ئوستان ( پارێزگا ) کـەئەمە نـە بنەچەوبناغەی هـەیـە ، نـەڕاستـە ، ئنجا ناوی ئەم‌سلیمانە ، « وسلیمان پاشای کوڕی پەرچەم » فـەرماندەی « خەلیفە المعتصم » کە تورکمان بوولەلایەن هولاکووە کوژراو «سلیمان پاشای کوردی» هەیوانی یان تێکەلکردووە بەیەکا ، هۆی هەلەکەش وەکوبۆم دەرئەکەوێ تەنها خراب تەرجەمەکرانی قسەکانی « نزهـە القلوب‌ی مستوفی قـەزوینی » یە کەئەمـــە

دەقەکەیتی : ( بـاب دهم درذ کربقـاع کردسـتـان وآن شـازده ولایتـــتو هوایش معتدل وحدودش بولایـات عـراق عـرب وخوزستانو عراق عجم وآذربایجان ودیار بکر پیوستەاست ، حقوق دیوانیش درزمان سلیمان شاه ابوه ؟ ( ایاه ـ الوه نسخ ) قرب دویست تومان این زمان بودەاست واکنون بیستتومان ویکهزارو پانصد دینار برووی دفتراست لاپەره ۱۲۷ )

جارێ بابزانرێ کەئەم سلیمانشایە کوردە کەپایتەختەکەی « وهار »ی لای هەمەدان بووە وتائیستا شارۆلکـەی ( چار ) هەرماوە ، لەتێلی هەیوانی = ایوانی یەکە بەشێبوون لـــە کەلورەکان وچونکە سەردەمێ « سلیمان پەرجەمی تورکمانـی ایواقی » وباوکی ، لەوناوانـەدا بوون لەویـوە ناوەکـەی لـــە لایەن مێژونووسەکانەوە بـەهەڵە بـەسەریانا ردتبووە ، مالی ئاوابی « معین الدینی نەطەنزی » نووسەری منتخب التواریخ شوانکارە ئەم هەڵەیانـەی ڕوونکردۆتەوە،ئنجـا بـاێنەسـەر تەرجەمەی قسەکانی مستوفی : « بابی دەیـەم باسـی جێگەکانی کوردستانە کەبرێتییەلە شانزەولایەت : هەواخوش ، سنورەکانی ئەگاتە ولایەتەکانی عراق عەرەب ـ خوزستان ـ عراق عەجەم ـ ئازربایجان ـ ودیاربەکـر ، مزی دیـوانی ( واتـا دەسکـەوتی ساڵانەی باجوپیتاکی دەوڵەت ) لەسەردەمی سلیمان شاه ابوه ( لە هەندی نوسخەدا ایا ، الوه ؟ ) نزیکەی دووصەت تومانی ئەم سەردەمانەبووە ، ئائیستە بیست تومانو یەکهەزارو پێنصەت دینارە کەدێتە دەفتەرەوە .. لاپەرە ۱۲۷ )

چا ناشارەزایی هەندێ زمان وهەندێ زاراوەی مێژویی ، ئەبێتە هۆی تێکدانی مێژوی ولاتێك ، تکایە لەوانەی کەلەسەرچاوە مێژوییەکوردی‌یەکان شت وەرئەگرن بچنەوەسەر سەرچاوەکانیان •••

هەر لەم سالەدا ( ٥٥١ك = ١١٥٦زا ) مانگی دی الحجه « سلطان محمد » لەهەمەدانەوە کەوتەرێ بەرەوبەغدا لەسەرئەوەی کەخەلیفە « المقتفي باللـه » رێی نەدابو ناوی بخرێتە خوطبەوە لەبەغدادا ولەهەمو ولاتی عراقدا ••• بەلاَم لەولاوە « مەلەکشای برای وهەندێ لەئەمیران هەلیان کوتایە هەمەدان ، کەگەیشتە حەلەوان پەیکهات وهەوالی بۆهێنا کە « ایناخی » جێگری توانی هەمەدان وەربگرێتەوەو لەوێ ناوی لەخوطبەدا بخوێنرێتەوە ، بەمجۆرە ورەی قایم‌بو ( الکامل ١١/٢١٣ )

سالی ٥٥٥ك = ١١٦٠زا « عبدالملك کوری محمد عطاء » ئاژاوەیێکی خستەوە وکەوتە ئازاردان وتالان وخرابکاری و، رێگری ، رێی حەلەوانی بەستورێی حاجیانی ( مەبەست رێی خوراسانە ) بەتەنگ هێنا جالەبەغداوە لەشکرێك نێرایەسەر دژوقەلاکانی ئەو ، هەمو یان گەمارۆدا ومال سامانی خەلکی هەرێمەکەیان رامالی ، بەمجۆرە ناچاریان‌کرد سەردانەوێنی وملکەچ بکات وبەلێن‌بدات کەجارێکی تری‌رێی حاجی‌یان نەبەستی ( الکامل ١١/٣٢٩ )

سالی ٦١٤ك = ١٢١٧زا « خوارزم‌شاه علاءالـدین محمـد کوڕی تکش » لەخوراسانـەوە ڕوی‌کردە هـەرێمی چیا وئـەم شارانەی هەمو داگیرکرد ( ئەصفەهان ـ قوم ـ کاشان ـ رەی ـ ساوە ـ قەزوین ـ زەنجان ( زەنگان ) ـ ئەبهەر ـ هەمـەدان )و لەگەڵ سەردارانی « ئوزبەگ ـ ئەران ـ ئازەربـایجان » نامـەو ئەسپردەی گوری‌یەوە ، ئنجا بڕیاری‌دا شـاڵاوبکاتـە بـەغدا . لـەسەرەتادا یـەکێك لـەفـەرماندەکانی وەگوپێشـەنگ نـارد بەرەوخـوار ، هەرێمـی « حەلـەوانی » بەقەبـالەدایێ ، کەئـەم فەرماندەیە گەیشتە حەلەوان فـەرماندەیێکی تری بەدوایانارد . بۆ پشتیوانی ، ئنجا خۆی کەوتەڕێ ، کەلە هەمەدان بەرەوخوار دوسێ قوناغ ڕێی‌بڕی ، بەفرێکی سەخت دایکرد ، بووە هۆی تیاچوونی خەلکێکی زۆر لەسپاکەو طوپێنی ولاّغ وچارەواکانی سپا ، لـەولاشـەوە عێڵ‌وخێلی تـورکمانی « بنی بـەرچـم » کەلەوناوەدابوون ، هەروا عێلاّتی «هەکـاری»، هەمـو دایـان بەسەریانا و، لەمەرگ رزگاربووی سپاکەیان بەدیل‌گرت وبنەو بارگەو گرانباریان هەمو بەتالاّن برد، بەجورێ کەبەشێکی زۆرکەم لەسپاکەی گەڕایەوە بەرەو خوارەزم ، پادشای خوارەزم ئـەم شـالاّوەی شـووم هاتـەبـەرچاو بـڕیاری دابگـەڕێتـەوە بەرەوخوراسان ، نـەوەك سپای تاتار لـەولاوە ولاّتـەکـەی داگیربکەن ( الکامل ١١/٣١٦ ـ ٣١٧ ) ، میرخواند نووسیویە: کە سلطان خوارزم‌شاه گەیشتە تەنگەی « حەلەوان » ( عقبـة حلوان ) کـات پاومانی پایزبـوە ، بەفرێکـی سەخـت دایکـرد

ئەوەندە بەفرباری خێوەتو خەرگای سپای خوارەزم لەژێر بەفرا نوقومبوون هەروەك بلێی هەستیاری مەزن « كەمال اسماعیل » ئەمدیمەنەی دیوە كەوتوویە :

« مانند پنبه دانه كەدرپنبە تعبیەاست احرام كوهها است نهان درمیان برف »

( واتا : هەربەوجۆرە كە لۆكە لەقۆزاغەدا دەوروبەری پەمودانەكە ئەپۆشێ هەربەوجۆرە بەرزەهاری ( احرام ) كێوەكان ـ یاقەبارەو بارستی كێوەكان ( اجرام ) لەتێو بەفراشاردرا بوونەوە ) .

جا خوارەزمشاە كەبەشكستی گەڕایەوە ، قاو بەولاتە موسولمانەكانا بلاوبووەوە كەهیممەتو كەرامەتی خەلیفە سپای خوارەزمشای بەودەردەبرد ، لەولاشەوە بلاو كرایەوەكە « خەلیفە الناصر لدین اللە » مرد ، ئیتر كەس لەخوطبەدا ناوی نەباتو لەباتی ئەوناوی « سید علاء الدینی تورموزی » بخوێندرێتەوە « روضة الصفاء ٤/٤٠٠ » بەڕاستی سەیرە كەس بەخیالی دا نەهاتووە بلێ : خوا تولەی ئەوشارو گوندانەی لە خوارەزم وسپاكەی‌كردۆتەوە كەبەهەزاران كەسیان تیاكوژرلو تالانكرا بەلام گەمژەو كاسەلێسو شاعرە دووڕووە ساختەچییەكان ، هەروەك دەرویشو صوفیە درۆزنەكانی كوردستان ، ئەم بەفربارینەیان كردە كەرامەتی خەلیفە ، هەروەك خوای‌مەزن وبەشكۆو ( پەنابەخۆی = نعوذ باللە ) گەردشی چەرخو ئاسمانەكان وخۆر ومانگو ئەستێرەو هەورو بەفروباران

وهەورەتریشقەی هەمو خستبێتە ژێر ڕکێفی گێلو گەمژەی درۆژنی ساختەچی خوانەناسەوە ..

بالێرمدا ئەوەشمان لەبیر نەچێ گەرچی شارەکانی سەرەری ودێهاتەکانی نزیك شەقامەکان لەژێرپای دوژمنا پامال ئەبوون . بەلام چیا نشینەکانی کورد سەربەستوسەرفراز ئەژیان نەبایان ئەدی نەباران !!!؟

سالی ٦٥٥ك = ١٢٥٧زا مانگی شوال هولاکو کەولاتی ئیرانی پامالی بوو لەدەوروبەری هەمەدانەود کەوتەڕێ بەرەو بەغدا ، سپاکەی تەیارکرد وهەندێکی بەفەرماندەوە بە لایڕاستا بەرەو هەولێر بەڕێکە چیاییەکانی شارەزور ـ داقوقدا خستەڕێو، هەندێ تری بەفەرماندەوە بەلایچەپا بەرێی «گریت ـ بەیات»دا خستەڕێ وخوشی لەناوجەرگەی لەشگرەکەدا بەرێی « کرماشان ـ حەلوان »دا بەرەو بەغدا جما ، خەلیفەی عباسی « المستعصم باللە» دوانداری بچوکی بەسپاوە نارد بۆ بەرانگاریی ، لەنیوان « بعقوبە ـ باجسری »دا سپابەزیکرد ، هولاکو دوستوریدایە « بایجو » بڕوات لەدجلە بپەڕێتەوەلای خۆرئاواوە شالاوبکاتە ناوبەغدا ، خۆیشی گەیشتە حەلوان لەوێ بنەو بارگەی بەجێ هێشتو بەسوارەی تایبەتی خۆیەوە سەلتە کەوتەڕێ ، هێزی پێشەنگ کەلەبەراچووبوو « ئای بەگ حەلەبی » دەسگیرکردو هێنایانە بەردەم «هولاکو» ، «ئایبەك» داوای ئەمانی سەرومالی کرد ، هولاکو وتی : بەومەرجە کەدرۆنەکات وهەموڕازێ بدرکێنێ ... گەلالەی قسە هولاکو چووەناو بەغداوە ،

سێ کوچکەی دمولەتەکەی خەلیفە ـ واتا دواتدار ، سلیمانشای ئیوائی تورکمان ، ابن العلقمي ـ لەگەڵخەلیفە هەموکوژران ، سەری براوی دواتدارو سلیمانشاه ئێررا بۆ موصل بۆ « لوءلوء » فەرمانڕەوای موصل کەلەوێ هەلیان واسی ، « لوءلوء » کەخەزوری هەردوکیانبوو ، ناچار سەرەکانی هەلواسی ( ذیل نصیرالدین طوسي جهانگوشای جوینی ۳/۳۸۰ ـ ۳۹۲ )

ئێمە ئەم باسەدوورو درێژەمان لەچەند دێڕێکا گەلالەگرد . چونکە ئێمە ئێشمان پێی نیە ، تەنیا کارمان بەوە هەبوکە « هولاکو » بە « حەلوان »دا ڕەتبووە ولەوێ گرانباری بەجێ هێشتووە ، هەروا ئیشمان بە ناوی « سلیمان » هەیە کە لەپێشا تێچەتێکمان دەربارەی ڕوون کردموە،جا «سلیمان» کوڕی پەرچەم ئیواقی کە لەپاشا بووە « سلیمانشاه » ئەم سەردارەتورکمانە لە سەردەمی سەلجوقیدا بە خێڵوعێلە تورکمانە غوزە کانەوە ، کەابراهیم اینال لەوناوانە جێگیری کردبوون لە (هەمەدان ـ نەهاوەند ـ لورستان) بوون ، پاشان لەسەرجەردەیی وراوڕووت زۆرجار تووشی پەتپەتی هاتوون بۆنموونە :

۱ ـ لەسەردەمی خەلیفەی عباسی المستنجد باللەدا سالی ۵۵۳ك = ۱۱۵۸ز ا تورکمانەکانی پەرچەمی ئیوائی لەهەرێمی « چیا »دا دەستیاندایە خرابکاریو جەردەیی ، لەبەغداوە بەفەرماندەیی «منکبرس» سپایێك ئێرایەسەریان لەسەرئەنجامی

هەڵکوتانە سەریان زۆریان لێ کوژراو بەدیل گیراو هەڵاتن،
کەللە سەری کوژراوان لەگەڵ دیلەکانا ڕەوانەی بەغدا کرا
( الکامل ١١/٢٣٩ )•

٢ ـ سالی ٥٦٤ك = ١١٦٨زا هەر لەسەردەمی خەلافەتی
« المستنجد بالله »دا دووبارە « پەرچەم » بەکۆمەڵێ تورکمانی
ئیوائی یەوە یاخیبوو ، ناوچەکانی ( هەمەدان ودینەومریان )
هەموتالانکرد وکەوتە خرابکاریو کاری بێناموسانە •••
« اتابك ایلدكز » لەم سەردەمەدا لە « نەخچەوان »بو ، کەهەوالی
دراێ زۆربەپەلە گەڕایەومو شالاوی کردە سەریان پەرچەم
هەلاتو •

« ایلدكز » تا خانەقین ڕاوی نان ئەوان گەیشتە نزیك بەغدا ••
( الکامل ١١/١٧١ )

٣ ـ سالانی ٦٠٨ ـ ٦١٠ خەلیفەی عباسی « الناصر
لدین الله » کابرایێکی دانا بەفەرماندەی « چیا » ناوی « آی
دوغمش » بوو لە هەمەدان دائەیشت کەناوچەی فەرمانی بوو ،
سالی ٦١٠ ك = ١٢١٣زا کە خەلیفە فەرمانی دابە لادانی «سلیمان
کوڕی تەرجم ؟! » ( پەرچەم ) لەسەرداریی عێلی ئیوائی تورکمان،
ودانانی برا بچوکەکەی بەسەرداری عێل لە جێی ئەو ، ئەم
سلیمانە هەوالی نارد بۆ « منگلی » وزانیاری دەربارەی
«آی دوغمش» بۆنارد وزۆری نەبرد «ای دوغمش» کوژراو
کەللەسەرەکەی نێرابۆ « منگلی » کوژرانی « آی دوغش »

کارێکی سەختیکردە دڵی « خەلیفە »و زۆر دلگرانبوو بۆی جا هەڕەشەی نارد بۆ « منگلی » ، بەڵام ئەو بەهێزبوو باکی لەهەڕەشەو گوڕەشەی خەلیفە نەبوو .. ( الکامل ١٢/٣١٧ )

٤ ـ سالی ٦١٠ك = ١٢١٣زا بەدواوە تا پەنجا ئەم سلیمان پەرچەمە بزرە ، لە مێژوودا ناوینیەو نازانری چۆن گەیوەتەبەغدا ؟ وچۆن چووەتە ڕیزی فەرماندەیانی سپای بەغداوە ؟ ولەخەلیفەی عباسی نزیكبوتەوە !!! بۆیەکەم جار « محمد عبدالوهاب قزوینی » لەوپەراوێزانەدا کەلەسەر کتێبی جهان گوشای جوەینی (ژ/٤٥٠-٤٣٦٢) نووسیویە لەم باسە کەوتۆتە گومانەوە.بەڵام « معینی نەطەنزی» نووسەری کتێبی «منتخب التواریخ» شوانکارە لەم گیروگرفتە ڕزگارمانئەکات وەکو لەدواییدا باسی ئەکەین .

٥ ـ کەخوارەزمشاە سالی ٦١٤ك = ١٢١٧زا شالاوی کرد بەرەوبەغدا ولەرێ سپای ( خوایی ) تۆفانی بەفروباران سپاکەی توشی فەتارەت هێنا وقرێتی خستو بەپەشیمانی گەڕایەوە لەم کاتەدا دیسانەوە ناوی « تورکمانی پەرچەمی ئیوائی = ئیواقی » دێتەمەیدان ، ئەوەتا ئەمئێلە وعیلاتی هەکاری ئەدەنە سەر پاکوڕەی ڕزگاربووی سپای خوارەزما ، بەکوشتنو تالانو دیلکردن ، دوایانپێدێنن ..

٦ ـ لەسالانی ٦٤٠ك = ١٢٤٢ بەدواوە تا ٦٥٦ك ناوی سەردارێکی کورد : دێتەمەیدان کە « شهاب‌الدین سلیمان شای

هەیوانی = ئەیوانی » ملکی کوردستانە ، کەپایتەختی ولاتەکەی
شارۆلکەی وهار ( بهار )ی لای هەمەدانە ئـەم پیاوە لەگـەل
سەردارانی لورستانی بچوکدا هاوسنورو دۆستە ، ملکەخاتونی
خوشکی خۆیئەدات بە « شـرف الدین ابو بکـری کـوری
نورالدین محمد » ی سەداری لورستان، کەئەمپیاوە ئەچێتـــە
سالـەوە « حسام الدین خلیلی » خزمی کـە خـۆی بـەخاوەن
سەرداریتی لورستان ئەزانێ لە بەغداوە دێتەوە لورستان ، وپاش
مردنی « شرف الدین » سەرداریتی ولاتەکە ئەگرێتە ژێردەست،
عزالدین گرشاسفی برای « شرف الدین » ئەکا بەجێگـرەوەی
( ولی عهد ) خۆی ، پاش ماوایێ لێی ئەکەوێتە گومانو بـــــە
دزیەوە ئەیکوژێ ، ملکە خاتونی خوشکی « سلیمان شـاە »
دوای مردنی براکەی ، بەمندالـەوە هـاوار ئەبات بـۆ سلیمـان
شایبرای ، سـلیمانشاە چـەند جـارێ لـەگـەل حسامالدین
ئەکەوێتەشەرەوە سـەر ئـەنجامئـەیکوژێ ( باسـی کوژرانی
دوورودرێ لە تاریخی گوزیدەو شەرەفنامە وجهان آرایغفاریو
زۆرکتێبی ترانووسراوە ) « بدر الدین مسعودی برای حسـام
الدین خلیل» هەرئەوسالە هاوار ئەبا بۆ بارەگای «منکوقائان»لە
شاری «خەتا»و، هەرلەوێ ئەمێنێتەوە تا هولاکوخان ئەکەوێتە
شالاوو ئێران داگیر ئەکاو هەل ئەکوێتە سەر بەغدا وسالی ٦٥٦
هەم خەلیفەو هەم سێکوچکەی دەولەت ئەکوژرێ کەیەکێکیان
« سلیمانپاشای پـەرچەمی ئیوائی تورکمان » ئـەبێت ، ئنجـا
« بدر الدین مسعود » لەشکری مغول ئەهێنێ وئەدات بەسەر

« سلیمان پاشای ملکی وەهار » داو ئەیکوژێ ومالو سامانـی تالان ئەکاو خوشكو کچەکانی بەسەر تۆکەران ودەس‌وپێوەندی خۆیادا بەش ئەکاو لێیان مارەئەبڕێ .. ( تأریخی گوزیدە ٥٥٥ شرفنامە ٦٠ ـ ٦٢ تەرجمە عەرەبیەکەی‌خۆم ، منتخب التواریـخ معینی ٥٦ ـ ٦٠ ) بەلام ئەوەی کە سلیمان‌شاە بەدەستی « بدر الدین مسعود » کوژراوە تەنها لە « منتخب التواریخ » داهەیە، ئەوەکان بەداخەوە « سلیمان شای کوردیان ، لێ‌بووەتە « سلیمان پەرچەم » .. ئەم باسەم بۆیە لێرەدا ڕوون کردەوە کەبزانرێ «شهاب‌الدین سلێمان شای کورد» کەپایتەختی بەهاربووە لەگەڵ «شهاب الدین سلیمان پەرجەمی فەرماندەی مستعصم» کەلەبەغدا بووە، لەلایەن هولاکۆوەکوژرا یەک‌نین ، بەداخەوە زۆر لەمێژونووسان ئەم هەڵەیەیان وەك خۆی نووسیوە ، منیش لەتەرجومەی شرفنامەدا هەرڕێم بەڕاستی نەبردبو ، ئەوا لێرەدا ددانی پیائەنێم ..

سانی ٧٠٣ك = ١٣٠٣ز‌ا کە « سـلطان محمد خدابندە » لەسەرتەختی پادشایی دانیشت ، نیازی ئەوە بوو کەشالاوبکاتـە شام ومصـر ، بـەلام کـەڕاوێژی لەگـەڵ فـەرماندەیان‌کــرد خستیانەبیری کەهێشتا هەریمی گەیلان ـ مازەندەران بەتەواوی سەرشۆڕنەکراوە ، دەبێ‌ئەوێ بـەتەواوی داگیـربکرێ وبەباج وپیتاکی ئەوێ گـەنجینـەی ولات پڕبکرێ ئنجا بیرلـــــە شتی‌تری‌بکرێتـەوە جادوستوری‌دا کـە ئـەمیرچوپان لـەڕێی « ئەردەبیل »ەوە ڕوبکاتە گەیلان وداگیری بکات ، « ئەمـیر

«قتلق شا »یش لـەرێ « حەلەوانـەوە » ڕووبکاتـە « فومن »
« ورەشت » « وتەولم » ... ( روضة الصفا ٥/٤٤٠ ) ، مـــن
لام‌وایە ئەم‌ناوی « حەلـەوان»ە هەلـەی چاپی‌یـە ومەبەســت
« خلخال »ە نەوەك حەلەوان !!!

سالی ٧٨٩ك = ١٣٨٧زا لەسەردەمی پادشایی « سـلطان
اویس جلائری »دا یەکێ لەفەرمانندەکانی کـەناوی « عبدالملك
تمغاجی » بوو بەغدای داگیبیرکرد ، فەرمانندەیێکی تریش کەناوی
« عادل » بوومرخی لـە بـەغداو هـەمووڵاتی‌عـراقی عـەرەب
خۆش‌کرد ، بۆ،گەیشتنە ئامانج ، « تورسن »ی کوڕی خالۆیی
بەسپاوەنارد بۆسەر بـەغدا ، « عبدالملك » ویستی بـەبەرتیل
« سلطان اویس » ڕازی‌بکات بەوەی وازلە بەغدا بهێنێ وبــــە
لەشکرەوە بـەرگری نەکات ، بۆئەم‌کارە بڕیاری‌دا « خواجـــە
حەمید » بنێری بۆلای « سلطان اویس » بەدیاری وخـەڵاتو
چەند تومانزێڕی سووروزیوی سپێ وچەلکوکاڵاوە ، بەڵام‌هەر
ئەوشەوەی کـەبڕیاربوو خواجـەحەمید لـە « حەلەوان »ەوە
بنێری بۆبەغدا هەواڵی‌بۆهات کە « تورسن » بـەسپاوە جماوە
بەرەوبەغدا لەترسا شڵەژاو ، ناردنی گەنجینەوخەڵاتی دواخست
( حافظابرو ذیل جامع التواریخ رشیدی ٧٠ ) بائـەوەش ڕوون
بکەینەوە کەئەوحەلە «تومان» زاراوەیێ‌بوو ئەیکـرد « لەکـێ =
صەت‌هەزار » ( جا هەرچی بیوایە : ) سەری تاکانـی سەربـاز ،
هەنگاوی زەوی ، پارچەی زێروزیوی سکەلێ‌دراو .. تاد ..

سالی ٧٩٥ك = ١٣٩٣ز( پاش ئەوەی « ئەمیر تەیموری صاحبقران » ( ئەمیر تەیمور لەنگ ) دەستی بەسەر ئیراقاگرت وسلطانیەی کۆنە پایتەختی « غازان »ی داگیرکردو بڕیاریدا شالآوبکات بەرەو بەغدا وگەیشتە هەرێمی کوردستان (ئەردەلان)، ئەسپردەی نارد بۆ لای ئەمیرزادەگان وفەرماندەکان کە : هەمویان بگەنە « چەمچەمال » ئەوان لەسەرفەرمودەی صاحبقران هاتن وگەیشتنە دەوروبەری « سونغور = سنقر » وئەوناوەیان هەموڕامالی ، هەم تالآنیانکرد ، هەم خەلەو دەغلو دانیان دایەدەم چارەواو ئەسپو ئێستری سپاوە ، سەرلەبەیانی کەئەیانەوبست بجمێن بەرەوبەغدا پەیکی صاحبقران گەیی وهەواڵی گەیاند : کەپێویستە لەپێشاکوردەکانی ئەوناوە ملکەچ بکەن وسەرشوڕی فەرمانبەریان بکەن وهەرکە سەرکێشی کردو بیىری لە یاخیتی کردەوە ولآتەکەی وێران وتالآنبکەن ، وسەرزەویی کوردستان بەدێهاتو شارەوە لەیاخیو سەرکێش پاكبکەنەوە .. جا میرزادەو فەرمانده کان گەیشتنە چەمچەماڵ وچیای بوغستان ( بیستوون ) ، لەلایێکیترەوە « سونجك بهادر ، تیمور خواجە، آق بوغا ، نوبهشیر بهادر ... » بەسیاوە بەرێکەیی، ترا بەرەو کوردستانْ ڕەوانەکرابوونْ ، میرزادەکان ڕوویانکردە دەربەندی تاشی خاتوون ( تاج خاتوون ) ( مەبەست دەربەندی دەرتەنگە ( عقبة حلوان ) کەمغولەکان ناویان نابوو ( تاشی خاتوون ) کە گەیشتنە ئەوهەرێمە یەکێ لەسەردارانی ئەوناوە

بەتەمای پایەی میرتیی هەرێمەکە هاتەپیریانەوە وپێیوتن : من لە هەموکەس شارەزاتری ئەم دەوروبەرەم ئەگەر دوستورتان هەبێ ئەبمە ڕێنموتان .. ئەمیرزادە محمد سلطان کابرای لاواندەوە وخەلاتی کرد وکەمەربەندی زێڕو شمشیری کیلانئەلای دایێ وفەرمانیدا بە « شیخ علي بهادر » کەبە هێزێکی پێشەنگەوە لە گەلیبروات .. ئالەم کاتەدا « ابراهیم پاشا » کەیەکێ بوولە لەمیرەمەزنەکانی ئەوهەرێمەی کوردستان رووی فەرمانبەری‌وملکەچی نیشانداو خۆی بە پەیرەوی صاحبقرانی دایەقەلەم ولەبەرا « سلطانشا »ی کوری بەرەوەپێی ئەسپوئێسترو دیاری‌و دەهەنەی شایەستەوە نارد، پاشان خۆیشی هاتو گەیشتە بارەگای ئەمیر ، جا ئەمیرزادە محمد سلطان پەیکی نارد بەشوێن « شیخ علي بهادر »دا کەبگەڕێتەوە ، ئەم پالەوانە جیهانی یەگەڕایەوە ، لەرێ لەجێگەیێ لاتەدەن بۆحەسانەوەو نیومرۆژەکردن ، کابرای ڕێنوما کە هیوا بڕ ئەبێت لەوەی بگا بەوپایەیەی کەبەتەمای‌بوو ، لەناکاو هەلیکوتایە سەر « شیخ علي بهادر » ودایە بەرخەنجەر ولەگیانیکرد ، یارویاوەرانی « شیخ علي بهادر » کەئەمەیاندی ڕاپەڕین‌و کابرایان گرت‌و کوشتیان ولاشەکەیان سووتاندا ( ظفرنامە ٢٣٠ ـ ٢٣١ )

هەر سالی ٧٩٥ك = ١٣٩٣ز ا مانگی ربیع الاول کە ئەمیر تەیمور لەنگ شوشتەری داگیر کرد دیسانەوە «امیرزادە محمد سلطان » و « امیر زادە محمدی » بەرێ ئەم دەربەندی حەلەوانەدا چوون بۆخزمەت صاحبقران ئەوەبوو شارو دەشتو

دێهاتو دۆڵو چیای کوردستان ولورستانیان سەرشوڕ کردبوو یاخیوسەر کێشەکانیان هەموقەڵاچوکردبوو ( ظفرنامه ٣٣٣ )

له ١٣ شوالی هەمان ساڵا ٧٩٥ دیسانەو، امیرزاده محمد سلطان » بەرلەوەی ڕووبکاتە بەغدا جارێکی تری کەوتەوە ئەندیشەی سەرکوتکردنی کوردە ڕێگروجەردەکان ( ظفرنامه ٢٤٥ ) ئائەمەیە کەدەڵێن : بەخوا سەیرە لەکۆیە جەردەو دڕندەی مغولو تاتار کەجیهانیان تاڵانو وێران کرد ئەوان بەکوردی قوربەسەری وڵات داگیرکراوی لەزێدو مەڵبەندی خوی بەرگریکەر ئەڵین = یاخی وریگرو جەردە !!؟

جا محمد سولطان هەڵی کوتایە سەر هەریمە چیاییەکان خەڵکێکی زۆری لێ ملکەچی فەرمانڕەوایی کردو گەلێکیشی نابوت کردن بۆنمونە ٧٠٠کەسی لەو کوردە یاخی یانە لەچیا کانا دەسگیر کردو هەمویانی لەلوتکەیشاخو چیاکانەوە غل کردە خوارەوەو بەم جۆرە هەموی کوشتن ئنجا بەڕێی دەربەندی تاشی خاتونا ( حەلەوان ) ڕویکردە بەغدا بۆ خاکپاماچ کردنی ئەمیر تەیموری ساحیبقران ( ظفرنامه ٢٤٥ - ٢٤٦ )

سالی ٨٣٦ک = ١٤٣٢هاەدە « اسپان ( اصفهان ) کوڕی قەرایوسف هەڵی کوتایە سەرشاه محمدی برای لەبەغدا ؛ شاه محمد لەترسا هەڵات وڕوی کردە حدیثە • حاکمی حەدیثە پیشوازی کرد وبەهێزێکی گەورەوە کەوتەکی (موصل-هەولیر- کرکوك - داقوق )ی یەك لەدوای یەك داگیرکرد ، ئنجا

ڕوی کردە بەغدا لەبەرا لەبەعقوبە سپا بەزی کرد وفەرمانیدا بەتالاّن کردنی هەمووولاّتەکە ، بەم جۆرە گرانی خستەوە ، ئنجا ڕوی کردە هەرێمی دەرتەنگ ( حەلەوان )و گەمارویدا ، بەلاّمبۆی نەگیرا ، لەمکاتەدا هەوالّی پێگەیشت کە ئسپانی برای لەنەخۆشی هەستاوەتەوە وچاكبووە وخەریکە شالاّوی بکاتەسەر، جالەترسا دەرتەنگی بەجێهێشتو،ڕوی کردە جغای وکاوان ( ناودکان هەلّەن مەبەست گەردەنەی « چغان »ە کە سنوری نێوان ایرانو عراقبووەو ماکوانی چیاینزیکی ئاتەشکەدەیە ) بەتەمای ئەوەی ڕووبکاتە شیکان ( شیخان ) شەوی هەینی گەیشتە ئەوێو بەدەوری قەلاّکەدا سوڕا کەداگیری بکات خەلّکی هەرێمەکە هەراو وهۆریا یان لێکرد ، وجنێویان دایێ . وبەدزیشەوە چلسواری پرچەکیان نارد بۆبەرانگاریی ، لەناکاو سوارەکان دایانبەسەریا هیزەکەیان قەلاّچوکرد . ئەگەرئەمئەمیرە تۆزیمێشکیلەجێی خۆیبوایە ولاّتەکەی تالاّن نەدەکرد ، وخەلەو خەرمانی نەئەدایە ژێرسمی چارەواو وهەمویڕانەئەمالّی ، پاسی دەکرد بوژیانی خویوسپاو گەلەکە بەلاّم ئەحمقبوو ( تاریخ غیاثی ٢٥٦ )

**تێبینی :**

سلطانیە : شاریبو ، غازان خانی مغول دوروستیکردبوو لەناوچەمەنی ( ئەبهەر ـ زەنگان )دا کە پاشان بووبووبە خاکی فەرمانڕەوایی سیامنصور ، چەمچەمالیش شارۆلکە وناوچەیێکە

سەر بەفەضای « صەحنە » کەئەکەوێتە سـەرەرێی کرماشان ـ هەمەدان ، ئەمصەحنەیە « سنە » نیە وەك لیسترنك بەهەڵەچووە، سونقوری کولیائیش سەربەکرماشانە ئەکەوێتەیوان صەحنەو اسد ئاباد ـ قوروەیکوردستان ٩٥ کیلومەترە لەکرماشانەوە ..
بیستون ( بغستان ) ناوییەکێ لەزنجیرەچیاکەی سەرشەقامی رێی کرماشـان هەمەدانە بـەناوی تاتـەبـەردە نوسـراوەکـانی « داریوشەوە بەناوبانگە لەسەردەمـی زاڵبوونـی « ئاشـور »ی بەسـەر مرۆڤی هـەرێمی زاگرۆسـا، سـەرلۆتکـەی ئەمچیـای بێستونە جێی ئابودەی خوایانی وڵاتەکەبووە ، ئاشـوورییەکان بەسەریازاڵ بوون ، ئابودەی خواکانیان تالآنکردووە وچوار لەم خوایانەیان بردۆتە هەولیر وبەناوی ئەوچوار خوایەوە ناویبە « ئاربائیل = چوارخوا » رۆیشتوە پاشان سووكبووەو بۆتـە ( اربل ) ...

« حەلەوان وێرانبوو بەلآم ناوی وخەلکەکەی زندومانەوە »

شاری حەلەوان گۆیا : لەسـەدەی حەوتەما وێرانبووە !! ( دائرة المعارف اسلامی ٨/٥٥ ) دەبێ وتارەکەی دائرە المعارف تووشی هەڵەبووبی وەگەرنە حەلەوان تا پاومانی صەدەی هەشتەم وەك یاسمانکرد هەرمابوو ، دوای « ٧٩٥ك » لـە شالآوەکانی بنەماڵەی تـەیموری لـەنگدا بـەتـەواوی وێرانکرا مـستوفی نووسیویە : « حەلەوان ئێستە ـ واتا سالی ٨٤٠ك ـ وێرانەیـە تەنیا ئەوەندی کیلگـەیێکی ماوە ( نزهة القلوب ٤٢ ) پاشـان

بەناوی دەرتەنگ مایەوە ، ئەو دەرتەنگەی کە صەدان لەشکری داگیرکاری کوردستانی قووتدا ، ( شرفنامــەی فارسـی ٤١١ وتەرجمەی عەرەبیە کەی‌من ٣٤٠ ) ئێستە شارۆلکەی زەهاوی سەرپردەکە ( سەرپیل ) جێی ئەوی گرتۆتەوە «ژاك دومورگان» نووسیویە : سەرپولی ( پردی ) زەهاو کەوتۆتە جێی دێرینــەی شاری « خەلمان » ، کەلەزۆر کۆنەوەهەبووەو تا ئێستا بەکناری ڕووبارەکــەوە هەندێ تەپولکــە دیارە کــە لــەکۆنا کۆشــك ـ وسەرابوون ، ئاوی ڕووباری ئەلوەند کەبەئێرەدا بــەرەوخوار ئەبێتەوە ، بەهۆی ئەوەوە پێی ئەوترێ رووباری حەلەوان ..
( جوغرافیای غرب ایران ٢/١٧١ )

لەصەتەکانی نۆیەم ودەیەمی کۆچیدا (١٥ ـ ١٦زا) هەرێمی دەرتەنگ (حەلەوان) لەژێر فەرمانی ئەمیرانی کەلورا، وجارجارە ئەمیرانی ئەردەلاٌنا ، بووە، خۆی سێ سەردارێتی بووە :

١ ـ ســەرداریی پلنگان

٢ ـ ســەرداریی دەرتەنگ

٣ ـ سەرداریی مایدشــت ، ئاخــرین ســەردلای بەهێــزی فەرمانڕەوایانی کەلهور « ذو الفقار خانی کــوڕی نخوتخــان » بوو کەبەغدادی لە صەفەوی داگیرکرد وچەند ساڵ فەرمانڕەوایی تیاگرد وخۆی دایە پاڵ دەوڵەتی عوثمانی ، بەلاٌم برازاکانی خۆی بەخیانەت کوشتیان ، ولاٌتەکەیان خستەوە ژێردەسی «صەفەوی»، سەربەخۆیی‌و فەرمانڕەوایانی کەلوریش بوون بە ژێردەسەی ایرانو

عوثمانی ، سالی ٩٦٠ك = ١٥٥٢ز« ابو بکر بەگی ڕوژبیانی »
کەماوایێ فەرمانڕەوای دەرتەنگ‌بوو هەولی زۆریدا کەنێوانی
« سورخاب بەگی ئەردەلان » و « محمد پاشای بالطەچی » والیی
بەغدا ڕێك‌بخات کەنەهێلێ ولاتەکە تووشی وێرانی بێت (مذکرات
مأمون‌بك ٧٨) لەوسەردەمەدا کە شاە اسماعیلی صەفەوی (دووەم)
کوڕی شاە طەهماسپ لە زندانی قـەلاّی (الـموت) ڕزگاربـوو
لەسەرتەختی شاهی دانیشت (٩٨٤ك=١٥٧٦زا)«ئەمیر شرف خانی
بتلیسی »ی لەهەمەدان داناو کردی بەفەرمانڕەوای هەموکورد ،
ئەوجەلە سەرداریی کەلهور ـ هەریمی دەرتەنگ حەلەوان هـی
« قوباد بەگی کوڕی عومەربەگی کوڕی زۆراب ( سـهراب )
بەگی کەلوڕبوو ، ئەم‌سەردارە سەربە « سولطان سـولەیمانی
قانونـی عوثمانـی » بـوو ، لەهـەرێمـی دینـەوەرەوە
تانزیکی بەغدادی لەژێردەسابوو ، ئەم‌قەلاّ ودژانەی ولاّتەکـەی
لەبەر سەختی زۆر بەئاوبانگ‌بوون : ( پاوە ـ پاسکە ـ ئالانی ـ
قەلاّزنجیر ـ ڕەوانسەر ـ دودان ـ زرمانیکی ) کـەئەمانـە تا
ئێستەش جگە لە « زرمانیکی » جێگـەیان سەخت‌وناسـراوو
ئاوەدانن ( شرفنامە فارسی ٤١١ تەرجومەی عەرەبی من ٣٤٠ )..
ئەم هەرێمانە ، تەنانەت «زەهاو» چونکـە سەرە ڕێـی کاروانـی
سپایی بوون ، جارێ عوثمانی داگیری ئەکرد وجارێ صەفەوی
لەبەرئەوە بەشی تەنیا وێرانی بوو ، شەری نێوان دوودەولەت
بۆهەندێ چەپەلّو دزو جەردە بووبوو بەهۆی ژیان ، هەردوو
دەولەت کەدەبوو بەشـەڕ لەنیوانیـانا لەکەللەسـەری بەغـەدر

کوژراوان « منارەیان » دورووستئەکرد وخوێری وپیاوخراب ئەچوون فـەقیرو هـەژاری فـەللاحو شـوانیان سـەرئـەبڕی سەرەکانیان ئەهێنا بەدەولەتیان ئەفرۆشت ، ئەویش سەری‌کی ؟ سەری کوردی بەدبەخت ، تا ئەم ساڵانەی دوایە کەپیاوەپیرەکان مابوون ، هەرکەس لەبازار ی بەغدادا زۆرتوند ڕێـی بکردایـە وپالی بەخەلکەوە بنایە پێیان ئەوت : « شـەکو عندك جایب راس !؟ » = واتە چ پەلەتە ؟ مەگەر سەرت هیناوە !! قوربانیی ئەولا خەلکی کورد بوون لـەسنورەوە تاهـەمەدان ؛ قوربانی ئەم لاش کورد بوون لەشارەزورەوە تاشارەبـان ، ئـەوحەلـە پڕوپاغەندەی شیعێتیو سونێتی هەبو لەمەیدانا ، هێشتا باوی پڕوپاغەندەی نوکەرێتی ئیمپریالیزم وبیگانە دانە هاتبو ..

**« دێرینەی کۆن لە هەریمی حەلەوان دا : »**

لەهەرێمی حەلەواندا دێرینەی کۆن زۆرە،با گوێ‌بدەینـە پسپوڕیمەزن « ژاكدومورگان » کەلەم‌بارەوە نووسیویـە : « لە هەریمی حەلەواندا بەردە نووسراوێکم بەدی‌کرد زۆربەرزبو بڕیارمدا بە هەر نرخێ بووە بیگەمێ ؛ کە لەبانەبەرزەکەوە پتر لەسی مەتر بەرزبوو ، پەیژەییکی یەکجار درێژم دورووست‌کردو پیاسەر کەوتم وبەهوی زەڕەبینێکەوە کەپێم‌بوو توانیم‌وشـــە وردیلـەکان بخوێنمـەوە ؛ ئنجا کەوتمـە قالب گرتنـی بـەردە هەلکۆلراوەکە ؛ بۆ خزمـەتی مێژوو ، ئەم تاتـەبەردە مـەڕمەڕە یادگاری شاه ئانو بانی یە . ویەکێکە لەبەردە

بەردە نووسەکەی ئانوبانی‌نی لە
سەرپێلی زەهاو لاپەڕە ( ٢٦٢ )

نووسراوه هەرەگرنگو درێژنەکان کەمن لەئاسیادا چاوم پێی کەوتبێ ، تاتە بەردەکە بەسێ هێلی ئاسۆیی ( افقی ) وبیستودوو هێلی سێ ستوونیی ( عمودی ) بەشکرابوو ، بۆبێبەختی مێژوو هەنێ لەنووسینی سەرمەڕەکە بەتەواوی لووس‌بووبوو نەدەخوێندرایەوە ، لەم تاتەبەردە هەڵکەنراوەدا پەیکەرەی « شاه ئانوبانی » وەها نیشان دراوە کەپای چەپی خۆیی ناوەتە سەرلەشی دیلێکی ڕاکشاوا ، ولە دەستی خواژن نینی

دوو دیلی تری وەردەگرێ کەیەکەمیان زنجیر خراوەتە لووتی ، لای خواریشەوە شەش‌کەسی تری دیلو زندانی دیارە کەیەکێکیان پادشایە ، ئەمەش دەقی نووسراوی سەربەردەکەیە : « ئانوبانی شای بەدەسەلات لولوبی لە ـ ئیم نیگاری ئەوو خواجە نی‌نی لەکێوی پاتیر ( پدیر )

دایە ، ئەوکەسەی ئەم‌نیگارانەو ئەم تاتەبەردە لەجێیی خۆی هەلکەنی ، کەئانوم وئەنکیت وئانات

وبلکت وئاداد

ونی‌نی وسین وساماس

و . کەنین .. وکەلەوەوە .. مەرگی .. وکە .. نەفرین .. وئافەروزی ئەوان ڕائەگەیینن کە کوڕانی ئەو نەفرین وئافەروز نەکەی کە .. »

★

بائەوەش بلێم کەلەدەوروبەری سەرپول ( سەرپرد ) وێرانەو وکەلاوەی دێرینەو تاتەبەردی نووسراو یەگجار زۆرە من لەکتێبی دێرینەناسیدا بەتێروتەسەلی لێی ئەدوێم» (جوغرافیایی غرب ایران ( ۱۰۹/۲ ـ ۱۱۱ )

وەکو ئەبینین بەشێ لەوشەکان بەخاڵ ••• پڕکراوتەوە ونەخوێندراوەتەوە ، گەلاڵەی مەبەستەکە بەم جورەیە :

« ئەوکەسەی ئەمنیگارانەو ئەم تاتەبەردە نووسراوە لەناوبباتەو لەجێی خۆی هەڵی بکەنێ بەرنەفرینو ئافەرۆزی ئەم خوایانە بکەوێ •••

«دیاکونوف» پتر ڕوناکی خستۆتە سەرباسەکە ونووسیویە: لەتاتە بەردە هەڵکۆڵراوەکەی « ئانوبانی » دا پادشاه بەجلی ئەکەدیەوە نیشاندراوە ، کلاوێکی لبادینی بەشوقی لەسەرەو، داوێنێکی ڕیشە داریهەیە کەمەربەندێکی وردەکارانەو کەوشێکی حەندەڵ ؛ دیلەکان تەنیا کلاویان لەسەرە ، لەو پەیکەری میرمزندانیەکان ، هەشتیان کلاوی سومەریو ئەکەدیان لەسەرە نوێەم کەلەڕیزی هەرە دوایدا لایێشەوەیە کلاوێك ـ یاتاجێك ـ ی لەسەردایە کەلە هەزارەی بەرلە هاتنە دنیای مەسیح ( میلاد ) دا ( واتا سێ هەزارساڵ لەمەوبەر ) تایبەتی مادەکانی بەشی خۆرهەلاتیی بووە ، پاشان فارسەکان لەوانیان وەرگرتوە هەرچۆنێ بێت لە هەرێمی حەلەوانەدا شوێنەوارو دیرینەی کۆلی سەردەمی لولوبی ـ گوتی ـ کاشی ـ ماد ـ هەخامەنشی ـ پەرتی ئەشکانی ـ وساسانی زورە •• ( تاریخ ماد ۱۳۸ )

ئێمە کەباسی دێرینەی دەوروبەری حەلەوان وجێیانی تری کوردستان ئەکەین، هونەری دۆزینەوەو، وخوێندنەوەی هەموپان ئەگەرێتەوەبۆ دێرینەناسانی ئەوروپایی کەولاتەکەیان پشکنیوەو، لەکەلاوەکانیان کۆلیوەتەوە .. بەلام مێژونووسێکی کوردی ئەسعەد ئابادیش سالی ٥٢٠ك = ١١٢٦ ها . د . لەم بەردەنووسراوانە دواوە بێ ئەوەی بزانێ چیە . ئەمەدەقی قسەکەیەتی : « بەلاش کوری فەیروزی ساسانی کە ( ٤٨٤ – ٤٨٨ ) ها . د . پادشاه بووە دووشاری دوروست کردووە : یەکەم « بەلاش ئاباد » نزیکی مەیدانی « مەدائن » ، دووەم « بەلاش فەیروز » نزیکی حەلەوان کەئێستە وێرانەیە ، لەسەر سنوورەکە پەیکەرەیێ بەسەرتاتە بەردێکی مەرمەرەوە نەخش کراوە بەدموریا « پیت » هەیە کەنەزانراوە بخوێندرێتەوە، تاتە بەردەکە بەسەر گردۆلکەییکەوەیە لەو مەرمەرە شینە لە هەرێمەکەدا نیە ، ئێستە لە دەروبەری پەیکەرەکە گوندێ هەیە بەناوی پەیکەرەکەوە ناو نراوە «دوونولاش» لە دەرەوەی ئەم سنورەدا «ولاش گورد» جێی ڕاو بووە ، شوێنەواری دیواری جێ ڕاوەکە لە بەردەو بە داوێنی کێوێکی بەرزەوەیە پێی ئەوتری « خۆر هند » ، هێشتا هەر ماوە ..) ( مجمل التواريخ ٧٠ ) . دەقەکەی نووسەر هەلەێ هەلەی تێ کەوتووە ، : بەلاش »کوری فەیروز نیە، هەلە یە « بەلاش کوری یەزدگورده »برای فەیروزە ، پاش کوژرانی ئەو ، سالی ٤٨٤ها.د. بوە بە پادشا . هەروا «بەلاش گورد» لەکەوتیە نێوانی هەمەدان ـ کرماشانو نزیک بە کەنگەوەرە .

## « زاناو ئەدیبانی حەلەوانو دەوروبەری :

### ١ ـ ابو بکری حەلەوانی :

محمد کوڕی ابراهیم کوڕی عبدالحمیدی قاضی بەلخ ، لەبەغدا جێ نشین بووە ودەرسی فەرمایشتی پێغەمبەری (د•خ) وتۆتەوە ، پیاوێکی ڕاستاڵ بووە ساڵی ٢٢٨ك مردووە • (المنتظم ١٠٣/٥

### ٢ ـ ابو القاسم کوڕی ثلاجی حەلەوانی :

عبدالله کوڕی محمد کوڕی عبدالله کوڕی ابراهیم • یەکێ بووە لەزانایانی فەرمایشت ساڵی ٣٨٧ك مردوە ( المنتظم ٦/ ٣٣٠ )

### ٣ ـ ابو عبدالله حلوانی :

سلمان کوڕی ابو طالب عبدالله کوڕی محمد الفتی ـ بابی حسن ـ زانای ئاینی ( فقیە ) بووە لەقوتابخانەی نظامیەی بەغدا دەرسی ئەوتەوە ، پیاوێکی شارەزای فەرهەنگو ئەدەب ، بوو هەستیارو شاعریش بوو ساڵی ٤٩٤ك لە ئەصفەهان مردووە • ( المنتظم / ١١٥ ) •

**٤ ـ ابو الفتح حلوانی :**

محمد کوڕی علي ـ کوڕی محمد ، دەرسی فەرمایشتی لە « ابو الحسن المهتدی » بیستووە ، شەرعیشی لای شریف ابـو حنیفە خوێندووە ، سالی ٥٠٥ك ڕۆژی جەژنی قوربان مردووەو لە « باب الحرب »ی بەغدا نێژراوە ٠ ( المنتظم ٣٠٦/٨ )

**٥ ـ ابو محمد الحلوانی :**

محمد کوڕی عبدالرحمان کوڕی محمد ، کتێبە ئاینییەکانی هەموخوێندو ، بوو بەمەلاچاك ، بـەکاروکاسبی ژیا ، دوکانی سرکـەفرۆشی هـەبوو ، دەستی بـۆ داوای یارمـەتی بۆکـەس درێژ نەدەکـرد ، ڕۆژی دووشەنبـە مانگـی ربیع الاول سـالی ٥٤٦ك کۆچی دوایی کرد ، شیخ عبدالقادری گـەیلانی نوێژی لەسەرکرد وهەر لەماڵەکەی خۆیا نێژرا ( المنتظم ١٤٦/١٠ )

**٦ ـ ابو عبدالله حلوانی :**

حسن کوڕی محمد کوڕی حسن ( سەرگوزەشتی نەزانرا ) ( المنتظم ١١١/٧ )

**٧ ـ ابو سهل احمد کوڕی محمد کوڕی عاصم حەلەوانی :**

سەرگوزەشتی تەواوی نەزانراوە ، یەکێ بووە لەنزیکانی « حسین کوڕی عبدالله کوڕی عبدالرحمان کوڕی علاء السکری، نووسراوەکانی ئەوی بۆ خەڵك ئەخوێنـدەوەو بەدەرس ئەوتـەوە

چونکه لای‌خوی خوێندبووی گەرچی لەڕێزی زانایان دائـەنرا ، بەڵام چیرتکی (خط) زۆرنا خۆشی هەبوو ، کتێبێکـی نووسیـو ەناوی «المجانین الادباء» (فهرس ابن ندیم ١٣٥ تەرجمە فارسی) .

## ٨ - شیخ ابو سعد کوڕی یحیی کوڕی علي کوڕی حســن حلوانی :

سالی ٤٥٠ك لەدایك بووە لای شیـخ ابو اسحاق شیـرازی خویندوویە ، کتێبـەکانی ئایینی تەنانـەت « اصـول وخلاف » ، هەروالای ابو جعفـر کوری مسلـم « فەرمـایشی پێغەمبـەری خویندوو ، و لەشاری بەغدا ماوەیێ سەرپەرشتکاری کاروباری ئایینی شارەوانی بووە کەپێی ئەوترا « محتسب » سالی ٤٩٥ك خەلیفەی عباسی ئەوو سمادە کوری عبدالله ڕومیو چەند کەسی تری بەناوی ئەسپردە (وفد) نارد بۆلای سلطان محمد مەلەکشای سەلجوقی وسالی ٥٢٠ خەلیفەی عباسی المسترشد بالله ناردی بۆما وراء النهر کە خەلاتی خەلیفە بدات بە خاقان « محمد کوری سلیمان » فەمانڕەوای ئەوناوە ، هەرلەم سالـەدا کۆچی دوایی کرد . ئەم پارچە هەلبەستە هی ئەوە :

« مررت بخباز احاول حاجـــــــــة
مدلا علیه ، ای بانی عالم »

« فلما رآني قـال : اهـلا ومرحبـا
ظفرت بما تهوی ، فأین الدراهم ؟ »

« فقلت : معي كسر و نقص و خاطري
يميش فصـولا كلهن لوازم »
« فقال : ومـن هذى الذخائر عنـده
يحاول عندى حاجـة ويساوم ؟؟ »
« لعمـرى لوبعت الجميـع بلقمـة
لما كنت ممن في الشـراء يخاصـم »

واتا : ڕابوردم بەلای نانەواێکا بەهەولێکی پێداویستو تازیشم ئەکرد بەسەریا کەمن زاناو دانشمەندم .. کەدیمی وتی ئەی بەخێر هاتی ئەواگەیشتی بەومرازەی شـەیدای هـەی ! بەڵام کواپارە ؟ وتم هاوڕێمە کەمی وکاستی ودڵیشم لەوەرزی هەزارلوغانەدا ئەژی، کە هەموی هەرپێ داویستە !!وتی : کەسێ ئەمەندە کاڵاو کوتاڵی پاشەکەوتی هەبێ ئایا لای من تەقەلای دەسکەوتی پیداویست دەکات ؟ وماملەش ئەکات ، بەگیانی خۆم گەرهەمو ئەم سەرمایەیەت بفرۆشی بەتیکەیێ نان من لەوانەنیم لە سەرکڕینی کێشەبکەم .. ( خريدة القصر ٥٦٣ ) .

**٩ ـ ابو بكـر احمد كـوڕی عـلي كـوڕی بدران كـوڕی حەلەوانی :**

ئەمپیاوە بەناوبانگی « خالوزاهدی بەغدایی » ئەناسرا . فەرمایشتی لە « ابو حبيبی طبری » یەوەئەگێرایـەوە ، کتێبـی « لطائف المعارف » لەنووسراوەکانی ئەوە نیوەی جمادی الاولی سالی ١٧ه‍ك عەمری خوای بەجێ هێناوە .

**١٠ـ ابو المعالي عبدالرحمان کوری محمدی حەڵەوانی :**

یەکێ بووە لەزانایانی ئایینی سەربەرچی شافعی ، ولـــە فەرمایشتەوانیدا پلەی «حافظ» بووەـواتا صەتهەزار فەرمایشتی لەبەربووە ـ وکتیبە شەرعیەکانیشی ( فقە اسلامی ) لەشاری نیشاپور خوێندووەو فـەرمایشتـیشی‌لەشاری « مەرو » وەرگرتووەو گوێ لێبووە هەر لەبەر ئەوە بە مەروەزی ناسراوە کەسانی وەکو « ابو سعد سمعانی » وزۆری‌تری لەلای فەقێ بوون . سالی ٥٣٩ك بەمەرگی خوایی مردووە ..

**١١ـ ابو رجاء حەڵەوانی :**

باوکی لەلای مەلاکانی شارەزور خوێنـدبووی خۆیشـی لەلای باوکی فـەرمایشی پیغـەمبەری بـەبیستن لـەبەرکردبوو وبووبوو بەیەکێ لەفرمایشتەوانەکان ..

**ســـەرنج :**

لات سەیرنـەبێ کـە شاری حـەڵەوان زاناو خوێندەواری لەشارولکەی دینەومر کەمتر پێ گەیانـدیێت هۆی ئـەوە وەکـو بۆم دەرئەکەوێ دووشتبووە : یەکەم : نزیکی حەڵەوان بـۆ بەغدا وشارەزور ، کە خوێندەوارونەدیەکان هەمیشە لەبەر تاوی شـالآوی دوژمـن لەخـواروژوورەوە ، هـەمیشـــە مزگـەوتو قوتابخانەکان دووچاری رۆخانو ویرانی بوونیان ، قـەڵفریان کردووە،بەملاو ئـەولادا ، بیری‌ئەوەشیـان نـەبووە نازنـاوی حەڵەوانی بەخۆیانەمە ببەستن .. دووەم:کاکەیەکان بە هـۆی

حەلەوانی بەخۆیانەوە بیەستن .. دووەم : کاکەیەکان بەهۆی ئەوەوە کەئەم ناوەیان هەمیشە بەبنکە وناوچەی خۆیان دانـاوەو ئەدەبیاتی خۆیان لەخەلکی تری شاردۆتەوە کەمتر شوێنەواری زانیاری وئەدەبی ئەوان بەرچاو کەوتووە ، .. بەلاّم کەناوی حەلەوان وەرگەڕاوە بە « زەهاو » ئـەبینین زانای وەکو مفتی زەهاوی لەوێوە سەری هەلداوە کەشێخ محمدی خاڵ کتێبێکی تایبەتی دەربارەی داناوە ..

من لێرەدا باسی « بنەماڵەی زەهاوی » ناکەم چونکە کەوتونە بەغدا وخوالی خوشبوو « ئەمین زەکی بـەگ » لـە « تاریـخ السلیمانیه وانحائها ، وله مشاهیر کوردو کردستانـا » هـەروا «ماموستا مەلاکەریمی مدرس» لە «بنەماڵەی زانیاری» وعلماؤنا»دا « وماستا بابا مەردوخی ڕوحانی » لە « مشاهیر کورد » ناویـان بردوون،وجگەلە « مفتیزەهاوی » نەمر ، کەسیان شوێنـەواری کوردییـە جێ نـەهێشتووە ، تـەنیا بۆباسی زانایی وبلیمـەتی « مفتی » تاقە شیعرەکەی شیخ رەضای طالەبانی بەسە کەوتویە:

«ئەی مادەری گیەتی هەتا ئێستە نەزاوی
تۆ ذاتێکی وەکو فەیضی ئەفەندی زەهاوی »
« ممکن نیە ادراکی حەقایق بەتەواوی
ممکن نیە ادراکی نەکا ذهنی زەهاوی »

هەروەکو خوالی خوشبوو « ئەمین زەکی بەگ » لـــە پێشەکی تەئریخی سلیمانیو ولاّتیدا نووسیبوی : « نەمویست

یاسی مێژوی دمورانی ئـەخیری سلیمانـی بنووسـم چونکـــە
زۆرکەس هەن ناتوانن تحملی حقایقی تأریخي بکەن ‎••‏ » منیش
ئەلێم لە شەڕی گەورەی یەکەمی جیهانی بەدواوە ، نـەك هـەر
هەرێمی « حەلەوان » پاشێلی سـمی سـپای روس و ئینگلیزو
ئێران ونۆکەران بووە ، بەڵکو هەموکوردستانیش کە هەرگیزاو
هـەرگیـز دەســەڵاتانی ولاتانی سـەرکـوردسـتان ڕێ نـادەن
بەنووسرانی ڕاستی ‎••‏ لەبەرئەوە لێرەدا بەخواتان ئەسپێرم ‎••‏
تا هەلێکی تر ‎••••‏

## ســـەرچاوە لێ وەرگیراوەکان :


١ ـ ئافەرینش ( بدء الخلقە ) مطهر مقدسی تەرجەمەی محمد رضا بەفارسی ٠

٢ ـ ئاورێکی پاشەوە حسین حوزنی مکریانی کوردی ٠

٣ ـ احسن التواریخ روملو فارسی ٠

٤ ـ الاخبار الطوال ، دینەوەری تەرجەمەی صادق نشات بەفارسی٠

٥ ـ الاغاني ابو الفرج اصفهاني عربي ٠

٦ ـ اقدم المخطوطات گورگیس عواد عربي ٠

٧ ـ انساب الاشراف بلاذری تەرجەمـــەی ابو القاســم پایـــەندە بەفارسی ٠

٨ ـ ایران ازاغازتا اسلام ر ٠ گیرشمن تەرجەمەی دوکتور معین بەفارسی ٠

٩ ـ ایران باستان ، مشیر الدولە پیرنیا فارسی ٠

١٠ـ ایران پاستان دیاکونوف تەرجەمەی روحی ارباب بەفارسی ٠

١١ـ البلدان یعقوبي عربي ٠

١٢ـ بلدان الخلافە لسترنك تـەرجەمەی عربي گورگیس عـواد ، وتەرجەمەی فارسی محمود عرفان ٠

١٣ـ بندنیجین ( مندلی ) ڕوژبیانی عربي ٠

١٤ـ تاریخ ادبي ایران ادوارد براون ، تەرجەمەی حکمت بەفارسی٠

١٥ـ تاریخ الامم والملوك طبری عربي وتەرجەمەی پایەندە بەفارسی٠

١٦ـ تاریخ بغداد خطیب عربي ٠

١٧ـ تاریخ الدول والامارات الکردیە امین زکي کوردی ، تەرجەمەی عوني بەعەرەبي ٠

١٨ـ تاریخ غازانی فضل اللە فارسی ٠

١٩ــ تاريخ گوزيده قەزوينی فارسی ٠
٢٠ــ تاريخ ماد دياكونوف تەرجەمەی كشاوەرز بەفارسی ٠
٢١ــ تاريخ يمينى ( عتبى ) تەرجەمەی عبدالجبار بەفارسی ٠
٢٢ــ تجارب الامم ، ابن مسكويه ــ عربي ٠
٢٣ــ تجارب السلف هندوشاه فارسی ٠
٢٤ــ تحفه الامراء في تاريخ الوزراء عربي ٠
٢٥ــ التنبيه والاشراف مسعودی تەرجەمەی پايەندە بەفارسی ٠
٢٦ــ جامع التواريخ فضل الله فارسی ٠
٢٧ــ جغرافيای غرب ايران دومورگان تەرجەمەی وديعی بەفارسی ٠
٢٨ــ جهان ئارای غفاری فارسی ٠
٢٩ــ جهان گوشای جوينی فارسی ٠
٣٠ــ حليه الاولياء ابو نعيم عربي ٠
٣١ــ الحوادث الجامعه ابن الفوطي عربي ٠
٣٢ــ خريده القصر اصفهاني عربي ٠
٣٣ــ خلاصه تاريخ الكرد وكردستان امين زكي كوردی تەرجەمەی عوني به عەرەبي ٠
٣٤ــ دائره المعارف الاسلاميه كتاب عالميون ــ عربي ٠
٣٥ــ دائره المعارف ــ بستاني عربي ٠
٣٦ــ دائره المعارف فارسی غلام حسين وعلماء ٠
٣٧ــ دستور الوزراء خواندمير فارسی ٠
٣٨ــ دقوقاء ( داقوق ) روژبيانی عربي ٠
٣٩ــ دياربكريه ابو بكر طهرانی فارسی ٠
٤٠ــ دينی كۆنیكورد وهبي تەرجەمـەی روژبيانی بەفارسـی ــ عەرەبی ٠
٤١ــ ذيل التجارب روذراوری عربي ٠
٤٢ــ ذيل جامع التواريخ حافظ ابرو فارسی ٠
٤٣ــ ذيل جهان گوشای جوينی نصيرالدين طوسی فارسی ٠
٤٤ــ ذيل الذيل عبدالملك همدانی ٠

٤٥ــ روضة الصفاء ميرخواند فارسي .
٤٦ــ سرزمينهاى خلافت ليسترنــك محمود عرفــان تەرجەمــە بەفارسي ٠
٤٧ــ شرفنامە بتليسي تەرجەمەی عەرەبی ڕۆژبیانی ٠
٤٨ــ صوره الارض ابن حوقل ، تەرجەمەی جعفر شعار بەفارسي ٠
٤٩ــ طبقات كبرى شيخ شعراني عربي ٠
٥٠ــ ظفرنامە علي يزدى فارسي ٠
٥١ــ العقد الفريد ابن عبد ربە عربي ٠
٥٢ــ فتوح البلدان بلاذرى تەرجەمەی ئاذەرتاش بــەفارســی و بنەڕەتە عەرەبی‌یەکەی
٥٣ــ فتوح الشام واقدى ــ عربي ٠
٥٤ــ فرهنك دیهخودا فارسي ٠
٥٥ــ فرهنك عميد فارسي ٠
٥٦ــ فرهنك معين فارسي ٠
٥٧ــ فهرست ابن النديم ، تەرجەمەی رضا تجدد بەفارسي ٠
٥٨ــ القاموس فيروزئابادى عربي ٠
٥٩قاموس الاعلام سامي توركي ٠
٦٠ــ الكامل في التاريخ ابن الاثير عربي ٠
٦١ــ كرمانشاهان باستان ليژنە فارسي ٠
٦٢ــ كورد وپیوستكى رشيد ياسمى فارسي .
٦٣ــ گۆران مینورسکی تەرجەمەی ناجی عەباس بەکوردی .
٦٤ــ مجمع الالقاب ابن الفوطي عربي .
٦٥ــ مجمل التواريخ مجهول المؤلف فارسي ٠
٦٦ــ مختصر بلدان ابن فقيه تەرجەمەی ح٠ مسعود بەفارسي ٠
٦٧ــ مذكرات مأمون بك ٠ تركي تەرجەمەی ڕۆژبیانی و شــكور مصطفى بەعەرەبی ٠
٦٨ــ مرآت العبر ديار بكرى عربي ٠
٦٩ــ مروج الذهب مسعودى ، عربي .
٧٠ــ مشاهير الكرد وكردستان امين زكي بك كوردى تەرجەمەی سانحەبە عەرەبی ٠

٧١ـ مشاهير كورد بابا مردوخ روحاني ، فارسی .
٧٢ـ مطلع السعدين سمرقندی فارسی .
٧٣ـ معجم البلدان ياقوت حموی ـ عربي .
٧٤ـ معجم ما استعجم ، بكری ، عربي .
٧٥ـ منتخب التواريخ ، معيني نطنزي ، فارسی
٧٦ـ منتظم ابن جوزی عربي .
٧٧ـ نامەی دانشوران ناصری فارسی .
٧٨ـ نزهە القلوب مستوفی فارسی .
٧٩ـ وفيات الاعيان ابن خلكان ، عربي .
٨٠ـ هيرودوت ، تەرجەمەی دوكتور هدايەتی بەفارسی .

جگەلەمانە ، سوود وەرگيراوە لەزور گوڤارو فهارس وكتيبی تری كە زۆركەم سەرچاوەكانيان تيا باس كرابێ ، يازور كورتوگەلالە لەسەرگوزشتی ژيانی زانای مەبەست دوابێ يا لەليست دا ناويانم لەبيرچووبێ وەكو : كشف الظنون حاج خەليفە، اعلامی خيرالدين زركلي علماۆناو بنەمالەیزانياری مامۆستا مەلاكەريمی بيارە .. تاد ..

سەرنج : سالەكانی كۆچیو هاتنە دنيای مەسيح بەپێی التقويمان الهجري والميلادي « فريمان كرنفيل » ـ كە لە لاپەن « حسام ئالوسی »يەوە كراوە بە عەرەبی ، رێكخراوە، سپاس بۆ « سەميرە خانم »ی خەبيرە كە ليستێكی بۆ هەلە تايبی يەكان كردبو كە بەرامبەر بە سالە عەرەبی وفەرەنگی يەكان رۆی دابو .

مدينتان مدمرتان : دينور و حلوان

دولتان منهارتان : الحسنويه و العيارية

يتحدث هذا الكتاب عن تاريخ مدينتين غارقتين في القدم كانتا موجودتين قبل الوف السنين شاهدتا حضارات شعوب زاكروس والحكومات التي قام فيها من گوتو ـ لولو ـ ميديا الهخامنشية ـ البرثية الاشكانية ـ الساسانية ـ العهود الاسلامية ، وذاق اهلوها تعاسة الحياة من ويلات الحروب بين دولها مع السومريين والاكديين والكلدانيين والاشوريين وغيرها وقدلبثتا حاضرتي الحكومات والامارات الكردية ومحط رحال العلماء والادباء والصوفية حتى دمرهما تيمور گورگان الاعرج في اواخر القرن الثامن الهجري .

اما الدولتان المنهارتان فهما[1] الحسنويهية التي تشكلت عام ٣٦٩ هـ بانتقال السلطة اليها من الامارة العيشانية وقد حكمت محافظات كرمنشاه لرستان ـ الاهواز ـ ديالى ـ السليمانية كركوك ( شهرزور ) في ظلال الخلافة العباسية حكما ذاتيا شبه مستقل تتعاون مع الخلافة اذا استدعت الخلافة منها المساعدة والمعونة و[2] الدولة العيارية التي كانت جزءا من الدولة الحسنويهية ثم انقلبت عليها بعد وفاة الامير بدر عام ٤٠٥هـ في اوائل القرن الخامس الهجري فاستطاعت الانفصال واستقلت بمناطق : من كرمنشاه ـ ديالى ـ كركوك فحكمتها حكما ذاتيا شبه مستقل حتى قضى عليها هولاكو التترى الذي اباد الخلافة العباسية .